# خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا

دەقی چاوپێکەوتن و دەمەتەقێیەک

لەگەڵ (جەرجیس فەتحوڵڵا)ی پارێزەردا

حوسێن محەمەد عەزیز

2702ك / 2002ز

# خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا

دەقی چاوپێکەوتن و دەمەتەقێیەک
لەگەڵ « جەرجیس فەتحوڵڵا »ی پارێزەردا

حوسێن محەمەد عەزیز

2702ک/2002ز

**پێشکەشبێ، بە هەموو ئەوانەی، لە ژیاندا هەڵوێستیان هەیە و هەلپەرست نین!**

# پێشەکیی
# چاپـــــی دووەم

کـاتێ، چاپی یەکـەمی ئـەم چاوپێکەوتنـە، لە لایەن دەزگـــەی چاپ و پەخـشی « APEC »، لە « سوید » چاپ و بڵاوکرایەوە، ئەوەی زۆر سـەرنجی ڕاکێشام، چەن خاڵێکی گرنگبوو:

1. لە « کـوردسـتـان »، بە هـەزاران دانەی لێ کـۆپیکرا و بڵاوکـرایـەوە، بێ ئەوەی، پرس بە خۆم بکەن، .

2. ئەم چاوپێکەوتنـە، لە گـەلێ شـوێن و لـە لایەن گـەلێ « کـەس، ڕێکخـراوی دێمۆکراسیی و پارتی کوردستانیی »یەوە، بایەخیپێدرا و لە سـەری نووسرا. هێندێ بە چاک و هێندێکی دیکەش، بە خراپ هەڵیانسەنگاند.

3. « یەکـێتی نیـشـتـمانیی کـوردسـتـان »، بەرهـەمـەکـەیان زۆر پێ باشـبـوو. چونکە، لـە بەرژەوەندیی تایبـەتیی خـۆیاندا بـوو، لە هێندێ شـتـدا، کەڵکێکی زۆریان لێ وەرگـرت. تەنانەت، ڕۆژنامـەی « کـوردسـتـانی نـوێ »ش، لە سـەری نووسی و بە باشە هەڵیسەنگاند.

4. « پارتی دێمۆکـراتی کـوردسـتـان »، بەرهـەمـەکـەیان زۆر پێ خـراپبوو، زۆر پێی قـاڵسبوون. چونکە، لە بەرژەوەندیی تـایبەتیی خۆیاندا نەبوو، لە زۆربەی شـتـەکـانـدا، زیانێکی زۆریان لێ بینـی. ئەمـەشـیـان نەشـاردەوە، بەڵکوو، چەن جارێ، لە « هـەندەران » و لە « کـوردستـان »یش، زۆر بـە ڕاشکاویی، بە دەمیی

باسیانکردووە، لە سەریان نووسیوە و گوشاریشیان، بۆ سـەر مامۆستا « جەرجیس فەتحوڵڵا » بردووە! چونکە چاوپێکەوتنەکە، لە سەر « بنەماڵەی بارزانیی، پۆخڵەواتی شۆڕشی11/سێپتێمبەر و سەرانی پارتیی »، زۆر شتی نوێی تێدابوو، کە تا ئەو کاتە، بەو شێوە زەقە، باس نەکرابوو.
تەنانەت، کارمەندانی ڕادیۆی هەفتانەی « سەردەم »ی سەر بە « پارتیی »یش، لە شاری « ستۆکهۆڵم »، گوتارەکەی مامۆستا، لە سەر منی نووسیبوو، وەریانگێڕا و بە کوردیی بڵاویانکردەوە، وایان زانی، بەو کارەیان، لە بایەخی چاوپێکەوتنەکە و ڕاستگۆیی من کەمدەکەنەوە. ئەوەبوو، هەر لە هەمان کات و لە ڕادیۆکەی خۆشیاندا، وەڵامێکی پڕ بە پێستی خۆیانم دایەوە.
گەر چی هێندەی من ئاگام لێ بێ و بزانم، لە کوردستان، تەنیا « موحسین دزەیی » و « حەبیب محەمەد کەریم »، لە ڕۆژنامەی « خەبات » و لە وەڵامی پەرتووکی « زیارە لیلمازی ئەلقەریب »دا، ئاماژەیان بۆ ئەو چاوپێکەوتنە کرد بوو.
هەروەها، « سکرتێری پارتیی ـ جەوهەر نامیق »، لە شاری « ستۆکهۆڵم » و لە ڕۆژی « 1998/10/22 »دا، ئەو ڕاستییەی نەشاردەوە و زۆر بە ڕاشکاویی پێی گوتم: زیانێکی زۆری هەبوو!
5. مامۆستا « جەرجیس فەتحوڵڵا »،ووڵاتی « سوید »ی جێهێشت، بەرەو لانە کۆنەکەی خۆی گەڕایەوە و لە « کوردستان » گیرسایەوە.
6. جگە لەوەی، ئەوانەی بە باشیی مامۆستا « جەرجیس »، دەناسن و دەڵێن: وەک خووڕەوشتی تایبەتیی و ئاسایی خۆی، لە هێندێ شوێن، بە تایبەتیی لە « کوردستان »، لە هێندێ لە قسەکانی خۆی پەشیمانبۆتەوە، لە هێندێ شوێنی دیکەش، قسەی بە من گوتووە و تاوانباریکردووم.
ئەمە ئەو خاڵانە بوون، کە بە شێوەیەکی گشتیی، باری سەرنجیان ڕاکێشام. منیش، لەم ڕوونکردنەوەیەدا هەوڵدەدەم، هێندێ لەو خاڵانە ڕوونکەمەوە و وەڵامیانبدەمەوە.
دوای ئەوەی، چاوپێکەوتنەکە بڵاوبۆوە، لە نێو ڕیزی خوێنەران و جەماوەری نەتەوەکەمدا، زۆر بە شێوەیەکی سەیر، دەنگیدایەوە. چ بە تێلێفۆن و چ بە نامە، چەندین دۆست و برادەر، سەرەڕای ئەوەی، دەستخۆشانەیان لێ کردم، پەیتاپەیتاش، داوایاندەکرد، بۆیان بنێرم. منیش، بە دەیان دانەم، بۆ هەموو ووڵاتانی جیهان نارد.

لەبەرئەوەی، لە لایەکەوە، مامۆستا « جەرجیس »، بە یەکێ لە دۆستە هەرە دێرین و نزیکەکانی بنەماڵەی « بارزانیی » دادەنرێ. لە لایەکی دیکەشەوە، لە چاوپێکەوتنەکەدا، گەلێ شتی نوێی باسکردووە. بۆیە، دەنگێکی زۆری دایەوە، وەک ئەندامانی « پارتیی »ش خۆیان دەڵێن: زیانێکی زۆری لێداون، لەبەرئەوە، سەرانی « پارتیی »، بە تەواویی ڕاچڵەکین، گوێ قولاخبوون، چاویان کرایەوە، لە مەترسیی ئەو نووسینە وشیاربوونەوە. بۆیە، هەر لە یەکەمین هەنگاوەوە، هانایان بۆ مامۆستا « جەرجیس » برد، تا، هەم پەشیمانیکەنەوە، هەم بێ دەنگیکەن و هیچی دیکە نەدرکێنێ. لەبەرئەوە، مامۆستا « جەرجیس »، بێ دڵی نەکردن و زۆر زوو، بە دەم داواکارییەکەیانەوە چوو!

ئەوەبوو، نووسینەکە بڵاوکرایەوە، چەن دانەیەکم بە دیاریی بۆ مامۆستا نارد. ماوەیە هیچ دەنگی نەبوو. پێش ئەوەی، هیچ شتێ ڕوویدا، شەوێکیان، لە پڕ تێلێفۆنێکی بۆ کردم و گوتی: ئەورۆ، « مەسعوود » تێلێفۆنی بۆ کردم. داوەتی کردم و دەیەوێ، سەردانێکی کوردستان بکەم. منیش لێم پرسی: باسی چاوپێکەوتنەکەی نەکرد؟ گوتی: نەخێر. بە هیچ شێوەیە، باسی نەکرد. پاشان، لێی پرسیم: تۆ دەڵێی چی؟ منیش گوتم: خۆت چۆن بە باشی دەزانی، وا بکە.

ئیدی، من یەکسەر تێگەیشتم، « مەسعوود بارزانیی »، بۆچی تێلێفۆنی بۆ مامۆستا کردووە. بە باوەڕی من، ویستوویەتی، هەر چی چۆنێ بێ، زوو فریاکەوێ، لەو جێیەدا بیوەستێنێ و دەمکووتیکا. چونکە، زۆر باش زانیویتی، هێشتا نهێنیی و دەکومێنتی گرنگی زۆری لا ماوە، گەر فریای نەکەوێ و بایەخی پێ نەدا، ئەوا مامۆستا، هەمووی بڵاودەکاتەوە و نەیارەکانیشی، کەڵکێکی زۆر، لە خۆی و زانیارییەکانی وەردەگرن. لەبەر ئەوەی، خۆی باشی دەناسێ، کوێی دێشێ و بۆ چی هەوڵدەدا! هەروەها، زۆر چاکیش دەزانێ، چۆن بێ دەنگیدەکا!

هەر بۆ نموونە: مامۆستا لە کاتی دەمەتەقێ و چاوپێکەوتنەکەدا، باسی دوکتۆر « مەحموود عوسمان »ی کردووە، زۆر بە ئاشکرا دانیپێداناوە و گوتوویەتی: (من بەو شێوەیە، پێوەندییم لەگەڵ « مەحموود »دا مایەوە، تا « تاران »ی بەجێهێشت. تەنانەت، هێندێ شتی نهێنیی و بەڵگەنامەی دامێ، کە پێوەندیی، بە گفتوگۆی یەکەمی « دارا »وە هەبوو، بە دەستوخەتی « دارا »

خۆی نووسراوە، بەو زووانە، چاپیدەکەم. هەروەها، لیستی پارەکانی دامێ، کە بە ناوی شۆڕشەوە وەرگیرابوون و بە ناوی کوڕەکانی « مەلا مستەفا »وە تۆمار کرابوون. ئەوانەم هەموو هەیە.)
کاتێ منیش، لێم پرسی: پارەکە چەن بوو؟
مامۆستا، لە وەڵامدا گوتی: (تکایە، من نامەوێ، لێرەدا لەو باسە بدوێم. لەبەرئەوەی، بە لامەوە گرنگ نییە. با وازی لێ بێنین. دوکتۆر « مەحموود »، خۆی دەزانێ، چەن بوو. لەوانەیە، من ڕۆژێ لە ڕۆژان بیڵێم. بەڵام ئێستە، لەم چاوپێکەوتنەدا نامەوێ، بیدرکێنم.)
جگە لەوەی، مامۆستا لە قسەکانیدا، دەربارەی جووتە برا « ئیدریس و مەسعوود بارزانیی » گوتوویەتی: ( لەو کارانەی، پێوەندیی بە « پارتیی »، یا پۆلیتیکی گشتیی، یا کاروباری تایبەتیی کەسایەتیی خۆیانەوە هەیە، لەو بارانەوە، کۆمەڵێ شتی زۆرم لایە و ڕاستیی ئەو قسانەم دەسەلمێنێ.)
هەروەها، وەک مامۆستا خۆی بۆی باسکردم، چەندین جار « مەسعوود بارزانیی »، داوەتی کوردستانی کردووە، بەڵام ئەو هەموو جارەکان، ڕەتی کردۆتەوە، چونکە دەیگوت: (لەو ئاژاوەیەی لەوێ دروستبووە، لەو دەستدرێژییەی لەوێ، بۆ سەر سەربەستییە دێمۆکراسییەکان و ئازادیی گەل دەکرێ، جێی منی تێدا نابێتەوە.)
پاشان، لە سەر قسەکانی خۆی بەردەوامبوو و گوتی: (ئەوەی لێرەدا سەیربێ، وا دەردەکەوێ، تا ئێستەش، ئاژاوە لە نێو « پارتیی »دا هەر بەردەوامە. لە لایەکەوە دەبینم، « مەسعوود » لە نامەکەی خۆیدا، باسی ڕۆڵی مێژوویی من، لە بزووتنەوەی کوردایەتییدا دەکا. لە لایەکی دیکەشەوە، ئۆرگانی ناوەندیی « پارتیی »، پتر لە نەوەد دێڕ، لە ڕۆژنامەی « خەبات » تەرخاندەکەن، بۆ ئەوەی، درۆبڵاوکەنەوە، جنێوم پێ بدەن و سوکایەتییم پێ بکەن، لەبەرئەوەی، توێژینەوەیەکی درێژم، لە سەر شێوازی داواکردنی « فیدراڵیزم » نووسیبوو، سەردەم و کاتی داواکردنەکەیم دیارییکردبوو، لە باری سەرنجی یاساییی‌وە ڕوونمکردبۆوە و لە ڕۆژنامەی « مەجلس ئەلعێراق ئەلحور »یشدا بڵاوکرایەوە. لەوە دەچێ، لەو کاتەدا ئەوان، دروشمی « فیدراڵیی »یان، تەنیا وەک پروپاگەندەیەکی ڕامیاریی ڕاگەیاندبێ! لەوانەیە، کاتێ من ئەو گوتارەم بڵاوکردبێتەوە، مەبەستەکانیانم ڕیسواکردبێ. لەبەرئەوە، لەو گوتارەدا جنێو بارانیانکردووم. ئەمەش، شتێکی زۆر سەیرە، چونکە، ڕۆژنامەی « پارتیی »،

نزیکەی یەک لە سەر سێی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەیان، بۆ من تەرخان کردووە، نەوەد دێڕ، وەک خۆیان دەڵێن: لە سەر کەسێکی هیچوپوچی وەک من بنووسن، ئەم کارە، هەروا بە ڕێکوپێکی بەڕێوەناڕوا. گەر من کەسێبم، بەو هەموو سوکوسەلیمییەوە، بۆچی، ئەو کاتە بە نرخەی خۆیان، بە فیڕۆدەدەن؟ باشتر نەبوو، لەبری ئەوەی، جنێو بە من بدەن، هێندێ شتی پەروەردەیی، یا ڕووناکبیریی، یا هەر بابەتێکی دیکە بێ، بنووسن؟! وا دەردەکەوێ، قسەکانم لەو ڕووەوە، بایەخێکی زۆری هەبێ!)

جا، لێرەدا لە مامۆستا دەپرسم: ئایا، ئێستە چی گۆڕاوە، وا، مامۆستا ملی ڕێی گەڕانەوەی گرتووە؟!! دەڵێم: جگە لەوەی هیچ نەگۆڕاوە، خراپتریشبووە! شتێکی ئاشکرایە، یەکێ لە گرفتە گەورە و سەرەکییەکانی ڕووناکبیر و نووسەرانی گەلانی « خۆرهەڵاتی نێوەڕاست » بە گشتیی و کورد بە تایبەتیی، خۆی لە « ڕاڕایی، دووڕوویی، بێ هەڵوێستیی و هەلپەرستیی »دا دەبینێ. وەک ئەوەی، چەندین جار، ئەم بەڕ و ئەو بەڕ دەکەن، لەم پەڕی چەپەوە، بۆ ئەو پەڕی ڕاست گێڕ دەگۆڕن، هەر ڕۆژەی، شتێ دەڵێن و پاشان، لە گوتەکانی خۆشیان پەشیماندەبنەوە. جا، گەر بڵێم؛ ڕووناکبیر و نووسەرانی کورد وان، خۆ مامۆستا « جەرجیس » کورد نییە! ئەدی بۆ وا؟!!

ئەوەبوو، هەرچی چۆنێ بوو، « مەسعوود بارزانیی »، دانی بۆ ڕۆکرد و دەمی چەورکرد. یەکەم جار، گەڕایەوە و لە چەن جێیەک، کۆڕی گرت و لە سەر چاوپێکەوتنەکە، بە پرسیاکردن و ڕەخنە لێ گرتن، بە گیریانهێنابوو. بەڵام، کاتێ گەڕایەوە، گوتارێکی لە گۆڤارێکی « ئاشووریی »دا بڵاوکردەوە، ستوون و نیوێکی گوتارەکەشی، بۆ باسی من و چاوپێکەوتنەکە تەرخانکردبوو. منیش، کاتێ خوێندمەوە، زۆر سەیرم لێهات و گوتم: ئەم نووسەرە ناودار و ئەم ڕووناکبیرە گەورەیە، بۆ وا دەکا؟!!

یەکسەر، تێلێفۆنم بۆ کرد، دوای خۆشهاتنەوە و هەواڵپرسین، لێم پرسی: مامۆستا، ئەوە چیت نووسیوە؟ بە « عەرەبیی »یەکەی خۆی گوتی: « یا ئەخی ضغوطاط مین کول ئەلجەوانب » واتە: برام، لە هەموو لایەکەوە، گوشاریان بۆ هێناوم. منیش گوتم: جا، تازە تۆ لە چی دەترسی؟ کەس زۆری لێ کردبووی، ئەو چاوپێکەوتنە، لەگەڵ من بکەی؟ تۆ لە « سوید » دەژی، پێویست بە یارمەتیی و دەستگیرۆیی کەس نییە، تەمەنت پتر لە حەفتا ساڵ دەبێ، بۆ وات کرد؟ دیاربوو، زۆر بە خۆیدا شکایەوە، بۆیە، کەمێ بێ دەنگبوو. منیش گوتم:

وەڵامتدەدەمەوە. گوتی: « ئەرجوک، لا تجاوبنی » واتە: تکات لێ دەکەم، وەڵامم مەدەرەوە. منیش گوتم: ناتوانم، بێ دەنگبم. چونکە، تۆ دەتەوێ، دڵی هەموو لایە ڕازییکەی، لە هەمان کاتیشدا، لە ڕاستۆکیی نووسینەکانی من بدەی. گوتی: « ئیزا ترید، صەداقەتنا تەستەمیر، لا تجاوبنی ». واتە: گەر دەتەوێ، دۆستایەتییمان بەردەوامبێ، وەڵامم مەدەرەوە. ئیدی، هەر ئەو خوداحافیزیی کردنە بوو، تا ئێستە، نە دیومەتەوە و نە قسەمان پێکەوە کردووە. «1»
سەیر ئەوەیە، ئەوانەی لە نزیکەوە، مامۆستا « جەرجیس »، زۆر بە باشیی دەناسن، کاتێ لێیان دەپرسم: مامۆستا بۆ وایە؟ لە وەڵامدا دەڵێن: ئاخر، ئەوەیە « جەرجیس فەتحوڵڵا ! » بۆ تۆ نایناسی؟!!
لە ڕاستییدا، نەمدەزانی وایە. بەڵام، ئێستە دەزانم، خەسڵەت و سرووشتی، وەک ئاو و هەوای، زەریای « سپی ناوەڕاست » وایە. هەمیشە، لە هەڵچوون و داچوون دایە!
کەواتە: زۆر جێی خۆیەتی، گەر لێرەدا، کەمێ بە درێژیی، باسی مامۆستا و چاوپێکەوتنەکە بکەم. لە ڕاستییدا، من ناتوانم، لە هیچ قسەیەکی خۆم پەشیمانبمەوە، چونکە، بە ڕاستیی مامۆستا، ڕاژەیەکی زۆر گەورەی، کوردی کردووە. بەڵام خۆزگە، هەڵسوکەوت و ڕەوشتی، لەگەڵ ئەو هەموو « زانیاریی، ژیریی، نووسین و ڕاژەکردن »ەیدا بگونجانایە و بە لانی کەمەوە، بەرانبەر بوونایە! چونکە، ئەوەی لە نزیکەوە دەیناسێ و ڕۆژێ لە ڕۆژان، کاری لەگەڵ کردووە، بە جۆرێکی دیکە باسیدەکا.
هەر وەک لە پێشەکیی چاپی یەکەمدا، « ئەم چاوپێکەوتنەمان چۆن سازکرد؟» زۆر بە درێژیی، لە ژیانی مامۆستا دواوم. ئێستەش لێرەدا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: لە یەک ووشەی پەشیمان نیم. چونکە، گەر خوێنەری هێژا، لە نووسینەکەی من وردبێتەوە، تەنیا باسی ژیانەکەیم کردووە، لە ڕەوشت و خەسڵەتی تایبەتیی، مامۆستا نەدواوم. لەبەرئەوەی، چ ئەو کاتانەی لە نێو شۆڕش، چ ئەو کاتانەی لە « ئێران » و چ ئەو کاتانەی لە « سوید »یش بووە، گەلێ شتی خراپم، لە سەر بیستبوو. لێرەدا، بە جوانی نازانم، باسیانکەم!
جگە لەوەی، لە لایەکەوە، من ئەو شتانەم، بە لاوە گرنگ نەبووە، بەڵکوو، ئەوەی من ویستوومە و لە لام گرنگبووە، تەنیا مێشک و زانیارییەکەی بووە. لە لایەکی دیکەشەوە، من هیچ جۆرە، ئەزموونێکی تایبەتییم، لەگەڵ مامۆستادا نەبووە. بەڵام، کورد ڕاستی فەرمووە، کاتێ گوتوویەتی: « سەفەر و معامەلە،

سەنگی مەحەکە! » هەر چەندە، من هەرگیز، « سەفەر »م لەگەڵ مامۆستا نەکردووە، بەڵام، ڕەنگە ئەم چاوپێکەوتنە، باشترین « معامەلە » بووبێ، لەگەڵمدا کردبێ! بۆیە، ئێستە دەزانم، لە لایەکەوە، چی دەڵێ، لە لایەکی دیکەشەوە، مەبەستی چییە و چی دەوێ!

هەر چەندە، کەس زۆری لە « مامۆستا » نەکردبوو، تا چاوپێکەوتن لەگەڵ مندا بکا. بەڵام، لەوە دەچێ، کاتێ بیستبووی، چاوپێکەوتنێکی تایبەتییم، لەگەڵ مامۆستا « برایم ئەحمەد »دا کردبوو، زۆر تامەزرۆبووبێ، وەک هێندێ کەس، بێزوویان پێوە دەکرد و خۆیان وەڵامیان بۆ دەناردم، گەر بمەوێ، ئامادەن، چاوپێکەوتنیان لەگەڵ بکەم! لەگەڵ ئەوەشدا، مامۆستا، دەربارەی چاوپێکەوتن لەگەڵ مندا، پێشەکیی، پرسی بە یەکێکی وەک « فەرهاد عەبدولقادر کەرکووکیی » کردبوو. ئەویش، زۆر بە ڕاشکاویی پێی گوتبوو: چاوپێکەوتن، لەگەڵ « حوسێن محەمەد عەزیز »دا مەکە! بەڵام، ئەو گوێی لێ نەگرت و هەر کردی! ئیدی، بۆ دەبێ، ئێستە، پەنجەی پەشیمانیی خۆی بگەزێ؟ خۆ، هیچی لە کیس نەچووە، جێگەکەی گەرم و نەرمە، لە تەڕ دەخوا و لە وشک لێی دەنوێ، ئەوەی بۆ ئەو لواوە، مەگەر هەر بۆ سەرانی « پارتیی » لوابێ!

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هێشتا مامۆستا « جەرجیس »، نە بە دەمیی، بە خۆمی گوتووە، نە لە هیچ شوێنێکیشدا نووسیوێتی، کە من شتێکم بە دەمی ئەوەوە نووسیوە. یا نەیگوتووە، من وام نەگوتووە. بەڵکوو گوتوویەتی: نەدەبوو، هەموو ئەو شتانە بڵاوکاتەوە، چونکە، هێندێکیم بۆ خۆی گێڕاوەتەوە، نەک بۆ بڵاوکردنەوە بووبێ! جا، گەر من ئەو زانیارییانەم، بۆ بڵاوکەردنەوە نەبووایە، ئایا، ئەو چاوپێکەوتنەم لەگەڵدا بۆ دەکرد؟!!

دوای چاوپێکەوتنەکەش، هێندێ دۆستی نزیک، تەنانەت، خەڵکی نەناسیاویش، بە نامە و تێلێفۆن ئاگاداریانکردم، کە هێندێ هەڵە، لە وەڵامەکانی مامۆستادا هەیە. تەنیا وەڵامی من، بۆ ئەوان ئەوەبوو: دەتوانن، بە گوتار وەڵامیبدەنەوە و ڕاستییەکان، بۆ جەماوەر ڕوونکەنەوە. بەڵام، بە داخەوە، کەس وەڵامی نەدایەوە و ئەو ئەرکە پیرۆزە مێژووییەی، لە ئەستۆی خۆی نەگرت.

گەر بشڵێم: من ڕاژەیەکی زۆر گەورەم، پێشکەش بە مامۆستا « جەرجیس » کردووە، شتێکی سەیر نییە. چونکە، لە لایەکەوە، هەر چی داخ و زووخاوی

ئەو چەن ساڵەی، لە نێو سکیدا پۆنگیخواردبۆوە، هەمووی هەڵڕشت و هێور بۆوە. لە لایەکی دیکەشەوە، هەم بە ئاواتی خۆی گەیی، بۆ نێو باوەشی گەرم و نەرم و چەوری بنەماڵەی « بارزانیی » گەڕایەوە. هەم بە کۆمەڵانی خەڵکیشم ناساند. چونکە، یەکێکی وەک مامۆستا « جەرجیس »، نەوەی نوێ نەیاندەناسی. ئەوەتە، دەربارەی ژیانی تایبەتیی خۆی و بەرهەمەکانی، لە وەڵامی پرسیارێکدا و لە چاوپێکەوتنەکەدا گوتوویەتی: (لە پەرتووکی « ئاراء مەحزورە »دا، پێش ئەوەی چاپکرێ، خاوەنی چاپخانەکە هات بۆ لام و گوتی: هێندێ کەس، هیچ لە بارەی تۆوە نازانن، ئاگایان لە پێوەندییەکانت، بە بزووتنەوەی کوردایەتییەوە نییە، پێویستە لەم ڕووەوە، خۆت بە خەڵکی بناسێنی، چونکە خەڵکی، بە تایبەتیی نەوەی نوێ، لە پێوەندیی تۆ بە شۆڕشەوە بە گومانن.)

سەیر ئەوەیە، مامۆستا « جەرجیس »، هەموو ئەو گوتار و دەکۆمێنتانەی باسمکردوون و بڵاومکردوونەتەوە، بە ئارەزووی خۆی داومێتێ، بێ ئەوەی داوای لێ بکەم. تەنانەت، لە هێندێ جێی چاوپێکەوتنەکەشدا، خۆی باسی کردووە. ئیدی، لەم لا و لەو لا، سرتە و بۆڵەی چی دەکا؟!!

با لێرەدا بپرسین: مامۆستا « جەرجیس »، دوای ئەوەی، ئەو هەموو قسانەی، بە ئەندامانی سەرکردایەتی « پارتیی » گوت، کە هێندێکیان وەک « حەبیب، سامیی، عەلی عەبدوڵڵا ... تاد »، ئێستەش لە « پارتیی »دا کاردەکەن، کادێری باڵان و دەستیاندەڕوا، بۆچی، پێی لە وێژدانی خۆی نا، هەموو شتێکی بیر خۆی بردەوە، جارێکی دیکە، دەستی لە نێو دەست نانەوە؟ بۆچی، جارێکی دیکە، بۆ نێو باوەشی پڕ لە ناز و دەوڵەمەندیی « پارتیی » گەڕایەوە؟

سەیر ئەوەیە، مامۆستا، زۆر لە دەست سەرکردایەتی « پارتیی » و ڕەوشی شۆڕشەکە بێزاربوو! ئەوەتە، هەر خۆی، لە کاتی دەمەتەقێکاندا، شۆڕشەکەی بە « زۆنگاو » و خۆشی بە « ناپاک » داناوە، چونکە، بەشداریی تێدا کردووە. بۆیە، زۆر بە ڕاشکاویی و لە چەندین جێدا گوتوویەتی: (من لە نێویاندا بووم، لە هەمان زۆنگاودا بووم. من ئێستە، ناوی دەنێم، زۆنگاو.

ـ زۆنگاوی شۆڕش؟

بەڵێ. من خۆم بە پاک نازانم و لە هیچ بەرپرسیارییەک ڕا ناکەم، بەڵام، ئەو کاتە نەمدەتوانی، وازیان لێ بێنم.

ـ بۆ؟

لەبەرئەوەی، ئەو کاتە، هەر کەسێ وازیبێنایە، بە « ناپاک ! »یان دادەنا. بەڵام، من خۆم دوورخستەوە. ئەوانیش، لە سەر پلەوپایە و شوێن، لە نێو خۆیاندا شەڕیاندەکرد.) کەچیی، دوای ئەو هەموو قسانە، دوای ئەو هەموو ساڵانەش، تازە لە شارۆچکەی « سەلاحەددین » تۆزدەکا، هەر وەک، نە بای دیبێ و نە باران تەڕیکردبێ!
هەڵبەتە، وەک لەم ڕۆژانەدا، برایەکی دڵسۆز، لە « سویسرا »وە بە تێلێفۆن پێی گوتم: (« جەرجیس »، پێش ئەوەی بگەڕێتەوە، چەن نامەیەکی بۆ نووسیوم. لە یەکێ لەو نامانەدا نووسیویێتی: من پیربووم، ناتوانم، بە تەنیا بژیم و ڕاژەی خۆم بکەم، پێویستم بە یەکێ هەیە، ئاگای لێم بێ و ڕاژەم بکا. بۆیە، دەگەڕێمەوە بۆ کورسستان!)
لە جێیەکی دیکەشدا، کاتێ، باسی پێوەندیی نێوان خۆی و « بارزانیی » کردووە، دەربارەی سەرانی « پارتیی » گوتوویەتی: (پێکەوە « شەترنج »مان دەکرد و هێندێ جاری دیکەش، پێکەوە تەماشاماندەکرد. هێندێ جار، ئەو سەری لە من دەدا، هێندێ جاری دیکەش، من دەچووم بۆ لای. ئەمەش، هەمووی لە بەیانییاندا بوو، پێش ئەوەی، دانیشتنەکانی دەستپێبکا. مەبەستم ئەوەیە، ڕۆژ نەبوو، ئێمە یەکدی نەبینین. لەو کاتانەشدا، ئەو دەیزانی، پێوەندیی نێوان من و پەلیتبیرۆ، بە تەواویی پچڕاوە و تەنانەت، سەرە داوێکیشمان لە نێواندا نەماوە. حەزم نەدەکرد، بە هیچ شێوەیە، کەسیان لێ ببینم. « مەلا مستەفا » پێی گوتم: تۆ لای من دەبی. جا بزانە، پێوەندییمان چۆن بوو! هەموویان، لەوە دەترسان، شوێنەکانیان لە دەستچێ. دەیانویست، دواموویی پێوەندییەکانی نێوانیان، لە پچڕاندن ڕزگار کەن.
بەڵام، « مەلا مستەفا » بڕیاربوو، جەنگ دەستپێبکاتەوە. ئەو شتە، کۆتایی پێهاتبوو. چونکە، هیچمان دەست نەکەوتبوو. بە هۆی « سامیی »یەوە، تەنانەت « کەرکووک »یشمان لە دەستچووبوو.)
بەم قسانەدا، وا دەردەکەوێ، چ لە سەردەمی « بارزانیی » باوک و چ لە سەردەمی « بارزانیی » کوڕدا، مامۆستا، لە لایەکەوە، پێوەندییەکی باشی، لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەکەدا، لە لایەکی دیکەشەوە، پێوەندییەکی خراپی، لەگەڵ ئەندامانی سەرکردایەتی « پارتیی »دا، هەبووبێ. بەڵام، ئەم کارە، لای بنەماڵەی « بارزانیی » گرنگ نەبووە و نییە. چونکە، هەر کەسێ، باوەڕی بە

خۆیان هەبووبێ، دڵسۆزیی خۆی پیشاندابێ، ئیدی، بە هیچ شێوەیە، گرنگ نەبووە و نییە، چی بە « پارتیی » و ئەندامانی سەرکردایەتییەکەی گوتووە و دەڵێ. هەڵبەتە، بنەماڵەی « بارزانیی »، لە سەروو « پارتیی »یەوە دێ، بۆیە، بەو شێوەیە، لە شتەکان دەڕوانن! واتە: هەر کەسێ، ڕەخنە لە خۆیان نەگرێ، یا سوکایەتییان پێ نەکا، ئیدی، گەر هەزار ڕەخنەش، لە « پارتیی » بگرێ، خراپترین سوکایەتیی، بە سەرکردەکانی « پارتیی » بکا، ئەوان گوێی نادەنێ. بۆیە، بەو شێوەیە، ڕێزی مامۆستایان گرتووە و دەشیگرن! چونکە، ئەوەتەی هەیە، هەر بەو شێوەیە ڕەفتاریکردووە و ژیاوە. خۆی بە نزیکترین، دۆست و دڵسۆزی بنەماڵەکە داناوە، گەر چی، چ لە « سوید » و چ لە « کوردستان »، هێندێ لە ئەندامانی « پارتیی »، خراپترین قسەیان پێ گوتووە. من، ئەو نامەیەی، خۆی پیشانیدام و کادێرێکی گەورەی « پارتیی » لە « سوید »، بۆی نووسیبوو، هەر ڕووم نایە، باسیکەم، چی تێدابوو!
جا، هەر وەک چۆن « پارتیی »، بە ڕواڵەت، بەرگی ئاڵووالآی ڕازاوەی « دیموکراسیی » پۆشیوە و بە زۆر لە خۆیەوە ئاڵاندووە، گەر بە ڕاستیی، کەمێ پارتێکی « دیموکراسیی » بووایە، بۆ دەبووایە، بەو شێوەیە، دژایەتیی من و نووسینەکانم بە گشتیی و ئەو چاوپێکەوتنەی بە تایبەتیی بکردایە؟!!
ئەگینا، گەر شتی تایبەتیی خۆیان و ڕاستگۆیی نووسینەکانم نەبێ، خۆ هێندەێ مامۆستا، لە هەر دوو بەرهەمی « ئاراء محزورە و زیارە لیلمازی ئەلقەریب »دا، باسی « پارتیی» و ئەندامانی سەرکردایەتییەکەی، بە خراپە کردووە، لە چاوپێکەوتنەکەدا، بەو شێوەیە نەیکردووە. ئیدی بۆ دەبێ، بەو چاوپێکەوتنە پەستبن، بە مەرجێ قسەکانیش، هەر قسەی ئەو بن و من تەنیا، پرسیارم لێ کردبێ؟ دیارە، بانێکە و دوو هەوا!
لێرەدا، بە پێویستی دەزانم، کەمێ دەربارەی، گوتارەکەی « حەبیب »یش بدوێم. لە « ئۆکتۆبەری/2000 »وە، تا « فێبروەری/2001 »، سەردانێکی کوردستانم کرد و ماوەی چوار مانگێ، لە شاری « سولەیمانیی » مامەوە. لە پەرتووکخانەی گشتیی « سولەیمانیی »، زۆر بۆ ئەو گوتارانە گەڕام، کە لە ڕۆژنامەکاندا، لە سەر چاوپێکەوتنەکە نووسرابوون. بەڵام، جگە لە گوتارەکەی « حەبیب »، هیچی دیکەم نەدۆزییەوە. هەر چەندە، دوکتۆر « شوکریە رەسووڵ »م، لە فیستیڤاڵی « گەلاوێژ »دا بینی و بەڵێنیدامێ، گوتارەکەی « موحسین دزەیی »م بۆ کۆپیکا و بۆم بنێرێ، بەڵام، تا ئێستە، دەنگی نەبوو!

ئەوەی « حەبیب »یش وەنەبێ، مافی تەواوی خۆی، بە چاوپێکەوتنەکە دابێ، نەخێر. بەڵکوو، تەنیا بایەخی، بە شەڕەدەنووکی نێوان خۆیان داوە، ئەگینا، هیچی دیکە نییە. جگە لەوەی، زۆر نەزانانە و کوێرانە، باسی چاوپێکەوتنەکە و منی کردووە. دیارە، ئەوەشی لە بەر ڕۆشنایی، ڕاپۆرتی سیخوورەکانی دەزگەی « پاراستن »ی بەشی « سوید »دا نووسیوە. ئەگینا، لە هەموو ژیانی خۆمدا، یەک جار « حەبیب »م دیوە. ئەویش، ساڵی « 1970 » ویستم، لە کۆلێژی « سەربازیی » بخوێنم. ناوم لە لیستی « پارتیی »دا نووسرا و لەگەڵ برادەراندا، بەرەو « بەغدا » جماین. ئەو کاتە، سەردەمی زێڕینی دەسەڵاتی « پارتیی » بوو، تازە ڕێککەوتننامەکەی « 11/مارس » مۆرکرابوو، هەڕەتی پێوەندیی و مانگی هەنگوینی نێوان، « پارتیی » و بەعس » بوو، ئینجا، سەربازێکی عەرەبی ڕەشی لاوازی هیچوپووچ، لە بەر دەرگەی کۆلێژی « سەربازیی »دا پاسەوانبوو، نەیدەهێشت، بچینە ژوورەوە، سۆراخی ئیشەکەی خۆمان بکەین و پرسیارکەین. گاڵتەی پێ دەکردین و بە پێکەنینەوە پێی دەگوتین: (بڕۆن، بە پارتیی بڵێن: « مەحموود ئەلحلو » دەڵێ: لە کۆلێژی سەربازیی وەرتان ناگرم.) ئەوە جگە لەوەی، نەشیدەهێشت، لەو ناوە بوەستین، کەچیی، لە هەمان کاتیشدا، لە بەر چاوی ئێمە، عەرەبەکانی دەکردە ژوورەوە و بێ گرفت، خۆیان پێدا دەکرد!

بە کورتییەکەی، ئەوە ئیشی ڕۆژ و دوو ڕۆژمان نەبوو، بەڵکوو، هەموو هەفتەیەک، دوو جار دەچووین، تا هەواڵێ بزانین. چونکە، تەنیا هەر ئەو دوو جارە، ڕێیاندەدا، خەڵک سەردانی کۆلێژەکە بکا. بەڵام، سەرەڕای ئەوەی، کۆلێژەکە لە ئێمەوە دووربوو، پارەیەکی زۆریشمان خەرجدەکرد، هیچ جارێکیش، کاکە « خولەی حیلو »، ڕێی ئێمەی کورد و « پارتیی » نەدەدا، بە دوای کارەکانی خۆماندا بڕۆین، چاومان بە لێپرسراوێ بکەوێ، تا بزانین، کارەکەمان بە چی گەیشتووە. ئیدی ناچاربووین، هەموو کۆبینەوە و بڕیاربدەین، لە پەلیتبیرۆی « پارتیی » شکاتبکەین.

بۆ ئەو مەبەستە، برادەران بڕیارياندا، دوو کەس هەڵبژێرن، تا نوێنەرایەتییان بکەن و بە دوای کێشەکەیاندا بڕۆن. پاشان، یەکێ لە شاری « هەولێر » و دووەمیشیان، لە شاری « سولەیمانیی » هەڵبژێرا. بۆ نەگبەتیی، ئەوەی لە « سولەیمانیی » هەڵبژێررا، من بووم. ئێوارە، هەر دووکمان، سەردانێکی بارەگەی ڕۆژنامەی « ئەلتەئەخی »مان کرد. لەوێ، چاومان بە « دارا تۆفیق »

کەوت. هەموو بەسەرهاتەکانی خۆمان، بۆ گێڕایەوە. ئەویش، لە بری ئەوەی، یارمەتییمانبدا و دڵنەواییمانبکا، گوتی: (ئێمە، لێرە هیچمان بە دەست نییە. ئەو قسانەش، قسەی سەربازێکی نەزان و نەخوێندەوارە، خۆ، تەنیا لە بەر ئەو قسەیە، ڕێککەوتنامەکە تێک نادەینەوە. بچن، سەرێ لە لقی پێنجی« پارتیی » بدەن، بزانن، ئەوان چیتان پێ دەڵێن.)
کاتێ، چووین بۆ ئەوێ، هەر یەکەیان، خۆی لە کارەکە دەدزییەوە و دەیان گوت: (لای ئێمە نییە، بەڵکوو، « عەقید رەووف » بەرپرسیاری ئەو کارانەیە.)
دەرگەوانێ لەوێ بوو، بەزەیی پێماندا دەهاتەوە، گوتی: هەڤاڵ « حەبیب »، لەو ژوورە دانیشتووە، چاوەڕوانکەن، ئێستە دێتە دەرەوە، یەکێکتان قسەی لەگەڵ بکەن. منیش بە هەلم زانی، قسە لەگەڵ هەڤاڵی بەڕێز « سکرتێری گشتیی پارتیی ! » بکەم و دەردی دڵی خۆمانی بۆ هەڵڕێژم. سەیر ئەوەبوو، ئەو ڕۆژە، هەموومان لەوێ خڕبووبووینەوە. هێندەی نەبرد، هەڤاڵ « حەبیب »، بە خۆی و جانتایەکی دۆیبلۆماسیی ڕەشی گەورەوە، وەک مانگ لە دەم کەل دەرکەوت. ویستی، بڕوا، خێرا، بەردەممان لێ گرت. من چوومە پێشەوە، بە کوردیی هێندێ قسەمکرد. بەڵام، ئەو نەیهێشت، قسەکانم تەواوکەم، خێرا پێی بڕیم، بە « عەرەبیی » وەڵامیدامەوە و گوتی: « های مو یمی ـ لای من نییە » و ڕۆی، منیش لە داخاندا گوتم: خۆ تۆ لای خۆی، لە جێی « برایم ئەحمەد » دانیشتووی، کەچیی، کوردییش نازانی! ئیدی، برادەران، کۆڵێ جنێوی چەوریان بۆ نارد. ئاخر، ئێمە خاوەنی ئەو پیاوانە بووین، بۆیە، دوای ئەوەی، ئەو هەموو پارەیەمان خەرجکرد، دوای ئەوەی، سێ مانگ چاوەڕوانیمانکرد، ئینجا، ناو دەرچوو. تەنیا، چوار کەسیشیان، لە « سولەیمانیی » وەگرت، ئەوانیش، لە پاڵ لیستەکەی « پارتیی »دا، هەر یەکەیان، دەستڕۆشتوویەکی گەورە، بۆیان تێکەوتبوو. کاتێ گەڕاینەوە، ساڵێکی خوێندنی کۆلێژیشمان، لە کیسچووبوو!
ئەوەش چیرۆکی کاکە « حەبیب »، کە هەمیشە، کوردە « فەیلیی »یە ساویلکەکان دەیانگوت: « حەبیب ها لە بان !» وایاندەزانی، گەر « حەبیب »، لە « بان » بێ، ئیدی کورد، لە بندەستیی و ناخۆشیی ڕزگاریدەبێ! نەیان دەزانی، هەر لە یەکەم تێکشکاندا، کاکەی سکرتێر، « بان » چۆڵدەکا، بۆ نێو باوەشی گەرم و پڕ لە نازی « بەعس » دەگەڕێتەوە، لە « بەغدا »ی پێتەختی تاوان دەگیرسێتەوە!

هەروەها، دەربارەی پەرتووکەکەی مامۆستا « جەرجیس »یش، « زیارە لیلمازی ئەلقەریب »، لە لایەکەوە، لە نێوان « موحسین دزەیی » و مامۆستا، لە لایەکی دیکەشەوە، لە نێوان « حەبیب محەمەد کەریم » و مامۆستادا، دەمەتەقێیەک، لە ڕۆژنامەی « خەبات »دا دروستبووبوو. لە نێوان ئەو شتانەی باسیانکردبوو، ناوی من و گفتوگۆکەش هاتبوو. بە داخەوە، من زۆر درەنگ پێم زانی. هەروەها، جگە لە « پەرتووکخانەی گشتیی سولەیمانیی »، هیچ کەس و جێیەکی دیکەم دەست نەکەوت، پەنای بۆ بەرم، بۆ ئەوەی، هەموو ژمارەکانم دەستکەوێ و چاوێکیان پێدا بخشێنم، تا بزانم، لەو بارەیەوە، چی نووسراوە. هەر چەندە، هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەی « خەبات » گەڕام، بەڵام، جگە لە گوتارەکەی « حەبیب »، ئەوەی « موحسین دزەیی »م نەدۆزییەوە، چونکە، هەموو ژمارەکانیان نەبوو.
بەڵێ، گوتارەکەی « حەبیب »م دۆزییەوە، زۆر بە وردیی، خوێندمەوە. من لێرەدا، باسی دەمەتەقێکەی نێوان مامۆستا و « حەبیب » ناکەم. چونکە، وا دیارە، هەر دووکیان، یەکدی باش دەناسن و با هەر تەنیا خۆیان، داکۆکیی لە خۆیان بکەن! بەڵام، هێندەی پێوەندیی، بە من و چاوپێکەوتنەکەوە هەبێ، هەر بە « عەرەبیی »، ئەو بەشەی ڕادەگوێزم و بە « کوردیی »ش وەڵامیدەدەمەوە!
ئێستە با بزانین، کۆنە سکرتێری « پارتیی »، دەربارەی من و چاوپێکەوتنەکە چی گوتووە! دیارە، ئەو پاڵەوانە، ڕابوردووی خۆی بیرچۆتەوە، بۆیە دەوێرێ، ناوی خەڵکی نیشتمانپەروەر بێنێ! یا وا دەزانێ، هەموو کەسێ وەک خۆی و هاوەڵەکانی وایە، هەر دەمەی لە سەر پەتێ یاریبکا! بۆیە گوتوویەتی:(واخیرا، لم یتورع الاستاذ عن عقد صفقه مع حزب العمال الكوردستانی یتولی هو بموجبها الطعن فی الثوره الكوردیه وقادتها لقاء ثمن یعرفه هو، وقد تم انجاز هذه الصفقه فی كتاب « الدوران فی حلقه مفرغه » عام1997 مع الناشر حسین محمد عزیز وتمت ترجمه الكتاب الی اللغه الكوردیه « لاتمام الفائده » تحت عنوان « خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا » والناشر هو احد اتباع ال « پ. ک. ک.» المعروفین فی اوروپا. وما نشره الاستاذ فی كتابه الاخیر هو تكرار تقریبا لما نشره فی كتابه « زیاره للماضی القریب » مع فارق واحد هو ان الاستاذ كان یتجنب المس بشخص مصطفی البارزانی اما كتابه الاخیر فقد خرج عن هذه القاعده حیث اساء، ببذائه الی شخص البارزانی و علی الصفحه « 18 » من الطبعه الكوردیه للكتاب،. )«2»

جارێ، با پێشەکیی، ئەوە بڵێم: ئەو پەرتووکە بە عەرەبیی بڵاو نەکراوەتەوە. بەڵکوو، چاوپێکەوتنەکە، بە عەرەبیی کراوە و بە کوردیی بڵاوکراوەتەوە. جگە لەوەی، من وەک نووسەرێ، چاوپێکەوتنەکەم ئەنجامداوە. واتە: « ناشر » نیم، وەک « حەبیب » بۆی چووە، بەڵکوو، چاپخانەی « APEC » بڵاویکردۆتەوە.
پاشان، نەک هەر « حەبیب »، بەڵکوو ماموّستاش، لە گوتارەکەی خۆیدا، بە هەمان هەڵەدا چووە! هەر چەندە، پێشەکیی پێم گوتبوو: من بێ لایەنم و ئەندامی هیچ پارتێکی کوردیی و کوردستانیی نیم. کەچیی، ئەویش بە قسەی ئاژاوەچیی و سیخوورەکانی « پاراستن »ی بەشی « سوید » هەڵخەڵەتابوو، گوایە: من ئەندامی « P.K.K. »م. ئەمەیە دەڵێ: « بە دەنگی مەلا بڕوا ناکا، بە زەڕەی کەر، باوەڕدەکا! »
ئەز، ئەوەتەی هەم، لە هەموو ژیانی خۆمدا، لەو بارانەوە، نە پێویستم بەوە هەبووە، درۆ بۆ کەس بکەم، نە لە کەسیش ترساوم. لەبەرئەوە، گەر بڵێم: ئـــەوەتەی « کوردستان »م جێهێشتووە، لە ساڵی « 1981 »ەوە، ئەندامی هیچ پارتێکی کوردیی و کوردستانیی نەبووم و نیشم، هەرگیز درۆم نەکردووە. چونکە، هەرگیز، پێویستم بەوە نەبووە و نییە، نە بۆ « حەبیب » و نە بۆ سەرکردەکانی ئەوڕۆی « حەبیب »یش، پاکانە لە هیچ شتێ بکەم. هەرچیشم بە ڕاست زانیبێ، بۆ خۆم و نەتەوەکەم کردوومە، بێ ئەوەی، یەک دەنگ، گوێ بە « جنێودان، سوکایەتییپێکردن، پیلانگێڕان، پڕوپاگەندەی درۆ، گوفتار و ڕەفتاری ناشیرینی » ئەو ڕێکخراوە لە هێڵ دەرچووانە بدەم!
بەڵام، لە ڕاستییدا، خۆم لەوە زۆر بە کوردتر و دڵسۆزتر دەزانم، « ئەوڕۆ »، ئەندامی هەر پارتێکی کوردستانیی بم. جارێکی دیکەش، دووپاتیدەکەمەوە و زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: خۆم لەوە بە گەورەتر دادەنێم، لەگەڵ کۆنەجاش و سیخوورەکانی ڕژێمی « بەعس »دا، لە یەک ڕێکخراو و پارتی ڕامیاریی کوردستانییدا ئەندامبم! چونکە، هیچ چاکەیەکیان تێدا نابینم. تەنیا هەر ئەوەش، منی لای جەماوەری خوێنەران، خۆشەویستکردووە، ڕێز لە خۆم و نووسینەکانم دەگرن، کە تا ئێستە، لەکەی « دزیی، پیاوکوشتن، ئاودیوکردن، جنێودان، بێ هەڵوێستیی، ناپاکیی، بەشداربوون لە جەنگی چەپەڵی نێوخۆدا، مەراییکردن، خۆ هەڵواسین بە خەڵک و ڕێکخراوە کوردستانییەکاندا، ڕاڕایی و دڵەڕاوکە »، وەک قووڕی زستان، چۆن دامێنی هەموو کەسێ پیسدەکا، هێشتا، دامێنی منی پیس نەکردووە!

بۆیە، چەندین برای دڵسۆز، چ لە هەندەران و چ لە کوردستان، داوایان لێ کردووم، هەر وەک خۆم چۆن بووم، هەر بەو شێوەیە بمێنمەوە و تێکەڵی، هیچ لایەک نەبم. تەنانەت، ئەندامێکی پەلیتبیرۆی « پارتی زەحمەتکێشانی کوردستان »، کاتێ سەردانیکردم و ماڵاوایی لێ کردم، گوتی: (زۆر تکات لێ دەکەم، هەرگیز، توخنی پارتایەتیی مەکەوە. باوەڕبکە، من ئێستە، شەرم دەکەم، بڵێم: ئەندامی پەلیتبیرۆم و کوردایەتیی دەکەم. بەڵام، تازە ئێمە تووشبووین و چارمان نییە!)
لە هەمان کاتیشدا، نە خۆم لە هیچ کوردێ، بە پچووکتر دەزانم، نە هەرگیز خۆشم، لە هیچ کوردێکی دیکەی نیشتمانپەروەر و دڵسۆز، بە گەورەتر دانانێم! هەر چەن، ئەو کوردە، گەورەبێ و پلەوپایەی ڕامیاریی و کۆمەڵایەتیی بەرزبێ،
ئەم قسەیەی « حەبیب »، وەک برادەرێکی نزیکم گوتی: لەوە دەچێ، «حەبیب » بەو کارەی، یارمەتییەکی پچکۆلانەی، پێشکەش بە دەوڵەتی « توورکیا » کردبێ، گوایە: من یەکێ لە کادێرە ناسراوەکانی « P. K. K. »م، تا بە لانی کەمەوە، ڕێی ئەوێم لێ بگیرێ. یا، گەر بە وێدا تێپەڕیم، تووشی ئازار و گرتنم کا. ئەمەش خۆی لە خۆیدا، سیخووڕییەکی خۆڕایی نەبێ، هیچ دیکە نییە!
ئاخر، پیاوێ، سکرتێری پارتێکی گەورەی، بە دەسەڵاتی وەک « پارتیی » بوو بێ. پیاوێ، لەگەڵ سەرکردەیەکی مەزنی، وەک « بارزانیی »دا کاریکردبێ، ئایا دەبێ، لە یەکەم تێکشکاندنی شۆڕشەکەدا، ئاڵای سپی هەڵکا، دەسی خۆ بەدەستەوەدان بەرزکاتەوە و پەنا بۆ بەر « بەعس » بەرێ؟ ئەو « بەعس »ەی، بە سەدان هەزار، هەر کوردی « فەیلیی » لە « عێراق » دەرکرد! بە هەزاران کوردی هەڵواسی. هەڵبەتە، قوتابخانەکەی « پارتیی »، وەک کەشتییە پان و پۆڕەکەی « نووح » وایە، لە هەموو کات و سەردەمێکدا، جێی هەموو چەشنە زیندەوەرێکی تێدادەبێتەوە، وەک چۆن، کەشتییەکەی « نووح »، جێی هەموو جۆرە « مرۆڤ، ئاژەڵ، پەلەوەر، جانەور و ڕووەک »ێکی تێدابووبۆوە، لە هەر ڕەگەزێ، نێر و مێیەکی تێدابوو، تا تۆویان نەبڕێ و پاشان زاووزێبکەن!
بەڵێ، ئەوا لە سەر داواکاریی خوێنەرانی هێژا، چاوپێکەوتنەکە، دوای پێنج ساڵ، بۆ دووەمین جار، چاپ و بڵادەکەمەوە. تا، ژمارەیەکی زۆرتری، دەست خوێنەرانی نەتەوەکەم بکەوێ و کەڵکی لێ وەرگرن.

لەم چاپە نوێیەدا، ئەوەی دەستکارییکراوە، تەنیا « ڕێنووس، قەبارەی پیت و ماوەی نێوان دێڕەکان » نەبێ.، هیچی دیکەی لێ نەگۆڕاوە. هەر چی، هەڵەی ڕێنووس و چاپیشی تێدابوو، هەموویم چاککردووە، هەموویم سەرلەنوێ، بەو ڕێنووسە نوێیە نووسیوەتەوە، کە لە ساڵی « 1998 »ەوە پێڕەویدەکەم. ئەو ووشە « عەرەبیی »یانەی تێشیدامابوو، بەپێی توانا، بە کوردیی نووسیومن.
هەروەها، نیشانەکانی « خاڵبەندیی »شم، بۆ سەرجەمی نووسینەکە داناوە. پێشەکیی نوێم بۆ نووسیوە، گوتارەکەی مامۆستا و وەڵامەکەی خۆشمم بلاو کردۆتەوە. بۆیە، ژمارەی لاپەڕەکانی، لە ژمارەی لاپەڕەکانی چاپی یەکەم زیاترە. هەر چیش پێویستبووبێ، بۆ ئەوەی چاپی دووەم، بە شێوەیەکی جوان و بێ هەڵە، پێشکەش بە خوێنەرانی هێژای نەتەوەکەمی بکەم، کردوومە. هەستیشم بە هەر هەڵەیەک نەکردبێ و بازم بە سەریدا دابێ، ئەوا، جگە لەوەی، داوای لێبووردن لە خوێنەرانی هێژا دەکەم، بۆ ئێوەی ئازیزیشی بەجێ دێڵم، تا هەڵەکانم بۆ ڕاستکەنەوە، منیش و خۆشتان، لەو چاکە گەورەیە، بێ بەش نەکەن!
لە کۆتایی ئەم ڕوونکردنەوەیەشدا، زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێم: باوەڕم بە هەر شتێ بووبێ و هەبێ، نووسیومە و دەشینووسم. هیچ جۆرە لێکدانەوەیەکیش، بۆ سرتە و بۆڵەی هیچ « کەسێ، بنەماڵەیە، تیرەیە، هۆزێ، ڕێکخراوێکی دیمۆکراسیی، پارتێکی ڕامیاریی و دەوڵەتێکی داگیرکەر » ناکەم. چونکە، نەتەوەکەم لە هەموو ئەوانە، بە گەورەتر و پیرۆزتر دەزانم، بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەکەشم، لە سەروو هەموو ئەوانەشەوە دادەنێم. تا ئێستەش، هەر چییەکم نووسیوە، هەرگیز، لێی پەشیمان نیم، چونکە، لە باوەڕێکی تەواوە نووسیومن!
لێرەدا دەمەوێ، زۆر بە ڕاشکاویی بڵێم: ئەز هەر چی بنووسم، یا چاوپێکەوتن لەگەڵ هەر کەسێکدا سازکەم، تەنیا بەو نیازە، دەیاننوسم و چاوپێکەوتنەکە سازدەکەم، تا، ڕاستیی ڕووت، بۆ جەماوەری نەتەوەکەم ڕوونکەمەوە، بۆ مێژوو تۆماریکەم و ڕاژەی کوردی پێ بکەم. ئەگینا، هەرگیزاوهەرگیز، بەو نیازە نانووسم و چاوپێکەوتن، لەگەڵ کەسدا ساز ناکەم، زیان بە لایەنێک و کەڵک بە لایەنەکەی دیکە بگەیەنم. جا ئیدی، هەر کەس و هەر لایەنێ، زیان یا کەڵک، لە ڕاستیی و درووستیی کارەکانم دەبینێ، ئەوەیان، گرفتی تایبەتیی خۆیەتی. چونکە، نە لە دوورە و نە لە نزیکەوە، نە هیچ جۆرە پێوەندییەکی، بە منەوە هەیە، نە هێندەش لای من گرنگە!

ئەوە جگە لەوەی، من وەک کەسێ، تەنیا پرسیارەکەم، ئەو کەسەی چاوپێکەوتنەکەشی لەگەڵ دەکەم، دەتوانێ، بە ئارەزووی خۆی وەڵامبداتەوە. جا، هەر چی دەڵێ، چاک یا خراپ، تەنیا هەر خۆی لێی بەرپرسیارە. کێش پێی ناخۆشە و تووشی زیان دەبێ، با یەخەی ئەو بگرێ، نەک هەر بە تەنیا، گەڕی بارە ترێ، بە من بکا!

ستۆکهۆڵم
2002/03/21

**تێبینی:**

1. لە پاشکۆی چاوپێکەوتنەکەدا، گوتارەکەی مامۆستا بە عەرەبیی و وەڵامەکەی خۆم بە کوردیی بڵاودەکەمەوە. بۆیە بە « عەرەبیی » دەینووسمەوە، تا ئەم جارەش، کەس نەڵێ: بە خراپ وەریگێڕاوە!
2. حبیب محمە کریم، الاستاذ جرجیس فتح الله .. ما له و ما علیه، جریده خەبات، العدد 963، الجمعه 2000/02/11، ص9.

# ئەم چاوپێکەوتنەمان چۆن سازکرد؟

دەمێبوو، ناو و ناوبانگی، مامۆستا « جەرجیس فەتحوڵڵا »م بیستبوو. تەنیا لە دوورەوە و لە ڕێی بەرهەمەکانییەوە دەمناسی. بە تایبەتیی، کاتێ ساڵی «1972»، پەرتووکە بە ناوبانگەکەی « دانا ئادەمز شمدت ـ رحلە الی رجال الشجعان فی کردستان »م خوێندەوە، کە مامۆستا، کردبووی بە « عەرەبیی » و بە ڕوونکردنەوە و زانیاریی پڕ بایەخ، پەراوێزەکانی دەوڵەمەندکردبوو، هێندەی دیکە، پلەوپایەی، لە نێو دڵمدا زیادیکرد. بۆیە، زۆر تامەزرۆبووم، ڕۆژێ لە ڕۆژان، لە نزیکەوە بیناسم. حەزمدەکرد، چاوم بە ڕەنگی بکەوێ، گوێم لە دەنگی بێ، گەلێ پرسیاری ئاراستەکەم، تا سەرە داوی هێندێ، لە گرێکوێرەی نهێنییەکانی شۆڕشی «11/سێپتێمبەر »م بۆ بکاتەوە.

ساڵی « 1990 »، لە « یەکێتی سۆڤێت »ی پێشوو گەڕامەوە. ئیدی، بە یەکجاریی، لە « سوید » جێگیربووم. « نەبیلی نووریی مەتیی » هاوڕێم، ماڵیان لە شاری « کاترینەهۆڵم » بوو. لە مێژبوو، یەکدیمان نەدیبوو. داوەتی کردم. منیش، بە خۆشییەوە بانگهێشتنەکەیم پەسەندکرد و بەرەو « کاترینەهۆڵم » بەڕێکەوتم.

لەوێ، « نەبیل » گوتی: مامۆستا « جەرجیس » لێرە دەژی، دەڵێی چی، سەردانێکی بکەین؟ منیش، خۆشحاڵیی خۆمم دەربڕی و هەر ئەو ڕۆژە، دیدەنیمانکرد. سەردانەکەی ئەو جارە، هەر بەشی هێندەی کرد، کەمێ لێی وردبمەوە و خۆمی پێ بناسێنم، ئیدی، لەوە زیاتر، فریای هیچی دیکە نەکەوتم. پاشان، سەردانەکان دووبارە و چەند بارەبوونەوە. هەموو جارێ، من وەک شاگردێکی تینووی، ڕێگەی زانست و زانیاریی، بێ دەنگ، بەرانبەری

دادەنیشتم، چاوم تێدەبڕی و پرسیارم لێ دەکرد. ئەویش، بە سنگێکی فراوانەوە، بەو دەنگە گڕە بەرزەی خۆی، وەڵامیدەدامەوە، هەرچی دەزانی، بە دوورودرێژیی، بۆی باسدەکردم و درێغی نەدەکرد. منیش، بە دڵ و بە گیان، گوێم لێ دەگرت، بە شێوەیە، هەموو گیانم، لە ئاستی وەڵامەکانیدا، وەک درەختێ، هێشووی بیستنی دەگرت و شەپۆلی قسەکانی، تێکەڵاوی زەریای هەست و هۆشم دەبوون. بەڵام، هەرچیم دەکرد، تێرم لە قسە بەلەزت و زانیارییە پڕ بایەخەکانی نەدەخوارد. ئیدی، بەو چەشنە یەکدیمان ناسی. جگە لەوەی، بە شێوەیەکی بەردەوامیش، هەموو بەرهەمە نوێکانیم دەخوێندەوە، جاروباریش، تێلێفۆنم بۆ دەکرد.
ڕۆژی «6/ئەپرێلی/1997»، « کۆمەڵەی کوردستان ئاوارە »، کۆڕێکیان لە سەر، دووبەرەکییەکەی نێوان « بارزانیی » و باڵەکەی « پەلیتبیرۆ »، بۆ مامۆستا سازکرد. منیش، چووم و بەشداریم لە کۆڕەکەدا کرد. دوای ئەوەی، مامۆستا باسەکەی پێشکەشکرد، پشوویەکماندا. مامۆستا وەک پیشەی هەمیشەیی خۆی، لێی پرسیم: کۆڕەکە چۆن بوو؟ منیش گوتم: بە گشتیی باشبوو. بەڵام، بە تەواویی، تینوێتی منی نەشکاند. چونکە دەبووایە، زیاتر پێتان داگرتایە، ڕووداوەکانتان، باشتر شیکردایەتەوە، توندتر، دانتان بە ووشەکاندا بنایە و هەموو شتەکانتان، بە تەواویی ئاشکراکردایە. گوتی: لەوە دەچێ، کۆڕەکەت بە دڵ نەبووبێ؟ گوتم: بۆ نایەی پێکەوە، کارێکی هاوبەش بکەین؟ گوتی: باشە. منیش گوتم: گەر بیرت مابێ، مانگی « ژەنیوەری/1991 »، من و « نەبیل » و ئەفسەر « کەریم سەلام » هاتین بۆ لات. دەمەتەقێیەکی زۆرمان، لە سەر « بەکر سدقیی » و « بارزانیی » و شۆڕشی «11/سێپتێمبەر » کرد. من لێم پرسیت: ئایا، « بارزانیی » هەڵەی هەبوو؟ تۆ گوتت: زۆر. « کەریم سەلام »یش گوتی: ئەدی، بۆ نایاننووسی؟ تۆش گوتت: « هذا یکلفنی حیاتی ». گەر ئێستەش، هەر بەو شێوەیە وەڵامم بدەیتەوە، ئەوا، هەر نەیەم باشترە، بە مەرجێ دێم، هەموو شتێکم، لا بدرکێنی. گوتی: باشە، تۆ وەرە، من هەموو شتێک، بۆ باسدەکەم. ئێستە، گوێ بە هیچ شتێ نادەم. بەڵام دەبێ، پێش شەو و ڕۆژێ، پرسیارەکانم بە نووسین بۆ بنێری. ئیدی، لە سەر هەموو شتێ ڕێککەوتین.
ڕۆژی « 4/18 »، بە خۆم و کامێرایەکی پچکۆلە و ڕێکۆردەرێکی گەورەوە، بەرەو لای مامۆستا سواربووم. بە دەم ڕێگەوە، هەر بیرم لە پرسیارەکان

دەکردەوە. لە دڵی خۆمدا، لێکمدەدایەوە و دەمگوت: لە کوێوە دەسپێکەم؟ تۆ بڵێی، مامۆستا هێندە سنگی فراوانبێ، گوێ بۆ هەموو پرسیارەکانم ڕادێرێ، یەکەبەیەکە، وەڵامێکی پڕ بە پێستی خۆیان بداتەوە و کاڵا بەقە باڵابێ؟ گەلێ بیر و ئەندێشەی سەیر، بە مێشکمدا تێپەڕیدەکرد، پرسیارەکان، وەک چەن پەڵە هەورێکی، سکپڕی زستانی پڕ لە باران، سەراپای ئاسمانی بیر و هۆشمیان داپۆشیبوو، لە پڕ دەیانگرماند و ڕایاندەچڵەکاندم. بەدەم ڕێشەوە، هەر پرسیارێکی دیکەی نوێ، لە منداڵدانی بیر و هۆشمدا لەدایکدەبوون، خێرا تۆمارمدەکردن.
« کاتریۆنەهۆڵم »، لە شاری « ستۆکهۆڵم »ەوە، هێندە دوور نییە. بە شەمەندەفەر، هەر حەفتا خولەکێ دەخایەنێ. هەرچی چۆنێ بوو، لە کاتی خۆیدا گەیشتم. ئیدی، بەندی بیرکردنەوەم پسا. لە پەنجەرەکەوە، « نەبیل »م بینی، لە سەر شۆستەی ئێسگەی شەمەندەفەرەکە، چاوەڕێیدەکردم. بەپێی ڕەوشتی کوردەواریی، باوەشمان بۆ یەکدی کردەوە. پاشان، یەکسەر لە ڕێوە، سەرێکی مامۆستامان دا. هەر چاوی بە من کەوت، ڕووی لێ گرژکردم و گوتی: من سەرم زۆر قاڵە، ئیشم زۆرە و کاتم نییە. تۆش پرسیارەکانت زۆرن. ڕۆژانی شەممە و یەکشەممانیش، کار ناکەم، لەگەڵ هاوڕێکانمدا کۆدەبینەوە و یاریدەکەین، دەبێ، کاتێکی دیکە دانێین. سەرەتا، دڵم لە خۆم داما. بەڵام، کۆڵم نەدا. چونکە، لەو بڕوایەدا بووم، مامۆستا، لە بارودۆخێکی دەروونیی خراپدابێ. بۆیە، بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵاممدایەوە و گوتم: خوا گەورەیە، کاتمان زۆرە و تۆ چۆن دەفەرمووی، وا دەکەین. گوتی: ئارەزووی خۆتە. من تەنیا، بەیانیان ماوەم هەیە و دەتوانم، کارت لەگەڵدا بکەم. هەرچی چۆنێ بوو، پێکهاتین و بڕیارماندا، کاژێری حەوتی سەرلەبەیانی دەسپێبکەین.
ئێوارە، سەرمان لێ دایەوە. هێندێ گوتار و بەرهەمی خۆی دامێ و گوتی: پێشەکیی، ئەمانە بخوێنەرەوە، تا ئاگاداری، هێندێ شت بی و بزانی، چیم گوتووە و چیم نووسیوە، بۆ ئەوەی، لە کاتی وتووێژەکەماندا، پرسیار و وەڵامەکان، دووپات نەبنەوە. منیش، هێندەی ماوەم هەبوو، بۆی دانیشتم و لە ماوەی چوار کاژێردا، زۆربەی زۆریانم تەواوکرد. ئەویش، لەگەڵ میوانەکانیدا، لە موبەقەکە یاری کاغەزیان دەکرد، پێدەکەنین و جارو باریش، دەنگیان لێ بەرزدەکردەوە، وەک شەپۆلێکی گەورە، چۆن هێمنیی زەریایەک دەوروژێنێ و تا کەنار ڕاویدەنێ، هەر بەو چەشنەش، دەنگەدەنگەکە، زنجیرەی بیر و هۆشی

دەپچڕاندم. دوایی، لەگەڵ « نەبیل » گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئەو شەوە، تا درەنگانێ، پێکەوە دانیشتین، باسی دۆستایەتیی خۆمان و هاوڕێکانی دیکە و یادگارە تاڵ و شیرینە کۆنەکانی سەردەمی حەفتاکانمان دەکرد. بۆ بەیانی، بەو ڕۆژی شەممەیە، کاتێ، زۆربەی زۆری خەڵک، لە شیرین خەودابوون، ئێمە کـــاژێری « 7.30 » دەسمان بە کارکردن کرد و بە یەکەم پرسیار، گۆمی مەنگی قووڵی، بیرەوەرییەکانی مامۆستام شڵەقاند.

ئەمە، یەکەم جارم نییە، سەردانی مامۆستا دەکەم. بەڵام، ئەم جارە، لەگەڵ هەموو جارەکانی دیکەی پێشوودا، گەلێ جیاوازییان هەبوو. سەرەتا، وەک یەکەم جار بێ، تا مامۆستا، خۆی ڕێکخست و دانیشت، زۆر بە وردیی، سەرنجم لە ماڵەکەی دا. لە هەر دوو ژووری دانیشتن و نووستنەکەیدا، چەند دۆلابێکی، پڕ لە پەرتووکی قەبەقەبەی بە نرخ دانرابوون، سەر مێز و پەنا و پاساری ژوورەکانیش، بە « کاغەزە شڕە، نامە، ڕۆژنامە، گۆڤار و پەرتووک » سیخناخکرابوون. چەن پەرتووکێ، لەسەر گازی پشت لێی کەوتبوون و لاپەڕەکانیان هەڵدرابوونەوە. دەسنووس و ڕەشنووسەکانی خۆی، لەو نێوەدا بڵاوبووبوونەوە. هەر کەسێ، بۆ یەکەم جار، ڕێی بکەوتایەتە لای مامۆستا و چاوی بە ژوورەکەی بکەوتایە، یەکسەر دەیزانی، ماڵە نووسەرە. بە ڕاستیی، هەر چەند سەیری ژوورەکەیم دەکرد، لە ژووری پیاوێکی نووسەر و زانا و گەورە نەبێ، لە هیچی دیکەی نەدەکرد.

دیواری ژوورەکانی، بە چەن وێنەیەکی تایبەتیی، دۆست و ئازیزەکانی خۆی ڕازاندبۆوە. لە سوچێکەوە، وێنەیەکی سەردەمی کامڵبوونی خۆی، هەڵواسی بوو، هەر چەند لێی وردەبوومەوە، شێوەی ئەکتەری بە ناوبانگی« ئەرمەنیی » « ئەرمینیان جگەرخوێنیان »م بیردەکەوتەوە. لەو بەرەوە، چەن وێنەیەکی کلاسیکیی ریزکرابوون. بەرامبەریشم، وێنەیەکی ژەنەڕاڵ « بارزانیی » بوو، لەگەڵ چەن پێشمەرگە و پاسەوانێکی خۆیدا، لە سەر کۆمەڵێ بەرد دانیشتبوون. وێنەکە، لە دوارۆژەکانی شۆڕشی «11/سێپتێمبەر»دا گیرابوو. لە پشتی سەریشییەوە، وێنەیەکی دیکەی تەنیای، « بارزانیی » هەڵواسیبوو، کە لە نێو قەدی بەرەوژوور دەرکەوتبوو. ئەو دوو وێنەیە، نیشانەی« دڵسۆزیی، ئەمەک و خۆشەویستیی »یەکی گەورەی بێ سنووری مامۆستای، بەرانبەر « بارزانیی» پیشاندەدا. لەم بەریشەوە، وێنەیەکی خۆی و « عەلی سنجاریی»، بە دیوارەکەدا داکوتابوو.

مامۆستا، له سەر کورسییەکی گەورە، بەرانبەرم دانیشتبوو، کراسێک و پانتۆڵێکی بیجامەی لەبەردابوو. هەرچەند سەیرمدەکرد و لێی ورددەبوومەوە، دیمەنی مامۆستام، لا سەیر نەبوو، وەک ناسیاوێ، دەهاتە پێش چاوم، چونکە زۆربەی زۆری، خەڵکی ڕۆژهەلات له یەکدی دەچن!
مامۆستا، دەموچاوێکی ئاسایی پێوەیە، کەللەیەکی زل و سەرێکی ڕووتاوەی خڕی گەورەی ڕێکی هەیە، ئەم لا و ئەو لاکەشی، بە چەن تاڵەموویەکی سپی داپۆشراوە. بەڵام، له نێو بۆشایی ئەو کەللە گەورەیەدا، چەن گرامێ، مێشکی تێدایە، کە له خەڵکی دیکەی جیادەکاتەوە! نێوچەوانێکی کەمێ پانیشی هەیە، هێندێ، خەتی کوورت و درێژی تێدا کێشراوە، له لایەکەوە، نیشانەی بە ساڵاچوون و له لایەکی دیکەشەوە، شوێن پەنجەی « ئازار، ژان، خەم، چەرمەسەریی و دەربەدەریی » ژیانی پێوە دیاربوو. دوو برۆی گەورە و پڕیش، پشتی چاویان تەنیووە. لووتێکی گەورەی بەرانیی ڕۆژهەلاتیش، له نێوەڕاستی دەموچاویدا، قیتبۆتەوە و بە سەر بەرسمێڵ و لێویدا شۆڕبۆتەوە. بە جووتێ چاوی قووڵی مەنگەوە، تێیدەڕوانیم و بە دەنگێکی گڕی، پڕ له پەژارەی حەفتاوشەش ساڵییەوە، بە زمانی « عەرەبیی » و بە شێوەی « موسڵاویی »، هێواشهێواش، وەڵامی پرسیارەکانی دەدامەوە و بۆم دەدوا. جاروباریش، بەپێی ڕەوتی قسە و باسەکان، دەنگی لێ بەرزدەکردەوە و هێندێ جاریش، یادگارێکی تاڵ دەیهەژاند و توڕەدەبوو، بەو دەستە زلانەی و بە هەموو هێزی خۆی، مستێکی توندی، له مێزەکەی بەردەمی دەدا و دەیلەراندەوە. تەزبیحێکی ویسری ڕەشی، دەنک گەورەی بەڵەکبەڵەکی بە دەستەوەبوو، خێرا خێرا، دەنکەکانی دەبژاردن، دەنگی هێندە ڕەق و ناسازبوو، بە تەواویی، کاری له مێشک و دەروونم کردبوو، بێزاری کردبووم. بە تایبەتیی، کاتێ بەر دەسکی کورسییە تەختەکەی ژێری دەکەوت، هێندەی دیکە، تەقەی دەهات. ڕووشم نەدەهات، داوای لێ بکەم، واز لەو تەقەتەقە بێنێ و تەزبیحەکەی دانێ، تا، له ناکاو هەستا و چوو دەکومێنتێ بێنێ. منیش، هەلم بۆ هەڵکەوت و خێرا تەزبیحەکەم لێ شاردەوە. بەڵام، بریا لێم نەشاردایەتەوە، چونکە نەیدەزانی، خۆی بە چییەوە خەریککا، بە هەر چوار لادا، دەسیدەکوتا و زووزوو، زرمەی له مێز و قەراغی کورسییەکە هەڵدەستاند. ناوبەناویش، جگەرەیدەکێشا، تا، کاغەزی سپی جگەرەکە تەواو نەبووایە، نەگەیشتایەتە سەر فیلتەرەکەی، هەر دوو پەنجەی دەسی ڕاستی نەسووتاندایە و بەهۆشی نەهێنایەتەوە،

نەیدەکوژاندەوە. دیمەنی مامۆستا، دیمەنی پیاوێ بوو، بە ئاشکرا، ڕەنگی پەڕەوازەیی و نامۆیی پێوە دیاربوو. تەپوتۆزی ماندوویی، لە ڕووی نیشتبوو، لە قووڵایی زەریای، نێو چاوە کاڵە مەنگەکانیدا، غەمێکی بێ سنوور، شەپۆلی دەدا. کاتێ، بە تەواویی، لێی وردەبوویتەوە، بە دەیان گلەیی و ڕەخنە، لە نێو گلێنەی چاوەکانیدا بریسکەیدەهات.

مامۆستا، هەموو پەنجەرەی ژوورەکانی داخستبوو، پەردەکانیشی دادابۆوە. تەنیا، یەک گڵۆپ دەسوتا و لە تەنیشتییەوە شۆڕبووبۆوە. شەپۆلی دووکەڵی جگەرە و تیشکی گڵۆپەکە، تێکەڵ بە یەکدی بووبوون. ژوورەکە، کەشێکی پڕ لە ئەندێشەیی وەرگرتبوو. بە گشتیی، ماڵەکەی، بێ کەیبانوویی پێوە دیاربوو. جگەرە و تەنیایی، تەنگیان پێ هەڵچنیبوو، وەک دوو دوژمنی سەرسەخت، یەخەی مامۆستایان گرتبوو. تەمەن و نەخۆشیش، زۆریان بۆ دەهێنا و زوو زوو، بەجێیدەهێشتم و سەری « تەوالێت »ی دەدا. هێندێ جاریش، لە شوێنی خۆی بەرزدەبۆوە و چاوێکی، بە پەرتووکەکانی نێو دۆڵابەکەیدا دەخشاند و گوێچکەی « نامەیە، دەکۆمێنتێ یا پەرتووک »ێکی دەگرت و بۆ بەڵگەی قسەکانی، پیشانیدەدام. بەو شێوەیە، من بە پرسیار دامگرتبۆوە، مامۆستاش، بە دەم وەڵامدانەوەوە گیریخواردبوو، بەردەوام بیریدەکردەوە، قسەیدەکرد و جارجاریش دەیبڕی. هێندێ جار، زۆرم بۆ دەهێنا و پرسیاری قورسم لێ دەکرد، ئەویش، توڕەدەبوو، دەیقیژاند و دەیگوت: نازانم، تۆ چیت لە من دەوێ؟ ئەم پرسیارانە بۆ دەکەی؟ دەتەوێ، لەوە زیاتر چی بزانی؟ منیش، هێورمدەکردەوە و بەردەوامدەبووین. لە ناکاویش دەیگوت: باشە، ڕیکۆردەرەکە بکوژێنەرەوە، با شتێکی تایبەتیت بۆ بگێڕمەوە. بەو شێوەیە، تەنگمان بە کات هەڵچنی، تا ئاوڕماندایەوە، لە یەکی پاش نیوەڕۆمان تێپەڕاند. ئینجا، مامۆستا هاواری لێ هەستا و گوتی: ماندووبووم، ئیدی بەسە، کاتی نانخواردنە و برسیمە.

وەک « نەبیل »، لە پشت دەرگەکەوە، خۆی ماتدابێ و گوێی، لە دەنگ و بێزاریی مامۆستا بووبێ، یەکسەر، بە سێ مەنجەڵ چێشتەوە، خۆی کرد بە ژووردا. ئیدی، مامۆستا بوژایەوە. نانمانخوارد و پاشان، کۆمەڵێ دەکۆمێنتی دیکەی، بۆ هێنام و گوتی: من دەنووم، تۆ دەتوانی، لەم ماوەیەدا، خۆت بەم شتانەوە خەریککەی، تا، باشتر لە شتەکان بگەی. نامە و دەکومێنتەکان، زۆر بوون، هێندێکم لێ خوێندنەوە، بەڵام، جگە لەوەی، شەو باش نەنووستبووم و

ماندووشبووم، هەر کەسێکی دیکەش، لە جێی من بووایە، دوای ئەو خواردنە چەور و نەرم و گەرم و برنجە بەللەزەت و شلە خۆش و پڕ لە گۆشت و ڕانە قەلە گەورانە، سەرخەوێکی بۆ دەشکاند! بۆیە، یەکسەر لە سەر قەنەفە کۆنەکەی ژووری میوان ڕاکشام و نووستم.
دوای ماوەیە، بە دەم خەوەوە، گوێم لێ بوو، مامۆستا، بە کۆکەکۆک هەستا و بەرەو « توالێت » کشا، منیشی بە تەواویی، بە ئاگاهێنایەوە. سەیری کاتژمێرم کرد، چواری ئێوارە بوو. ئیدی، دەموچاومان شت و دیسانەوە، دەسمانپێکردەوە. لە پڕ، هاواری لێ هەستا و گوتی: کوا تەزبیحەکەم؟ منیش، خێرا بۆم دەرهێنا و دامەوە دەسی، تا، لە سەر قسە و باسەکەی خۆی بەردەوامبێ. بەڵام، بە هەمان شێوە و خێراخێرا، یەک لە دوای یەک، دەنکەکانی دەخولاندەوە و هێندەی بلێی یەک و دوو، سووڕێکی تەواودەکرد.
منیش، زۆرم بۆ هات، جارێکی دیکەش، لێم شاردەوە. ئیدی، بیریچووەوە و داوای نەکردەوە. ماوەی دوو کاژێر، کارمانکرد، لە ناکاو، هاوڕێکانی لە دەرگەیان دا و مامۆستا، منی بەجێهێشت. ئەوان وەک دوێنێ شەو، یاری کاغەزی خۆیان دامەزراندەوە، منیش، بە تەنیا مامەوە و خەریکی خوێندنەوەی گوتار و هێندێ شتی دیکە بووم. بەو شێوەیە، شەومان درەنگکرد، دیسانەوە، لەگەڵ « نەبیل »دا گەڕاینەوە بۆ ماڵی خۆیان.
ڕۆژی یەکشەممە، لە هەمان کات و بە هەمان شێوە، لە سەر کارەکەمان بەردەوامبووین. تا نانی نیوەڕۆ، تەقەمان لە دوا پرسیار و وەڵام هەستان و دەمەتەقێکەمان تەواوکرد. پاشان، چەن وێنەیەکمان، بۆ یادگار پێکەوە گرت.
دوای ئەوەی، دوو شەو و دوو ڕۆژ پێکەوە بووین و « 25 » کاژێری پڕ لە فەڕ و خۆشمان پێکەوە بەسەربرد، ماڵاواییم لە مامۆستا کرد و لێک جیابووینەوە.
پاش نیوەڕۆی هەمان ڕۆژیش گەڕامەوە.
مامۆستا « جەرجیس فەتحوڵڵا »، وەک کەڵەنووسەرێکی ناسراوی « عێراق »، گەلێ « گوتار، نامیلکە و پەرتووک »ی بەنرخی نووسیوە و گەلێ شتی گرنگیشی، لە زمانەکانی « فرەنسیی و ئینگلیزیی »یەوە وەرگێڕاوە. تا ئێستە، یازدە بەرهەمی خۆی، بە زمانی « عەرەبیی » بڵاوکردۆتەوە، پازدە پەرتووکی وەرگێڕاوە و هەشت دەسنووسی وەرگێڕاوی دیکەشی، بۆ چاپ ئامادەکردووە، هێندێ لە بەرهەمەکانیشی، چەن جارێ چاپ کراونەتەوە. شتێکی ئاشکرایە، مامۆستا « جەرجیس »، نەک هەر لای خوێنەوار و ڕووناکبیرانی، ڕۆڵەکانی

هەر دوو گەلی « کورد و عەرەب »ی « عێراق » ناسراوە، بەڵکوو، لە سەرانسەری هەموو وولاتانی « عەرەب، تورکیا، ئێران » و لای هێندێ، نووسەرانی وولاتانی دیکەی جیهانیش، ناو و ناوبانگی خۆی هەیە. لەبەر ئەوە، لێرەدا بە هیچ شێوەیە، بە پێویستی نازانم، بە خوێنەوارانی کوردی بناسێنم و بە شانوبازوویدا هەڵدەم. تەنیا، شتێ هەیە، وەک کوردێ دەمەوێ، دان بەو ڕاژە گەورەیەی مامۆستادا بنێم، لە کانگای هەستێکی خاوێنی بێ گەردەوە، بیروڕای تایبەتیی خۆمی بۆ دەربڕم و پڕ بە دڵ، سوپاسی هەوڵی بێ پایانی بکەم.
لە ڕاستییدا، هێشتا بە تەواویی، بۆم ڕوون نەبۆتەوە، مامۆستا لە بنەڕەتدا، خۆی بە ڕۆڵەی کام نەتەوە دەزانێ. هەر چەندە، لەو بارەیەوە لە خۆشیم پرسی، بەڵام، حەزی نەکرد، بۆم ڕوونکاتەوە. تەنیا، هەر هێندەی گوت: من « عەرەب » نیم. جا، گەر مامۆستا خۆی، بە کورد دابنێ، ئەوا پڕ بە دڵ، پیرۆزبایی لێ دەکەم و بە قەدەر بارتەقای دوورایی ئاسمان، شانازیی پێوە دەکەم. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، مامۆستا، لە گەلێ کایەدا، سوارچاکانە و ئازایانە و مەردانە، ئەسپی دڵسۆزیی خۆی لێ تاوداوە، کورد بێ، یا، کورد نەبێ، هیچ لە باسەکەمان ناگۆڕێ، چونکە، گەلێ زیاتر، لە زۆربەی «ڕووناکبیران، نووسەران و تێکۆشەران »ی نەتەوەکەمان، ڕاژەی کورد و کوردستانی کردووە و بەو تەمەنەشەوە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک، لە سەر ئەو کارە پیرۆزەی خۆی، هەر بەردەوامە. لە « وەرگێڕان، نووسین و ناساندنی گەل »ەکەشمان، بە گەلانی ناوچەکە درێغی نەکردووە. تا توانیویێتی، گەلی کوردی، بە گەلانی جیهان ناساندووە، لە کۆڕی « خەباتی ڕامیاریی، شۆڕشی چەکداریی و هەوڵی دیپلۆماسیی »شدا، دەسڕەنگینبووە و شوێنپەنجەی دیارە. بە سەدان ڕۆڵەی، بۆ گەلی کورد و کادێری ڕامیاریی بۆ « پارتیی » پێگەیاندووە. تا دوارۆژە ڕەشەکانی شۆڕشی «11/سێپتێمبەر»یش، لە نزیکەوە، لە شۆڕشی کورددا بەشداریکردووە و دراوسێیەکی نزیک و هاوڕێیەکی گیانیبەگیانی بە ئەمەکی « بارزانیی » بووە.
ئەو پیاوە، ئەو هەموو ڕاژە گەورەیەی کردووە، کەچیی، سەرەڕای هەموو ئەمانەش، تا ئێستە بە تەواویی، مافی خۆی نەدراوەتێ. بۆ نموونە: لە کاتی چاوپێکەوتنەکەدا، زۆر بێزاریی خۆی، بەرانبەر بە سەرانی « پارتیی » دەردەبڕی، گلەییەکی زۆری لێ دەکردن و دەیگوت: ڕۆژنامەی « خەبات »ی

ئۆرگانی نێوەندیی» پارتی دیمۆکراتی کوردستان ـ عێراق » لە ژمارە «680»ی ڕۆژی « 1993/6/23 »دا، لە ژێر ناونیشانی « سکت دهرا فنطق کفرا »، گوتارێکیان بڵاوکردۆتەوە، بە شێوەیەکی زۆر ناشیرین، لە سەریان نووسیوم و گەلێ سوکایەتییان پێ کردووم.
بە ڕاستیی، سەیرم لێ دێ، لە کاتێکدا، « بارزانیی » هێندە ڕێزی لێ گرتبێ و خۆشیویستبێ، ئێستەش، بەو چەشنە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێ! با لێرەدا، شتێ باسکەم. لە ڕۆژی « 1993/12/3 »دا، مامۆستا « جەرجیس »، بە نامەیەکی دوازدە لاپەڕەیی، وازی لە دەزگــــەی سەرکردایەتیی ڕێکخراوی « ئەلمەجلس ئەلعراق ئەلوحر » هێناوە. لە خاڵی پێنجی لاپەڕە دەدا، باسی نامەیەکی « بارزانیی » کردووە، کە پێش بیستوشەش ساڵ لەمەوبەر، بۆی ناردووە، لەوێدا « بارزانیی » نووسیوێتی:
« ... اعلم جیدا ایها الاخ انک لست من الذین تهمهم المناصب و الالقاب و ان منزلتک عندنا و عند الامه الکردیه کبیره و لا تخفی ... » بە کوردییەکەی :
« ... براکەم! باش دەزانم، تۆ لەو کەسانە نیت، پلەوپایە و نازناو بە لاتەوە گرنگبێ، تۆ لای ئێمە و لای نەتەوەی کورد، جێگەیەکی گەورەت هەیە و ناشاردرێتەوە ... » هەروەها، لەو نامەیەی « مەسعوود بارزانیی »ش بۆی ناردووە، دەسی ڕێزی لێ نراوە. کەچیی، لە ڕۆژنامەی « خەبات »دا، بەو شێوەیە پەلاماریانداوە! تۆ بڵێی، دوای ئەو هەموو « خەبات، ڕاونان، گرتن، ئازاردان، چەرمەسەریی، دەربەدەریی و ڕاژە گەورەیە »، شایانی ئەوەبێ، بەو شێوە ڕەقە، لەگەڵیدا بدوێن و سوکایەتیی پێ بکەن، بە مەرجێ، ئەو پیاوە تا ئێستەش، داوای پاداشتی لە کەس نەکردووە، لەو بڕوایەشدام، تازە، تا لە ژیاندا مابێ، ناشیکا؟!!
ئەز پێموایە، مامۆستا، بۆ تاهەتایە، لە دڵە گەورەکەی نەتەوەی کورددا دەژی، پلەوپایەیەکی کۆمەڵایەتیی و ڕێزێکی تایبەتیی، لای هەموو « خوێنەوار، ڕووناکبیر و نیشتمانپەروەر »ێکی دڵسۆزی کورد هەیە. ئەو پلەوپایە و ڕێزەشی، لە لایەن کەس و هیچ لایەکەوە، بە خۆڕایی و بە دیاریی، پێ نەبەخشراوە، بەڵکوو، بە « ژیان، گیان، ماندووبوون و خەباتی بێ پسانەوە »ی خۆی بەدەسیهێناوە.
با لێرەدا، لەو بارەیەوە، لەوە زیاتری لە سەر نەڕۆین، چونکە، مامۆستا، لە کاتی وتووێژەکەدا، پەنجە بۆ هەموو ئەو شتانە ڕادەکێشێ. بەڵام لێرەدا، بەم

کۆپلەیەی مامۆستا، لە هەمان شوێندا بۆ ڕێکخراوی ناوبراوی نووسیوە و بە دەمیش بۆی گێڕامەوە، کۆتایی بەم باسە دێمن. مامۆستا گوتی: سالی «1990»، لە شاری « ستۆکهۆلم » لە مالی « حەمە سابیر »، چاوم بە مامۆستا « جەلال تالەبانیی » کەوت، دانیشتنێ بوو، زیاد لە بیست کەسی لێ بوو. وەک « هۆمەری شێخمووس و نەبیلی نووریی مەتیی ... »
« حەمە سابیر »، ڕووی تێکردم و گوتی: مامۆستا « جەرجیس »، مولکی خۆمانە. ئەو « تالەبانیی »یەی، هەمیشە ڕەخنەی توندم لێ گرتووە، یەکسەر وەلامیدایەوە و گوتی: « اخطات فهو ملک للشعب الکردی و لیس صحیحا ان یدعیه ای حزب لنفسه » واتا: « بە هەلەدا چووی، مامۆستا مولکی گەلی کوردە، کارێکی ڕاست نییە، گەر هەر پارتێ، بە هی خۆی دانێ. »
بۆیە، منیش لەو بڕوایەدام، مامۆستا « جەرجیس »، بە ڕاستیی، مولکی هەموو نەتەوەی کوردە. نووسینەکانیشی، جەرگی تاریکی شەوەزەنگی، ڕێی خەباتی بەردەم، ڕۆلەکانی ئەوڕۆی کورد شەقدەکا و بەر پێی نەوەکانی داهاتووشمان، ڕۆشندەکاتەوە، گەر چی، هێندێ کەس وەک دز بیانەوێ، خاوەن مال بگرن، یا، هێندێ دەنگی ناسازیش، لێرە و لەوێ بەرزبێتەوە و دژایەتییبکەن، هیچ لە باسەکە ناگۆڕێ. چونکە، مامۆستا بۆ کورد زێڕە و قەدری زێریش، لای زێڕینگەرە!
خوێنەوارانی هێژا، لە کۆتایی ئەم پێشەکییەدا دەمەوێ، هێندێ شت، دەربارەی چاوپێکەوتنەکە ڕوونکەمەوە. وا بزانم، ئەمە یەکەم کار و بەرهەمی مامۆستایە، بە زمانی کوردیی بلاودەکرێتەوە. ئەم وتووێژە، لە سەر چوار کاسێتی نەوەد خولکەیی، بە زمانی « عەرەبیی » تۆمارکراوە. ئەز، ووشە بە ووشە، لە بەر ڕیکۆردەرەکە، گوێم لێ گرتووە و لە ماوەی پێنج ڕۆژدا، وەک خۆی و بێ دەسکاریی، بە « عەرەبیی » نووسیومەتەوە. ڕۆژی هەشت کاژێر، بە بەردەوامیی، کارم لە سەر کردووە. هەر شتێکیش، تێ نەگەیشتبم، جارێکی دیکە، بە تێلێفۆن لە مامۆستام پرسیوە و ئەویش، بۆی ڕوون کردوومەتەوە. هەر پرسیارێکی دیکەشم، بە بیردا هاتبێ، بە نامە، ئاراستەم کردووە و ئەویش، وەلامیداومەتەوە. پاشان، هەموویم ڕێککردووە و ئەوانەی دووبارەبووبوونەوە، قرتاندوومن. ئینجا، نووسینەکەم کردووە بە « کوردیی »، پوختەمکردووە، بە شێوەیەکی جوان، بە زمانێکی بێ گرێوگۆل و ساکار دامڕشتووە. ئەوا لێرەدا، دەقی ئەم چاوپێکەوتنە بلاودەکەمەوە، مامۆستا هەر

چی گوتووە، بێ ئەوەی دەسکاریی کرابێ، یا، گۆڕانێکی بەسەرداهاتبێ، یا، لێی پەڕێندرابێ، تۆمارمکردووە. حەزمکردووە، لەگەڵ ماموستادا، چۆن دواوین، هەر بەو شێوەیەش بلاویکەمەوە، تا ناوەڕۆکی بیروڕاکانی، وەک خۆی بمێنێتەوە و نووسینەکەش، بە زیندوویی، لەم پەرتووکە خنجیلانە قەشەنگەدا، پێشکەش بە ئێوەی ئازیز بکەم.
لێرەدا دەمەوێ، ئەوەش بڵێم، ئەم بەرهەمە، تەنیا چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەگەریی ڕووت نییە. بەڵکوو، لە هەمان کاتیشدا، دەمەتەقێیەکە، لە نێوان من و ماموستادا ئەنجامدراوە. لە زۆر شوێنیشدا، پرسیارەکانم، شێوەی ڕوونکردنەوە، بە خۆیەوە وەردەگرێ، تا بە تەواویی، کێشە و باسەکان تاووتوێکەین، بە قووڵیی لێیان بکۆڵینەوە و گرێی نهێنییەکانیش، پتر بشلەقێنین.
جگە لەمانەش، دەمەوێ، دوو شتی دیکە باسکەم. یەکەمیان: هێندێ جار، ماموستا لە قسەکانیدا، پەنجە بۆ سیمینارەکەی ڕادەکێشێ، دیارە، مەبەسی ئەو سیمینارەیە، کە لە سەرەتای ئەم پێشەکییەدا باسمکردووە. دووەم: هەر چی لە دووتوێی ئەم پەرتووکە دایە، بیروڕای تایبەتیی ماموستا خۆیەتی، مەرج نییە، من لەگەڵ هەموو بیروڕاکانیدا یەکبگرمەوە.
لێرەدا، ماموستا بۆ یەکەم جار، هێندێ زانیاریی، دەربارەی « بارزانیی »، ئەندامانی پەلیتبیرۆی « پارتیی » و دەنگوباسی نەبیسراوی شۆڕشی «11/سێپتێمبەر » دەدرکێنێ. وەک سیناریۆیەک، مێژوویەکی کوورتی « ژیان، تێکۆشان، خەسڵەت، کەسایەتیی و باری سایکۆلۆژیی سەرانی پارت » پیشان دەدا. وەک قوتابخانەیەکی ڕامیاریی، لە خەسڵەتەکانی « پارتی دیمۆکراتی کوردستان ـ عێراق » دەدوێ. لە لایەکەوە، باسی نەبوونی دیمۆکراسیی و ئازادیی ڕادەربڕین، لە نێو شۆڕش و « پارتیی »دا دەکا، بە شێوەیە، ئەو نەبوونی دیمۆکراسیی و ئازادییە، کەشێکی وای، لە نێوان « بارزانیی » و ئەندامانی سەرکردایەتی « پارتیی »دا خولقاندبوو، زۆربەی زۆری، ئەو هەڤاڵانەی سەرکردایەتی پارت، لە نێوخۆ و لەگەڵ یەکدیدا، « هەلپەرست، دووڕوو، ناکۆک و ناپاک » بن، لە پێناوی « پلەوپایە، دەسەڵات، بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان و خۆنزیکردنەوە لە « بارزانیی »، چاڵ بۆ یەکدی هەڵەکەنن، تەپکە و فاقە بۆ یەکدی دانێن، بیر لە بەرژەوەندیی باڵای « پارت، شۆڕش و گەل »ەکەمان نەکەوە، بۆیە، « بارزانیی »ش باوەڕی بە هیچیان نەبوو!

له لایەکی دیکەشەوە، ئەو تەونە جاڵجاڵۆکانەیەی، دەزگە سیخوڕییەکانی «C.I.A.»ی « ئەمێریکا » و « ساواک »ی « ئێران »، بە چواردەوری شۆڕشەکەماندا تەنیبوویان، مەگەر، هەر لە وتووێژێکی وادا، ڕوونبێتەوە. پیاوەکانی « ئەمێریکا »، لە ڕێی « شا »ی « ئێران، ئیسرایل، سادات، کەمیل شەمعون » و هێندێ، لە کاربەدەسانی شۆڕشی کوردەوە، وەک تۆڕێکی یەکجار گەورە، سەرە داوی پێوەندییەکانیان، لە ناوچەکەدا توندوتۆڵ گرێ دابوو، بەرژەوەندییەکانی گەلی باشووری کوردستانیشیا ن ژێر پێ نابوو!

جا، ئێستەش فەرموون، با هەموو پێکەوە، ئاورێ لە ڕابووردوی خەباتی خۆمان و گەلەکامان بدەینەوە، تا بزانین، چەندین ساڵە، چۆن لە گوێی گادا نووستووین، ئاسنی سارد دەکوتین و لە بازنەیەکی بۆشدا دەخولێینەوە!

هیوادارم، توانیبێتمان، تێشکێکمان ئاراستەی، هەموو ئەو ناکۆکیی و دووبەرەکییانە کردبێ، کە لە سەرەتای دەسپێکردنی شۆڕش و لە ناوەڕاستی شەستەکاندا، لە نێوان « بارزانیی » و باڵەکەی « پەلیتبیرۆ » و ڕیزەکانی گەلی کورددا ڕویانداوە. مەبەسیشمان، تەنیا ڕاژەکردنە و دەمانەوێ، ڕاستییەکان بۆ جەماوەری گەلەکەمان ڕوونکەینەوە، گرێکوێرەی دوخێنی کەموکوڕیی و نهێنییەکانی شۆڕشی کورد بکەینەوە، مەتەڵی ڕاستەقینەی ناکۆکییەکانی نێوان « بارزانیی » و سەرکردەکانی « پارت » هەڵێنین. بۆ ئەوەی، جارێکی دیکە، کارەساتی نەتەوەیی لەو بابەتانە، ڕوو نەدەنەوە و ڕێگەی « تەبایی، یەکێتیی و برایەتیی »، ڕیزەکانی گەلەکەشمان پتەوتربێ. لەو باوەڕەشدام، هەرگیز، هەموو ڕاستییەکان دەر ناکەون، تا، هەر دوو لای شەڕکەر، دان بە هەموو تاوانەکانیاندا نەنێن و دەکۆمێنتەکان بڵاو نەکەنەوە.

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز
ستۆکهۆڵم
1997 .07. 07

پ1 : دەربارەی ژیانی تایبەتیی خۆتان و بەرهەمەکانتان، چی بۆ خوێنەوارانی کورد باسدەکەن؟

و1 : لە ڕاستییدا، کاتێ دەربارەی ژیانی خۆم و کارە وێژەییەکانم، پرسیارم لێ دەکەن، هەمیشە تەنگەدەمگرێ، چونکە دەبێ، باسی خۆم بکەم. منیش لەو شتانەوە دوورم. هەروەها، لەو بڕوایەشدام، لە ڕێی ئەو شتانەی دەیاننووسم و خوێنەران دەیانخوێننەوە، خەڵکی دەمناسن. بەڵام، هێندێ جار ناچاردەبم، ئەو کارەبکەم. لەبەرئەوەی، هێندێ لە خاوەن چاپخانەکان دێن بۆ لام و داوام لێ دەکەن، کوورتەیەکی ژیانی خۆمیان بۆ بنووسم، تا، لە سەر بەرگی یەکێ، لەو پەرتووکانەی بڵاویدەکەنەوە، بینووسن. وەک لەم دواییانەدا، شتێ ڕوویدا، تا ئێستەش، شەرمم بە خۆم دێ. لە پەرتووکی « اراء محظورە » دا، پێش ئەوەی چاپکرێ، خاوەنی چاپخانەکە هات بۆ لام و گوتی: هێندێ کەس، هیچ لە بارەی تۆوە نازانن، ئاگایان لە پێوەندییەکانت، بە بزووتنەوەی کوردایەتییەوە نییە، پێویستە لەم ڕووەوە، خۆت بە خەڵکی بناسێنی، چونکە، خەڵک بە تایبەتیی نەوەی نوێ، لە پێوەندیی تۆ بە شۆڕشەوە بە گومانن. ئیدی بێ ئەوەی پرس بە من بکا، چەند وێنەیەکی دیاریکراوی دەسکەوتووە، چۆن لەگەڵ مەبەسەکەی خۆیدا گونجاوە، لە پەرتووکی ناوبراودا بڵاویکردۆتەوە. لە ڕاستییدا، من هیچ وێنەیە لەو وێنانەم، لە ئەلبوومەکەی خۆم نەداوەتێ و تا دوا ساتیش، ڕەتمکردۆتەوە. بەڵام، خاوەن چاپخانەکان، بۆ دەسکەوتی تایبەتیی خۆیان، مافی ئەوەیان هەیە، چەن وێنەیان بۆ پەرتووکەکانیان بوێ، بیگرن. لەبەرئەوە، من قسە دەربارەی خۆم ناکەم. بەڵام دەتوانم، کوورتەیەکی دیاریکراوت، لەو بارەیەوە بدەمێ.

ـ گەر بفەرمووی، ساڵی لەدایکبوون و جێگە و ڕووداوە گرنگەکانی ژیانت، بۆ خوێنەواران ڕوونکەیتەوە.

من لە ڕۆژی «1923/8/14»، لە شاری « مووسڵ » لەدایکبووم. دایکم، هەشت منداڵی بووە. پێنجیان کچ و سیانەکەی دیکەیان کوڕ بوون. دووانیان مردوون. واتە: خێزانەکەمان ئێستە، لە سێ خوشک و سێ برا پێکهاتووە.

تەمەنم پێنج ساڵ و چەن مانگێ بوو، کاتێ لە خوێندنگە وەرگیرام. دایکم، هەمیشە باسی ئەو چیرۆکەی بۆ دەکردم، تا، لە بیرم نەچێتەوە. لەو سەردەمەدا، بەپێی یاسا، منداڵ لە تەمەنی حەوت ساڵیدا، لە پۆلی یەکی سەرەتایی وەردەگیرا. منیش، هێشتا شەش ساڵم پڕ نەکردبۆوە، هەر پێنج

ساڵ و نیو دەبووم. دایکم، پەلیگرتم و بردمی بۆ خوێندنگەکەی نزیک خۆمان. وەک دایکم بۆی گێڕامەوە، بەڕێوەبەری خوێندنگەکە پێدەکەنێ و دەڵێ: تۆ ئەمەت بۆ لەگەڵ خۆت هێناوە؟ دایکیشم پێی دەڵێ: « جەرجیس » بەم ڕۆژگارە، لە ماڵەوە هەر خەریکە، دەستکاریی ئەم پەرتووک و ئەو پەرتووک دەکا، پێنووس دەفڕێنێ و دەیەوێ، شت بنووسێ. منیش، بیرمکردەوە و لە دڵی خۆمدا گوتم: باشترین ڕێ ئەوەیە، بیبەم بۆ خوێندنگە.
لەو کاتەدا، سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی « عێراق » بوو. خەڵک، بە شێوەیەکی فەرمیی نەیاندەتوانی، تەمەنی خۆیان بە تەواویی دیاریکەن. کەم کەس دەیزانی، لە چ ساڵێکدا لەدایکبووە. لەبەرئەوە، هەموو کەسێ، مافی ئەوەی هەبوو، سەر لە دادگەی « سوڵح » بدا و لە ماوەی « 25 ـ 26 » ساڵدا، تەمەنی خۆی دیاریکا. بۆیە، خۆگەورەکردن، یا، خۆبچووککردنەوە، بۆ هەمووان کارێکی ئاسانبوو. ئێمەش، کەڵکمان لەو یاسایە وەرگرت، دوو ساڵ گەورەیانکردم و لە خوێندنە وەرگیرام.
ـ دیارە، چانستان هەبووە!
نازانم..
ـ کەی کۆلێژی مافناسیتان تەواوکرد؟
ساڵی « 1944 » .
ـ ئەدی دوکتۆرا؟
دوکتۆرام وەرنەگرتووە.
ـ بەڵام، هێندێ جار گوێم لێ دەبێ، دەڵێن: دوکتۆر « جەرجیس » ؟
بەڵێ. ڕاستدەکەی، ئەوە هەڵەیە و من هەمیشە، لەو شتانە ڕادەکەم. بەڵام، لە ڕاستییدا، لە ساڵی « 1945 » دا، من هاوکاریم، لەگەڵ هێندێ توێژەرەوەدا دەکرد، تا، بڕوانامەی دوکتۆرا، لە زانکۆی « ئەمێریکا » وەرگرم. کاتێ، لە زانکۆی « ئەمێریکا »ش بووم، هەموو ئەو مامۆستایانەی دەمناسین، لەوانە دوکتۆر « یوسف ئیبش »، مامۆستای مێژوو بوو، خۆی کورد بوو، لە بنەماڵەی « عەبدولڕەحمان »ی بە ناوبانگبوو. لە سەردەمی « عوسمانیی » یەکاندا میری « حەج » بووە.
ـ خەڵکی کام بەشی « کوردستان » بوو؟
« سووریا » . دوکتۆر « یوسف » و هێندێکی دیکەش، ئەو کەسانەی، کاریان لە بڕوانامەی دوکتۆرادا دەکرد، بە تایبەتیی، گەر لە ڕووی ڕامیارییەوە،

تەرخانی تایبەتییان، پێوەندیی بە کاروبـــاری « ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست » و « عێراق »ەوە هەبووایە، هەمیشـە، ڕەوانەی لای منیان دەکردن. من دوکتۆر نیم، وەک دەڵێن: بڕوانامەکەم « لا ئیلاهە ئیلە ئەڵڵا »یە.
ـ مامۆستا، لە چ ساڵێکدا دەستان بە نووسین کرد؟
نووسین! ئەوە گرفتێکی گەورەیە. من لە پۆلی سێی ئامادەیی بووم، دەسم بە نووسین و بڵاوکردنەوە کردووە.
ـ گوتارت دەنووسی؟
بەڵێ. گوتار و چامەی پچووکم دەنووسی. بەڵام، ئەو کەسەی، کارێکی زۆر قووڵی، لە ژیانی وێژەیی و زانستییم کرد، نووسەری بە ناوبانگ و هۆنەری گەورە و باشترین وەرگێری چوارینەکانی « عومەر خەیام »، مامۆستا «عەبدولحەق فازیل » بوو.
ـ خەڵکی « عێراق » بوو؟
بەڵێ. « عێراق »ی بوو. پارێزەربوو، لە « مووسڵ »، گۆڤاری « ئەلمجەلە »ی دەردەکرد.
ـ ساڵی چەند؟
لە ساڵی « 1938 » دا.
ـ کەواتە دەتوانین، ئەو ساڵە، بە سەرەتای ژیانی وێژەییتان دانێین؟
پێشتر، لە ڕۆژنامەکاندا شتم بڵاودەکردەوە. هەرچەندە، ئەو گۆڤـــارە، لە « مووسڵ » دەردەچوو. بەڵام، گۆڤارێکی گەورەبوو، لەو سەردەمەدا، باشترین گۆڤاربوو. نووسەرێکی زۆر، لەوانەی لە دواییدا ناوبانگیاندەرکرد، لە « بەغدا » و « نەجەف » و گەلێ جێی دیکەوە، تێیاندا دەنووسی، وەک چیرۆکنووسی ناسراو « زەنون ئەیوب ». دۆستایەتیمان، لەو کاتانەی گۆڤارەکەوە، دەسی پێ کرد. « جەعفەر ئەلخەلیلی »، ئەویش لە « نەجەف »ەوە شتی بڵاودەکردەوە. مامۆستای گەورە « مەجید قەدوریی »، ئێستە لە زانکۆی « بۆستن » کاردەکا، خاوەنی پەرتووکی « ئەلعێراق ئەلمستەقیل و ئەلجمهوریە ئەلعراقیە »یە و یەکێکە، لە نووسەرە گەورەکان. لە ڕاستییدا، من لە زۆر ڕووی « وێژەیی و مەڕاڵیی »یەوە، سوودم لێ وەرگرت. « عەبدولحەق »، ئاسۆیەکی گەورە و فراوانی، لە پێش چاومدا کردەوە. بەڵام، پێش ئەوە، ئەو کەسەی هانیدەدام، بخوێنمەوە، مامۆستا « گۆرگیس عەواد » بوو، ئەندامی دەزگەی کۆڕی ئەکادیمیای « عێراق » بوو. چوار ساڵ لەمەوبەر کۆچیدواییکرد. تا ئێستەش

بیرمه، له پۆلی پێنجی سەرەتایی بووم، مامۆستای زمانی « عەرەبیی »مان بوو. پەرتووکێکی پچکۆلانەی بە سەردا دابەشکردین، نرخەکەی دە فلس بوو، ناوی « رحیله ئیلا ئەلقەمەر » بوو. نووسەری بەناوبانگ « جول ڤێرنی » نووسیبووی. دواییش، کاتێ فێری زمانی « فرەنسیی » بووم، لە ساڵی «1933 »دا، جارێکی دیکە خوێندمەوە. ئەو مامۆستایە، زۆر ئاگاداریی‌دەکردم، لە پەخشاندا، پلەی تەواویی بۆ دادەنام. بەڵێ، ئەو دوو کەسە، زۆر کاریان تێکردم.

– یەکەم پەرتووکتان وەرگێڕان بوو، یا دانان بوو؟

یەکەم پەرتووکم، وەرگێڕان بوو. ناوی چی بوو؟ لە بیرم چۆوە. لە ساڵی «1946 » دا، من یەکێ بووم لەوانەی، پارتی « ئەلشەعب »مان دامەزراند.

– جارێ، با واز لە پارتی « ئەلشەعب » بێنین، دوایی لەو باسەش دەدوێین.

داوایان لێ کردم، پەرتووکەکەی « ای. جی. کامبڵ » وەرگێڕم. ناوی « ئەلئوسوڵ ئەلتەئریخیە لیحەرکە ئەلعومال ئەلعالەمیە » بوو. وەرمگێڕا، بەڵام ناوی منی، لە سەر نەبوو.

– لە زمانی « ئینگلیزیی »یەوە وەرتانگێڕا؟

بەڵێ. ئەوە یەکەم کارم بوو. پاشان، نزیکەی چوار ساڵ، بە سەر ئەوەدا تێپەڕی، دوای ئەوەی، ماوەی شەش ساڵیش، کاری پارێزەرییم دەکرد، ڕۆژنامەیەکی هەفتانەی نێوخۆییم دەرکرد و هەر خۆشم، سەرنووسەری بووم. لەوە بە دوا، چەندین پەرتووکم، لە زمانەکانی « فرەنسیی و ئینگلیزیی »یەوە وەرگێڕا و پاشان بڵاوکرانەوە. گەر ناوەکانیانت دەوێ، هەیە.

– وا بزانم، ناوی پەرتووکە دانراوەکان و وەرگێڕاوەکان، لە سەرچاوەکاندا هەن، گەر پێویستمبوو، لەوێ وەریاندەگرم. بەڵام، ئایا دەتوانن، تەنیا، ناوی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەمان بۆ ببژێرن، کە بەڕێزتان دەرتانکردووە؟

بەڵێ. گۆڤاری « ئەلمجەله »، لە ساڵی « 1938 »، تا ساڵی « 1943 »، گوتارم تێدا بڵاودەکردەوە.

دوای ئەوەی گوێزرایەوە بۆ « بەغدا »، کۆمۆنیستەکان دەسیانبەسەرداگرت و چەن کەسێکی وەک « داود سایغ و یوسف سەلمان و عەبدوڵلا ئەلمەسعوود » تێیاندا دەنووسی. ئەمانەش، لە سەرکردەکانی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » بوون.

– ئایا، بەڕێزتان ڕۆژێ لە ڕۆژان، کۆمۆنیست بوون؟

نەخێر، هەرگیز کۆمۆنیست نەبووم. بەڵام، زۆر لە کۆمۆنیستەکان هاوڕێم بوون.
ـ دۆستایەتی باسێکی دیکەیە. ئەدی، گۆڤاری دووەم ناوی چی بوو؟
دوای ساڵی « 1950 »، دوو ڕۆژنامەی دیکە هەبوون، ناویان « ئەلڕەوافید و ئەلجەداویل » بوو. پاشتریش، لە ساڵەکانی « 1958 ـــــ1959 » دا، دوو ڕۆژنامەی تایبەتیی خۆم هەبوو، ناویان ڕۆژنامەی « ئەلڕائید و ئەلەحەقیقە » بوو. خۆم، بەرپرسیاری نووسین و خاوەنیان بووم. لە ساڵی « 1955 »دا، لە « میسر » نووسینم بڵاودەکردەوە.
ـ گوتار؟
بەڵێ. « ئەلکتاب »، گەورەترین و بەرزترین گۆڤاری « میسر » بوو. چەن نووسەرێکی وەک « عەبباس مەحمووود عەقاد، مەحموود تەیموور، ئەحمەد حەسەن زیاد » و هێندێکی دیکە تێیاندا دەنووسی. گوتارەکانی منیش، لەگەڵ ئەوانەی ئەواندا دەردەچوون. ناوەکەم، لە پاڵ ناوەکانی ئەواندا دەنووسرا. تا ئێستەش لە بیرمە، ئەوە یەکەم جاربوو، نرخی ئەو شتەی دەینووسم، وەری گرم. گوتاری یەکەمم، دەربارەی « تەحقیقات جنائیە جەدیدە » بوو. توێژینەوەیەکی یاسایی گرنگی، کەم وێنەبوو، لێکۆڵینەوەیەکی زۆر جوانبوو. تەنانەت، لە « ئوردون و سووریا »وە، دەربارەی ئەو بابەتە، چەن نامەیەکم بۆ هات. ئیدی، دوای ئەو گوتارە، ناوی من لە سەرەوە دەنووسرا. لەبەرئەوەی، هەمیشە گوتارەکان، بەگوێرەی ناو و ناوبانگی نووسەرەکە، بایەخیانپێدەدرا. تا ئێستەش، هەر لە بیرمە، ناوی خۆم و ناونیشانی گوتارەکەم، یەکسەر پێش چیرۆکەکەی « مەحموود تەیموور » و گوتارەکەی « ئەحمەد حەسەن زیاد » و لە دوای گوتارەکەی « عەبباس مەحموود عەقاد » ەوە نووسرابوو.
ـ ڕاستە دەڵێن: « عەقاد » کوردبوو؟
بەڵێ. کوردبوو. دواتر لە ساڵی « 1955 » بە دواوە، ئەو بەرهەمانەی وەرم گێڕابوون، لە دەرەوەی « عێراق » دەرکەوتن و بڵاوبوونەوە.
ـ مامۆستا ببوورە، من تەنیا، مەبەسم ناوهێنانی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەیە، کە بەشداریتان لە دەرکردنیاندا کردووە؟
تەنیا سیان بوون، گۆڤاری « ئەلمجەلە » و ڕۆژنامەی « ڕەوافید و جەداویل ».
ـ ئەدی ڕۆژنامەی « ئەلتەئەخی » ؟
من سەرنووسەری بووم.

ـ واتە: ڕۆژنامەی « ئەلتەئەخی »، دوا ڕۆژنامەیە بووە، کارتان تێدا کردووە؟
بەڵێ. دوا ڕۆژنامەبوو.
ـ ئەدی پێش ئەوە؟
پێش ئەوە، ڕۆژنامەی « ئەلحەقیقە ـ ڕاستیی » بوو. لە ساڵی « 1959 »دا، بە هەر دوو زمانی « عەرەبیی و کوردیی » دەردەچوو. سەرنووسەر و خاوەنەکەشی، هەر خۆم بووم. ئەو ڕۆژنامەیە، بۆ من، هۆی بەڵا و نەگبەتیی بوو. چونکە، لەو سەردەمەدا و لە شاری « مووسڵ » ، ڕۆژنامەیە، نیوەی بە زمانی « کوردیی » دەرچێ، ئەوە وەک، تاوانێکی گەورە وابوو. کاتێ، « بەعسیی »یەکان، لە « 1963 »دا هاتن، فرمانی خنکاندنیان بۆ دەرکردم. بە لای ئەوانەوە، گەورەترین تاوانی من ئەوەبوو، ئەو ڕۆژنامەیەم دەرکردبوو.

**پ2** : پێش ئەوەی، بچنە دەرەوە و تێکەڵاوی کاری شۆڕشگێڕیی بن، هیچ جۆرە پێوەندییەکی ڕامیارییتان هەبوو؟
**و2** : بەڵێ، لە « پارتیی »دا ئەندام بووم. بەڵام، پێش ئەوە، یەکێ لە دامەزرێنەرەکانی پارتی « ئەلشەعب » بووم. لە مانگی « ئەپرێلی/1946 »دا، لەگەڵ « عەزیز شەریف و عەبدولڕەحیم شەریف »دا، پارتی « ئەلشعب »مان دامەزراند. ناوی منیش، لە لاپەڕە بیستوشەشی بەشی شەشەم، لە پەرتووکی « تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعراقیە »دا هاتووە. بەڵام، تەنیا لە « مووسڵ »، جێی بڕوای « ئەلشەعب » بووم. دوای چوار مانگیش، وازم لێ هێنان.
ـ بۆچی وازتان لێ هێنان؟
لە بەر دوو هۆ :
یەکەم: ڕێبازێکی چەپی مارکسیی تێدا دروسبوو. ئێمە، نزیکەی لە دوو دەستە پێکهاتبووین. دەستەیەکی دێمۆکراسیخوازی لیبراڵی دامەزرێنەر و دەستەیەکی مارکسیی وەک « عەزیز، عەبدولڕەحیم و تۆفیق منیر ... تاد ».
دووەم: کاتێ پارتەکەمان دامەزراند، بیروباوەڕمان وابوو: پرۆگرامەکەمان، شتێکی دەربارەی، مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد و مافی کەمە نەتەوەییەکان تێدابێ. بەڵام، دوایی هەستمکرد، کاتێ، پرۆگرامەکەمان ڕێکوپێککرد و پێشکەش بە وەزارەی نێوخۆ کرا، ئەو شتەی تێدا نەبوو. دەتوانی، ئەوە لە پەرتووکی « تەئریخ ئەلوەزارات ئەلعراقیە »دا بخوێنیتەوە. لەبەرئەوە، بەرانبەر ئەو کێشەیە، شێوە گومان و نیمچە کاردانەوەیەکم، لا

دروسبوو. هەر کە بینیم، کەسایەتییە چەپەکان، بە سەر پارتەکەماندا زاڵ بوون و دەسیانبەسەرداگرت، ئیدی، من یەکسەر کشامەدواوە.
ـ چەپەکان، دژی مافەکانی گەلی کورد بوون؟
نەخێر. حوکوومەت دژبوو. دوایی تێگەیشتم، « عەزیز شەریف، عامر عەبدوڵلا، عەبدولڕەحمان و تۆفیق منیر »، کە هەموویان، لە دەستەی دامەزرێنەری « ئەلشەعب » بوون، لە ژێرەوە بە نهێنیی، کۆمۆنیست بوون. بەڵام، لەگەڵ « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »دا، ناکۆکیی و جیاوازییان، لە نێواندا دروس بووبوو، بۆیە، وازیانهێنابوو، دەیانویست، پارتێکی تایبەتیی دروسکەن.
ـ پارتی « ئەلشەعب »، ڕوویەکی دەرەوەی ئاشکرای پارتی کۆمۆنیست نەبوو؟
نەخێر. بە پێچەوانەوە.
ـ ئەدی چی بوون، خۆ ئەوانە، لە نێو پارتی « ئەلشەعب »دا نەچێندرابوون؟
نەخێر. لەو بابەتەش نەبوون.
بەڵام، لەو بارەیەوە، بیروڕای جیاواز هەیە. دوایی، کێشەکەمان بۆ ڕوونبۆوە، چییە و چی نییە. « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »، بە شێوەیەکی بەردەوام، هێرشی توندیی، دەکردە سەر « پارتی ئەلشەعب ». دەتوانین، بڵێین: وەک پێوەندیی نێوان، « چینی میللیی » و « یەکێتی سۆڤێت »ی کۆن وابوون، هەر دوو لایان، کۆمۆنیست بوون، بەڵام، هەر یەکەیان، قورقوڕاگەی ئەوی دیکەیانی گرتبوو.
ـ پێتان وا نییە، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکەی نێوانیان، لە سەر کێشەی ئایدۆلۆژیی و دەسەڵات بووبێ؟
نەخێر. کێشەی بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیی، لە گۆڕێدا نەبوو، بەڵکوو، هەمووی تەنیا، کێشەی نێو خۆیان و تاکەکەسیی بوو. لەبەر ئەوە، من وازمهێنا. بەڵام، تا سەر، لەگەڵ « عەزیز شەریف» دا، وەک دوو هاوڕێ ماینەوە و پارێزگاریی ئەو دۆستایەتییەم کرد.
ـ بیروڕای ئەندامە مارکسییەکانی، نێو پارتی « ئەلشەعب »، دەربارەی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد و کەمەنەتەوەییەکان چۆن بوو؟
دەربارەی بیروڕای، مارکسییەکانی ئەو سەردەمانە، دەتوانی، لە هەموو پەرتووکەکاندا بیانخوێنیتەوە، بە تایبەتیی، لە پەرتووکی « لیمازا تەبقا ئەلحەقایق مەکتوومە عەن ئەلشەعب ئەلکوردیی؟ »دا بە جوانیی باسکراوە.
ـ لێرەدا دەکرێ، بە کورتیی بۆمان باسکەن؟

بەڵێ. دوای ئەوەی، پێنج یا شەش ساڵ، بە سەر دامەزراندنی « پارتی دیموکراتی کوردستان »دا تێپەڕی، ئەو کاتە، کۆمۆنیستەکانی « عێراق »، بە نهێنیی کاریاندەکرد. هەڵوێستەکانی « پارتیی »یان دادەگرتەوە. لە ڕووی بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیاوە، هێرشێکی زۆریان دەکردە سەریان. ساڵی «1952»، کاتێ « بەهادین نووریی » هات و بوو بە سکرتێری گشتیی « پارتی کۆمۆنیست »، ئەم دید و بۆچوونەی کۆمۆنیستەکان، بە شێوەیەکی کتوپڕیی گۆڕا. لە هەمان ساڵدا، « باسم » کە ناوی نهێنیی « بەهادین نووریی » بوو، دانی بە وەدا نا، کورد نەتەوەیە و مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆی هەیە.
دوای ئەوەی، لە سەردەمی « یوسف سەلمان »ەوە، کۆمۆنیستەکان، لە ئاستی نەتەوەبوونی کورددا، لە دڕدۆنگیی و گوماندا دەژیان، لەژێر گوشاری « پارتی کۆمۆنیست » و تیۆرییە نەتەوەییەکەی « ستالین »دا، ئەوەیان ڕەتدەکردەوە، کورد نەتەوە بێ، بەڵکوو، بە گەلیان دادەنا.
پاشان، لە کاتی خۆیدا، « بەهادین » لابرا، ئەوەش یەکێ بوو لەو هۆیانەی، دوایی لە دانپێدانانەکەی خۆی پەشیمانبۆوە. تا دوایی، « عەبدولکەریم قاسم» هات و لە کۆتایی سەردەمی دەسەڵاتی « عەبدولکەری »مدا، « جەمال حەیدەریی » نامیلکەیەکی دەرکرد. لەو نامیلکەیەدا، دانی بەوەدا نا.
– من مەبەسم لە پارتی « ئەلشەعب » بوو، نەک « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » جیاوازییەکی زۆریان نەبوو.
– دوای ئەوەی، وازتان لە پارتی « ئەلشەعب » هێنا، لەگەڵ چ لایەکدا، کارتانکرد؟
لە سەرەتای ساڵی « 1948 »دا، من و « ساڵح یوسفیی » لە « مووسڵ »، پێکەوە کارماندەکرد. ئەو کاتە، « ساڵح یوسفیی »، « پارتیی » بوو.
– واتە: بەڕێزتان لە ساڵی « 1948 »ەوە، لە ڕیزەکانی « پارتیی »دا کارتان کردووە؟
بەڵێ. من پارێزەر و کەسایەتییەکی ناسرابووم. « پارتی دیموکراتی کوردستان »، پارتێکی نهێنییبوو، « ساڵح یوسفیی » لە « مووسڵ »، لە دادگەی « شەرعیی » کاریدەکرد و نووسەری یەکەمی دادگە بوو. هەموو زنجیرەی شانەکانی « پارتیی »، بە دەس ئەوەوە بوو، هەموو پێکەوە کۆ دەبووینەوە، بەڵام، من هێندێ لەو کەسانەم دەناسیی، ئیدی لەو کاتەوە، خۆم بە « پارتیی » دەزانی و خەڵکیش دەیانزانی، کە من « پارتیی »م. وا بزانم،

« برایم ئەحـــمـــەد » و برادەرانی دیکەش دەیانزانی، من لە « پارتیی »دا ئەندامم. بەڵام، پێش ئەوە، مەیلێکی دیاریکراوم، بۆ کێشەی کورد هەبوو. کاتێ، شۆڕشی ساڵی « 1945 » دەسپێکرد و دادگە « عورفیی »یەکان فرمانی لەنێوبردنی « بارزانیی »ەکان و ئەو کوردانەی، پێوەندییان بە شۆڕشەوە کردبوو، دەردەکرد. من، یەکێ لەو دوو پارێزەرە بووم، لە دادگـــە « عورفیی »یەکاندا، داکۆکیم لە « بارزانیی »یەکان و شۆڕشگێڕەکان دەکرد.

ـ لە چ ساڵێکدا؟

لە ساڵەکانی « 1945 ـ 1946 » تا ساڵی « 1950 ». کەسی دووەم، « عەونی یوسف » بوو. بەڵام، « عەونیی » زوو بەزیی و من هەر بەردەوامبووم.

دوایی، چەن پارێزەرێکی دیکەی وەک « محەمەد شاهێن ئەلسوفیی » هاتن و داکۆکییان، لە « بارزانیی »یەکان و ئەوانی دیکە دەکرد. ئەویش، هـــەر لە « مـــووسڵ » پارێزەر بوو، ئەندامی « پارتیی »ش بوو. هەروەها، « فـــەریق عەقراویی »ش شانی دایە بەر ئەو کارە.

ئەو کاتە، « مەلا مستەفا » لە « یەکێتی سۆڤێت » دەربەدەربوو. لەو کاتەوە، منی دەناسی. لە دوورەوە ناوی بیســـتـبـــووم، دەیزانی، پارێزەرێ هەیە و داکۆکیی لە « بارزانیی »یەکان دەکا. کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد »یش، ئاگایان لەوە بوو، من داکۆکییان لێ دەکەم.

پ3 : پێش ئەوەی، ڕابکەن و بە شـێـوەیەکی ڕاســـتـەوخـۆ، بەشـداریی لە شۆڕشـەکەدا بکەن، ئایا، لە نێو شاردا، پێوەندییتان لەگەڵ شۆڕشگێڕەکانی شاخدا هەبوو، یا، هەر وەک ئەندامێکی ئاسایی کارتاندەکرد؟ گەر هەبوو، ئەو پێوەندییە چۆن بوو؟

و3 : من، یەکێ لەو کەسانە بووم، لە ڕۆژنامەی « خەبات » دا کارمدەکرد.

ـ ئەو کاتە، « خەبات » بە نهێنیی یا بە ئاشکرا دەردەچوو؟

بە ئاشکرا دەردەچوو. دەســتـەی نووسـەران لە مـن، « برایم ئەحـمـەد، جـەلال تاڵەبانیی، حیلمیی عەلی شەریف و حەبیب محەمەد کەریم » پێکهاتبوو. من لە « بەغـــدا »، لە بارەگـــای « پارتیی » دەژیام. ئەو کـــاتـە، تازە ســـەرەتـای پێوەندییەکی ڕاستوڕەوان، لە نێوان من و « برایم و جەلال »دا دامەزرابوو. ئەو پێوەندییە، هەرسێکمانی بە تەواویی، پێکەوە گرێدابوو.

ـ تەنیا، بە هۆی ڕۆژنامەی « خەبات »ەوە؟

نەخێر. پێشتر دەمناسین. بەڵام، لەو کاتەوە، پێوەندییەکەمان بەهێزتربوو. «جەلال » منی دەناسی. جارێکیان، لە نێوان ساڵەکانی « 1956 ـ 1958 »دا، سەری لێ دام. بە تەواویی بیرم نەماوە، کەی بوو. خۆی بۆی گێڕامەوە و گوتی: خوێندکارێ بووم و لە ئامادەیی دەمخوێند، بۆ « مووسڵ » دوور خرابوومەوە. یەکێ لە پەرتووکەکانی تۆم کڕی و هاتم بۆ لات. ئەو کاتەی، ئەو باسیدەکا، پەرتووکی « کەیفە تونطیح ئەلسماء »م وەرگێڕابوو. پەرتووکێکی زۆر ناسک و خۆشە، بە داخەوە، ئێستە لام نییە.
ـ کەی لەگەڵ « برایم ئەحمەد »دا، یەکدیتان ناسی؟
« برایم »، پارێزەر بوو. سەردانی « بەغدا » و « مووسڵ »ی دەکرد. لە ساڵی «1948»دا، کۆمیتەی « ئینزیبات »مان هەڵبژارد، لەو کاتەوە یەکدی دەناسین.
ـ لە ڕێی « پارتیی »یەوە؟
نەخێر. ئەو کاتە، نە من و نە « برایم ئەحمەد »، ئەندامێکی دەرکەوتووی « پارتیی » نەبووین.
ـ ئەدی مەبەستان، لە هەڵبژاردنی کام کۆمیتەیە؟
مەبەسم کۆمیتەی « ئینزباتی پارێزەران » و هەڵبژاردنی سەندیکای پارێزەرانە.
ـ واتە: لە ڕێی پیشەکەتانەوە، یەکدیتان ناسی.
بەڵێ. لە ڕێی کاری پارێزەرییەوە، یەکدیمان ناسی.
ـ ئەدی، کەی لە ڕێی « پارتیی »یەوە پێکگەیشتن؟
لە ساڵی « 1958 »دا.
ـ دەربارەی دۆستایەتییتان، لەگەڵ « هەمزە ع. »دا، چیمان بۆ دەگێڕنەوە؟
من لە هەموو ژیانمدا، دوو جار، چاوم بە « هەمزە » کەوتووە.
جاری یەکەم: زۆر کتوپڕییبوو. « هەمزە »، خەڵکی شارۆچکەی « زاخۆ »یە. لە سەرەتای چلەکاندا، لای هاوڕێیەک لە شاری « مووسڵ » خۆی شاردبۆوە. ئەو هاوڕێیە، لە کۆلێژی « شا فەیسەڵ » مامۆستا بوو. لە کۆمۆنیستەکان بوو. یەکێ لە هەرە هاوڕێ، دڵسۆزەکانی خۆشم بوو. دوایی، لە سەردەمی « عەبدولکەریم »دا، بوو بە بەڕێوەبەری گشتیی « ئیرشاد ». ناوی « محەمەد تۆفیق حوسێن » بوو. تا ئێستەش ماوە و جاروبار، لە « عێراق »ەوە، سڵاوم بۆ دەنێرێ. لە بیرمە، لە چایخانەیە دانیشتبووین، یەکسەر لێی پرسیم: خۆ پێت ناخۆش نییە، گەر ئێستە، مرۆڤێکی پێشکەتووخواز بێ بۆ لامان و

دانیشێ، مرۆڤێکی خۆشە و لە خۆشتانە کوردە؟ ئەو کاتە، بە کۆمۆنیستەکانیان دەگوت: پێشکەوتووخواز، دوای ماوەیە، « هەمزە » هات. ئەویش، منی نەدەناسی و ناوی منی نەدەزانی. هەر وا، دانیشتنێکی کوورت بوو، لەبەرئەوەی خۆی شاردبۆوە، دەترسا.
جاری دووەمیش: لە دانیشتنێکی پچووکدا لە « بەغدا » دیمەوە.
ـ لەو دوو دانیشتنەدا دەمەتەقێی ڕامیارییتان نەدەکرد؟
هیچم لە بیر نەماوە.
ـ دەتوانن، دەربارەی کەسایەتیی « هەمزە »، هێندێ شتمان بۆ باسکەن؟
نەخێر. بەڵام، هێندەی من ئاگادارم، « مەلا مستەفا »، بڕوایەکی کوێرانەی پێ بوو.
ـ لە چ ساڵێکدا؟
لە ساڵی « 1958 »دا. چاکم لە یادە، ئێمە دانیشتبووین، « مەلا مستەفا »، پەڕاوێکی هەڵگرت و بە سپێتیی لە خوارەوە ئیمزایکرد و دای بە « هەمزە ».
ـ ئایا، کاتێ « بارزانیی »، « بەغدا »ی بەجێهێشت، پاشان شۆڕش دەسی پێ کرد، پێوەندیی لەگەڵ « هەمزە عەبدوڵلا »دا مابوو؟
نەخێر. ئەو لە « پارتیی » دەریکرد.
بەڵێ. دەزانم، بەڵام، لە سەرەتای حەفتاکاندا بیستم، سەردانی « بارزانیی » دەکرد.
من لە گرتووخانە بووم، ئاگام لە شتی وا نییە.
ـ جگە لەو دوو جارە، ئایا، جارێکی دیکە، مامۆستا « هەمزە » تان بینییەوە؟ هیچتان لە بارەیەوە بیستووە؟
نەخێر. لە دانیشتنەکانی « مەلا مستەفا »دا نەمبینیوە. لەو بڕوایەشدام، تا، « مەلا مستەفا » مرد، بە هیچ شێوەیە، پێوەندییان نەبوو. لەبەرئەوەی، هیچی نەدەکرد. دوای ئەوەی لە « پارتیی »ش دەرکرا، لە « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » دا، وەک ئەندامێ مایەوە.
ـ هەمزە؟
بەڵێ. ناسنامەی پارتی کۆمۆنیستی هەبوو. ئەندامێکی ئاساییبوو. ئەویش و « نووریی شاوەیس »یش، هەر دووکیان کۆمۆنیست بوون. « نووریی »، تا مردیش، هەر ئەندامبوو. لە هەمان کاتدا، ئەندامی پەلیتبیرۆی پارتییش بوو.
ـ چۆن شتی وا دەبێ؟

نازانم. بەڵام، ئەو پاککردنەوەیەی « مەلا مستەفا »، لە ڕیزەکانی « پارتیی »دا کردی، تەواو نەبوو. ئەوەش، چیرۆکێکی دوورودرێژە.
– پاشان، باسی ئەوەش دەکەین. کەی « بارزانیی »تان لە نزیکەوە ناسی؟
کاتێ، ساڵی « 1958 » ، لە « یەکێتی سۆڤێت » گەڕایەوە. وێنەشمان پێکەوە گرتووە. لە یادمە، من و « شێخ عەزیزی شەمزدینیی و جەوهەری عەزیز پاشای دزەیی » دادگەر، لەگەڵ چەن کەسێکی دیکە و « مەلا مستەفا »دا، بەرەو پیری ئەو « بارزانیی »یانەی لە « یەکێتی سۆڤێت » گەڕابوونەوە، هەموو پێکەوە چووین و پێشوازییمان لێ کردن.
– لە « بەغدا »، یا لە « بەسرە » ؟
لە « بەغدا ».
– ئایا، هیچ گفتوگۆیەکتانکرد؟
بەڵێ. « مەلا مستەفا » ڕوویتێکردم و گوتی: من تۆ دەناسم و سوپاستدەکەم. تۆ بێ ئەوەی، چاوەڕاونی هیچ پاداشتێ بکەی، داکۆکییت لە ئێمە کردووە. لەبەرئەوەی « مەلا مستەفا » عەرەبییەکی باشی دەزانی، هەمیشە بە عەرەبیی قسەی لەگەڵ من دەکرد و بە عەرەبیی گوتی: « لا جەزائە و لا شەکورا ».
– ئەدی جاری دووەم؟
دوای ئەوە، نزیکەی هەموو ڕۆژێ، یا ڕۆژە نارۆژێ، لە ماڵی خۆیان، لە میوانخانەکەی یەکدیمان دەبینی. لە دانیشتنەکانیدا، ئامادەدەبووم. ئەو کاتە، لە خانووەکانی هێلی ئاسن، لە ماڵە کۆنەکەی « نووریی سەعید » دا دەژیا.
– دەکرێ، هێندێ لەو شتە گرنگانەی، لە نێوانتاندا هەبوو، بۆمان باسکەن؟
ئەو کاتەی « مەلا مستەفا »، هێرشیکردە سەر « پارتیی » و پەلاماری بارەگای دا، « هەمزە عەبدوڵڵا »ی دەرکرد، من لە « مووسڵ » بووم.
– مەبەسم تەنیا، هەر ئەوە نییە. بەڵکوو، هەر شتێکی دیکە، پێوەندیی بە خۆت و ئەوەوە هەبێ.
بەو شێوەیە نەبوو. لە ڕاستییدا، پێوەندیی من بە « بارزانیی »یەوە، تەنیا، پێوەندیی سەرەدانبوو. دادەنیشتین و شتی ئاساییمان باسدەکرد.
– ئەدی پێوەندیی پارتایەتیی و ڕامیاریی؟
نەخێر. ئەو شتانەمان لە نێواندا نەبوو، باسی پۆلێتیکمان نەدەکرد. بەڵام، پێوەندیی پارتایەتیی توندوتۆڵم، لەگەڵ « برایم، جەلال، زوبێحی » و کۆمەڵێکی دیکەدا بوو. پێوەندییمان، لە سەرو باشیشەوە بوو، زۆر پێکەوە دەگونجاین.

ـ کاتێ شۆڕش دەسپێکرد، بەڕێزتان لە کوێ بوون؟ چیتان دەکرد؟ پێش ئەوەی هەڵێن، ڕاتان بەرانبەر شۆڕشەکە چۆن بوو؟
کاتێ شۆڕش دەسپێکرد، من لە « بەغدا » بووم. دوای ئەوەی، زۆربەیان ڕۆشتن بۆ شاخ و چالاکییان دەسپێکرد، ئیش و لێپرسراوییم بۆ دیاریکرا. من لە « بەغدا »، لەگەڵ « شەوکەت عەقراویی »دا مامەوە، کە پاشتر « بەعسیی »یەکان کوشتیان.
ـ بۆچی کوشتیان و لە چ ساڵێکدا کوژرا؟
لەبەرئەوەی، خۆی لەگەڵ « بەعسیی »یەکاندا بوو. دوایی، لەگەڵ ڕەشەکوژییەکەی « شێخ عوسمان و عوبێدوڵلا »دا، هەموویان پێکەوە سەریان تێداچوو. پێش ئەوەی ڕاکەم، من لێپرسراوبووم. کاتێ شۆڕش هەڵگیرسا و کڵپەیسەند، ئێمە بە نهێنیی، لە ماڵە پچکۆلەکەی « ئەنوەر دزەیی»، یەکدیمان دەبینی و کۆدەبووینەوە. ئەو کاتەی « پارتی »، یاداشتەکەی نووسی و بۆ « عەبدولکەریم قاسم »ی نارد، منیش بەشداریم تێدا کرد.
ـ ساڵی چەند بوو؟
دوای ئەوەی، هەرا و ئاژاوە و بزووتنەوەی چەکداریی، لە « کوردستان » دەسپێکرد.
ـ واتە: سەرەتای شۆڕش بوو؟
بەڵێ. لە سەرەتای شۆڕشدا بوو. بەڵام، پێش ئەوەی « پارتیی »، دەس بە سەر جوڵانەوەکەدا بگرێ و سەرکردایەتیی بکا. ئەو یاداشتەش، لە پەرتووکەکاندا هەیە و دەتوانی، بیبینی. لەو کاتانەی ئێمە، لەوێ کۆدەبووینەوە، فرمانی گرتنی « برایم ئەحمەد و جەلال » دەرچووبوو. لەبەرئەوە، هەموویان هەڵاتن. من ڕام نەکرد. « شەوکەت عەقراویی »ش، لەبەرئەوەی لە وەزارەی شارەوانیی فەرمانبەربوو، مایەوە. پێکەوە بە نهێنیی، ڕۆژنامەی « خەبات »مان دەردەکرد.
ـ ئەو کاتە، « شەوکەت » ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی بوو؟
نەخێر. هەر دووکمان، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی نەبووین. بەڵام، لە ڕاستییدا، کاتێ نوێنەرێ، یا میوانێکی گەورە بهاتایە و سەردانی ڕۆژنامەکەمانی بکردایە، دەربارەی « پارتیی » پرسیاریبکردایە یا نەیکردایە، « جەلال » هەمیشە، پێش هەموو ئەندامەکانی دیکە، منی پێشکەشدەکرد و دەیگوت: ئەمە ئەندامێکی بەرزی « پارتیی »یە. نەمان دەگوت: ئەوە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییە، تەنیا دەمانگوت: ئەندامێکی دەرکەوتووە، تا بیانزانیایە،

ئەو کەسە، لە کادیرە باڵاکانی « پارتیی »یە و قسەیان لەگەڵدا بکردایە. لە ڕاستییدا، « برایم ئەحمەد و جەلال »، ڕێزیان لێ دەگرتم و لەو بڕوایەدام، تا ئێستەش، هەر ڕێزم لێ دەگرن. هەروەها، لەو کاتەدا، ئەڵقەی پێوەندیی، نێوان شۆڕش و دەزگە بیانییەکان بووم.

– بە نهێنیی؟

بەڵێ. هێندێ لە نوێنەرە بیانییەکان دەهاتن، دەربارەی شۆڕشی کورد، داوای هێندێ زانیارییان دەکرد. بۆ نموونە: بیرم دێ، ڕۆژێکیان « جەمیل تۆما »، یەکێ لە ڕامیارە ناسراوەکانبوو. هاوڕێی باڵوێزی دەوڵەتی « چین » بوو. باڵوێزی «چین » دەیویست، ڕاپۆرتێ دەربارەی شۆڕشی کورد، پێشکەش بە کاربەدەسانی دەوڵەتەکەی بکا. زانیارییەکی زۆریشی، لەو بارەیەوە نەبوو. منیش، لەوە دەترسام، بچم بۆ ئەوێ و پێوەندیی دامەزرێنم، کەسێ بمبینێ و تێدابچم. بەڵام، « جەمیل تۆما » کەسایەتییەکی ناسراو و بەڕێوەبەری گشتیی بوو. لەبەرئەوە، باڵوێز من و ئەوی داوەتی نانخواردن کرد و بانگی کردین بۆ ماڵەوە. لەوێ ڕاپۆرتێکی تەواوم، دەربارەی شۆڕش پێشکەشکرد.

**پ4** : کەی بە تەواویی، هەڵاتن و بوون بە پێشمەرگە؟

**و4** : دوو ڕۆژ پێش ئەوەی، کۆدەتاکەی «8 /فێبروەری/1963» ڕوویدا، من گیرام. ئەمە دەبێ، باسکەم، لەبەرئەوەی، هەر کاتێ ئەم ڕووداوەم بیر دەکەوێتەوە، دڵم ژاندەکا. چونکە، ئەوە هەڵەیەکی گەورەبوو، « پارتیی» کردی. لە ساڵی «1963»دا، ماڵەکەمان لە « عەرەسات هیندییە » بوو. « شەوکەت عەقراویی »، ماڵەکەمانی دەزانی. ڕۆژێ خەریکبوو، لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەماندا، بۆ سەردانێکی ئاسایی، لە ماڵەوە دەردەچووین، ئۆتۆمۆبیلەکەی « عەقراویی »، لەبەردەماندا ڕاوەستا. « ساڵح یوسفیی » دابەزی و ئەویش لە دوایەوە بوو.

– « ساڵح یوسفیی » لەو کاتەدا، چۆن گەیشتبووە « بەغدا » ؟

نازانم. من حەپەسام، سەرمسوڕما، لەبەرئەوەی « ساڵح یوسفیی » لە شاخ بوو. یەکسەر زانیم، شتێکی خەتەر هەیە. بە براکەمم گوت: تۆ خێزانەکە بەرە و بڕۆ، من نایەم، دەبێ، ئەم ماستە موویەکی تێدابێ!

خوشکە گەورەکەم « سەبیحە »، وەک پیاوێکی ڕێکوپێک وابوو. بەڕێوەبەری خوێندنگە بوو. زیرەک و وریا بوو. هەر زوو، هەستی بە ڕووداوەکان دەکرد.

« مەلا مستەفا »، ڕێزێکی زۆر گەورەی لێ دەگرت. کاتێ، لە گرتووخانە دەرچووم و یەکەم ڕۆژ، دوای ئەوەی چوومە دەرەوە، « جەلال باڵتە، عەبدوڵڵا پشدەریی، نووریی شاوەیس » و کۆمەڵێکی دیکەش، لای « مەلا مستەفا » دانیشتبوون. لە یادمە، ڕووی تێکردم و گوتی: « جەرجیس »، تۆ خوشکێک هەیە، تەنیا خوشک نییە، بە پەنجەکانی دەیبژارد و دەیگوت: بەڵکوو لە هەمان کاتدا، « خوشک، برا، ژن، دایک و باوک »ە. من لە ژیانی خۆمدا، ژنی وام نەدیوە.

هەرچی چۆنێ بوو، « سالح یوسفیی » هات و لەماڵەوە دانیشتین. گوتی: کاکە! من هاتووم، دوو شتت پێ ڕاگەیەنم.

یەکەم: بە فرمانی کۆمیتەی ناوەندیی و شۆڕش، دەبێ، یەکسەر بێیتە نێو شۆڕش، بەرپرسی وێزگە و بەشی ڕاگەیاندن لە ئەستۆبگری. یا دەبێ، ئیشوکارەکانی خۆت، بە شێوەیە ڕێکخەی، خۆت دەربازکەی و لە « ئەورووپا »، نوێنەری شۆڕش بی.

دووەم: ئێمە، دوای ئەوەی تۆمان بینی و ئاگاداری بارودۆخی تۆ بووین، دەچین، « عەلی سالح ئەلسەعدیی » و کۆمەڵی « بەعسیی »یەکان دەبینین، لەبەرئەوەی، نیازیان هەیە، کۆدەتایەک ڕێکخەن. من دان بەوەدا دەنێم، کاتی خۆی، لەو بڕوایەدابووم، ئەو قسانەی « بەعسیی »یەکان، دەربارەی کۆدەتا دەیانکرد، لای من، وەک نوکتە وابوو! پێموابوو، ناتوانن، هیچ بکەن!

بەڵام، دوایی دەرکەوت، « ئەمێریکا » و « ئینگلیز »، لە پشت کۆدەتاکەی «8/فێبروەری»یەوە بوون. من هیچم نەگوت. « یوسفیی » گوتی: لێرە هەستام، دەڕۆم، لە سەر پاشەڕۆژی شۆڕش و داواکارییەکانی کورد، لەگەڵ « بەعسیی »یەکاندا ڕێکدەکەوم. « سالح »، مرۆڤێکی زۆر باشبوو. بەڵام، ڕامیار نەبوو، پیاوێکی ساکاربوو، مرۆڤێکی پاکبوو، دڵی وەک، دڵی منداڵ خاوێنبوو، لە ڕاستییشدا ئازابوو. لە ساڵی «1945»دا، هەموو ناوچەکانی دوژمنی دەبڕێ، نامەی لە « بەغدا و مووسڵ »ەوە بۆ شۆڕش دەبرد، گەر بیان گرتایە، یەکسەر هەڵیاندەواسی. بە ڕاستیی، ئازا و دڵسۆزبوو. تەنانەت، لە یادمە، ژنەکەی لە « زاخۆ » مامۆستابوو، دوای ئەوەی، لە ساڵی «1963»دا، جەنگ لە کوردستان دەسپێکردەوە، لە ساڵی «1964» دا، ژنەکەیان ناچار کرد، لە نێوان دوو شتدا، سەرپشکبێ، یا دەبێ، حاشا لە مێردەکەی بکا و لە ڕۆژنامەکاندا بڵاویکاتەوە، یا لە سەر کارەکەی لایدەبەن و دەریدەکەن.

– ئەم ڕووداوانە خۆشن. بەڵام، شتێکی لاوەکیین. با، باسەکەی خۆمان تەواو کەین.
پاشان، کەمێ بیرمکردەوە، لەوە زیاتر نەمتوانی و خۆمم پێ ڕا نەگیرا، دەمزانی، هیچ مافێکی مسۆگەری بۆ کورد تێدا نییە. گوتم: « ساڵح »، تۆ دەڕۆی بۆ لای ئەوان، لەوانەیە سەرکوتووبن، لەوانەشە ژێرکەوتووبن. بەڵام، تۆ « بەعسیی »یەکان دەناسی، پێویستە، دوو شت بکەن.
یەکەم: دەبێ، شتێکیان پێ بنووسن و ئیمزاکانیان وەرگرن.
دووەم: ئەم پێشنیازەی من، بە کۆمیتەی ناوەندیی ڕاگەیەنە. لەم ڕێککەوتنەدا دەبێ، باسی ئەوە بکەن و بیسەپێنن، کاتێ کۆدەتاکە دەسپێدەکا، پێویستە، هێزەکانی پێشمەرگە، یەکسەر وەک گەرەنتییە، شاری « کەرکووک » داگیرکەن. گوتی: کاکە ئەو کێشە و باسانە قوورسن. گوتم: ئەوە بیروڕای منە، لەبەرئەوەی ئێمە، لەگەڵ نەتەوەییەکانی عەرەبدا گرفتمان هەیە. ئەوانیش، نەتەوەییەکی کوێرن، دوایی، نکوولیی لە هەموو شتێ دەکەن، دەیانەوێ، وەک ئامرازێ بەکارمانبێنن. پاشان، کۆدەتای «8/فێبروەری » ڕوویدا و بۆمان دەرکەوت، هیچ شتێکیان نەکرد و هەمووی هەر تەنیا قسەی ڕووتبوو.
منیش، دوای ئەوە بە چوار ڕۆژ، یەکسەر خۆم شاردەوە و پێوەندییم بە « شەوکەت عەقراویی »یەوە کرد، تا بمگوێزێتەوە و ڕاکەم بۆ شاخ. چونکە دەمزانی، « بەعسیی »یەکان سەرکەوتنیان دەوێ. ئیدی، حوکوومەت منی گرت، ئەوەش هەمووی، لە ئەنجامی تەمەڵیی و کەمتەرخەمیی « شەوکەت عەقراویی »یەوە بوو، لەبەرئەوەی، لە کاتی پێویستی خۆیدا نەهات، بە ئۆتۆمۆبێل دەربازمکا.
منیان گرت و ڕەوانەی ئەنجوومەنی « عورفیی »یان کردم، فرمانی لە سێدارەدانیان دام. لە ساڵی «1963»دا، بە حسێب دەیانویست، بەرەڵامکەن، بەڵام، لە مانگی « یول »دا، دووبارە لە « کوردستان »، جەنگی سەربازیی دەسپێکردەوە، کوشتن و بڕین سەریهەڵدایەوە. بەو شێوەیە، سێ ساڵ و نیو، لە ژووری لەسێدارەداندا مامەوە و چاوەڕوانی مەرگمدەکرد. هەر چەندە، ئەو ساڵانە، بە بەرهەمترین ساڵەکانی ژیانم دادەنێم، نزیکەی چوار هەزار لاپەڕەم، لە ژیانی گەورە پیاوانی « بلوتارک » و زۆر پەرتووکی دیکەشم، لە گرتووخانەدا وەرگێڕا.

بێ گومان له ساڵی «1963 ـ 1964»دا، من، ڕەخنەم له فرمانی خنکاندنەکەم گرت و داوامکرد، چاوێکی پێدا بخشێننەوە. له نێو « 48 » کەسدا، کە هەموومان فرمانی خنکاندنمان دەرچووبوو، من تەنیا کەسێ بووم، دادگەی بەرز بڕیاریدا، هیچم له سەر نییە و بێ تاوانم. پێشنیازیان بۆ سەرۆک کۆمار کرد، تا بڕیارێ دەرکا و ئەو فرمانە پوچکاتەوە. بەڵام، « عەبدولسەلام عارف » پشگیریی ئەو بڕیارەی نەکرد و بەری نەدام. چونکە، له ڕۆژەکانی کۆلێژی سەربازییەوە، یەکدیمان دەناسی و دوژمنی تایبەتیی من بوو، لەگەڵ ئەوەشدا، فرمانی هەڵواسینەکەیان بۆ گۆڕیم و بە گرتنی هەمیشەیی شکایەوە. له ساڵی « 1968 »دا، له سەر داواکاریی « ناجی تالیب »ی سەرۆک وەزیران، کە هاوڕێی خوێندنگەم بوو، « عەبدولڕەحمان عارف »، ئەرکی سەرشانی سوککردم و له ژووری خنکاندن دەربازبووم.

ـ باشە مامۆستا، کەی له گرتووخانە ڕزگارتان بوو؟

له « 1968/7/17 » و دوای کۆدەتای دووەمی « بەعس ».

ـ ئەدی کەی « بەغدا »تان بەجێهێشت و چوونە نێو شۆڕشەوە؟

یەکسەر. دوای ئەوەی، له گرتووخانە بەربووم، پاش دوو ڕۆژ، « برایم ئەحمەد » پێوەندیی پێوە کردم. ئەو کاتە ئەوان له « بەغدا » بوون، ڕۆژنامەی « نور »یان دەردەکرد.

برادەران بە تێلێفۆن، له ڕێی خوشکمەوە زانیبوویان، چونکە، خوشکم هەمیشە، سەری لێ دەدان و باسی کێشەکەی منی بۆ دەکردن.

بێ گومان، « برایم »، بە یەکێ له خۆیانی دادەنام، لەبەرئەوەی، ئەو ماوە دووورودرێژەی له بارەگای « پارتیی » پێکەوە بووین، پێوەندییەکی توندوتۆڵی دیاریکراو، له سەر بنچینەی « دۆستایەتیی، ڕێزگرتن و بیروباوەڕ »، له نێوانماندا دروسبووبوو، بیروباوەڕیشمان له یەکدەچوو.

ـ وەک من بزانم، « برایم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانیی »، مارکسیی بوون. ئایا، چ جۆرە هاوئاهەنگییەکی ئایدۆلۆژییتان، له نێواندا هەبوو؟

ئەوان بڕوایان بە « سۆسیالیزمی مارکسیی » هەبوو.

ـ بەڵام، ئێوە بڕواتان پێی نەبوو. ئیدی چۆن، له ڕووی بیروباوەڕەوە ڕێکبوون؟

ڕاستە، من وا نەبووم. بەڵام، هەر ڕێکبووین، لەبەرئەوەی ئەوان، لەو کاتانەدا، بە هەموو وریاییەکەوە، مەیلە « سۆسیالیستیی »یەکەی خۆیان دەشاردەوە.

ـ ڕێباز و بیروباوەڕی خۆیان دەشاردەوە؟!!

بەڵێ. دەتوانم، زۆر بە دڵنیاییەوە ئەوە بڵێم. جگە لەوەی، ئەوان لەو بڕوایەدا بوون، منیش وەک ئەوان، بڕوام بە « سۆسیالزم » هەیە. چونکە، یەکێ لە دامەزرێنەرەکانی پارتی « ئەلشەعب » بووم، کە ئەویش هەر پارتێکی « مارکسیی و سوسیالیستیی » بوو. هەروەها، منیان بە یەکێ، لە چەپە پێشکەوتووخوازەکان دادەنا. لەو سەردەمانەدا، یا کۆنەپەرست هەبوو، یا ووشەی دیمۆکراسیی هەبوو، کە واتای « چەپی مارکسیی » دەگەیاند و دژی نەتەوەیی بوو.

لە کاتی « عەبدولکەریم قاسم »دا، دوو ووشە هەبوو، دوو زاراوە هەبوو، ئەو پیاوە، پیاوێکی « دیمۆکراسیی »یە و ئەوی دیکەیان « نەتەوەیی »یە. بە بڕوای خۆم، گەرموگوڕیی بیروباوەڕە نەتەوەییەکەی « برایم و جەلال »، بە سەر بیروباوەڕە « سۆسیالیزمیی »یەکەیاندا زاڵبوو. بەڵام، هەڵەی هەرە زەقی، بیر و بۆچوونیان ئەوەبوو، ئەوانیش، وەک « مارکسیی »یەکانی دیکە، بە قووڵیی مارکسییەتیان نەخوێندبۆوە و لێیان نەکۆڵیبۆوە، وەک من، بە وردیی لێی کۆڵیبوومەوە. بۆ؟ لەبەرئەوەی « برایم و جەلال »، هیچ زمانێکی بیانییان نەدەزانی. بەڵام، من « مارکسیزم »م، لە چەندین سەرچاوەی جیاوازەوە خوێندبۆوە و دەمزانی. ئەوان خوێندنەوەکانیان، هەمووی « ڕۆژهەڵاتیی »یانە بوو.

– باشە مامۆستا، بۆچی پێوەندییان پێوە کردی؟

وایاندەزانی، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی، دوایان دەکەوم و کاریان لەگەڵدا دەکەم.

– ئەدی چیتان بڕیاردا؟

تا ئێستەش، قسەکانی « برایم »م، بە تەواویی هەر لە بیرە. گوتی: کاکە! ئێمە بەو بەربوونەت، زۆر دڵخۆشبووین. ئێمە، لە ماوەی ئەم پێنج ساڵەی ڕابردوودا، کە تۆ گیرابووی، هەمیشە هەوڵماندداوە و بە هیچ شێوەیە، لەو بوارەدا کەمتەرخەمییمان نەکردووە. من دەزانم، ڕاسدەکا. چونکە، دوایی خوشکم، هەمووی بۆ باسکردم. ئەو کاتەی دەیانویست، لە « بەغدا »وە بۆ ئەنجوومەنی « عورفیی مووسڵ »م بەرن، « جەلال » چووبوو بۆ لای « فوواد عارف » و داوای لێ کردبوو، بە هەر شێوەیە بێ، لە « بەغدا » گلمبدەنەوە و ڕەوانەی هیچ شوێنێکی دیکەم نەکەن، تا بەرەڵامدەکەن. هەر واشبوو، بروسکە هات، بۆ ئەوەی نەمجوڵێنن. کەچیی، لەو کاتەی من، لە

شەمەندەفەرەکەدا بووم، ئەفسەرێکی « بەعسیی »مان لێ پەیدابوو، خۆی بە سەرۆک کۆمار نەدەدا! پێی لێ داگرتین و گوتی: من هەقی ئەم شتانەم نییە، من دەتبەم بۆ ئەوێ. مەبەسم ئەوەیە، لەو سەردەمەدا پاشاگەردانیی بوو، چەن حوکومەتێ هەبوو. هەروەها، خوشکم گوتی: لەبەردەمی خۆمدا، « جەلال »م بینی، تفی لە « شەوکەت عەقراویی » کرد، لەبەرئەوەی، کەمتەرخەمیی لە ئەرکی سەرشانیدا کردبوو، منی دەرباز نەکردبوو
ـ مامۆستا! یا بگەڕێینەوە بۆ لای « برایم ئەحمەد ».
لە تێلیفۆنەکەدا گوتی: ئێستە من، برای تۆم، تۆش من دەناسی. ئێمە، لە « بەغدا » خانوویەک، بۆ خۆت و ئەندامانی خێزانەکەت بە کرێدەگرین، هەر خانوویەک تۆ دڵت بیگرێ. پاسەوانیشت بۆ دادەنێین. هەروەها، ڕۆژنامەی « نور »یشت بە تەواویی دەدەینێ. بەڵام، پێش ئەوە پێویستە، بە بۆنەی بەربوونتەوە، ئاهەنگێکی تایبەتیی بگێڕین. دیاربوو، لەو کاتانەدا لە « بەغدا »، دەسەڵاتێکی فراوانیان پێ درابوو!
لە ڕاستییدا، زۆر تامەزرۆی بینینیبووم، چونکە زۆر شت لە نێوانماندا هەبوو. بەڵێ. لە ئۆتێلی « ئاشوربانیپاڵ »، داوەتێکی تایبەتیی بۆ کردم. تەنیا ئاهەنگی نانخواردن بوو. « برایم ئەحمەد، عەلی عەسکەریی، حیلمیی عەلی شەریف، عومەر مستەفا و ئەحمەد دزەیی »، هەموویان ئامادەبوون، هێندێکی دیکەش لەوێ بوون. نزیکەی بیست کەسێ دەبوون. لە کاتێکدا دەمویست، بە شێوەیەکی جوان، قسەیان لەگەڵدا بکەم و بڵێم: ئەم دووبەرەکییییە ڕاست نییە. « برایم » گوتی: دوای ئەوەی، لە نانخواردن بووینەوە، پاشان من و تۆ، دووقۆڵی دادەنیشین و لەو بارەیەوە، بە هێواشیی قسەدەکەین. لە ڕاستیدا، من لەو هەڵوێستەمدا، لە نێوان هەست و سۆزی ناسکی دۆستانە و لە نێوان ئەو خەباتەی لە کوردستاندا دەکرا، هێشتا دوودڵبووم. هەر چەندە، لەو کاتەدا، ئەو خەباتەی لە کوردستاندا هەبوو، دیسانەوە، خەباتی تەواو نەبوو، نیمچە خەبات بوو. چونکە، دوای ڕێککەوتننامەی « 1966/6/29 »، « ساڵح یوسفیی » هات بۆ « بەغدا » و لەوێ، ڕۆژنامەی « ئەلتەئەخی » دەردەکرد. هەروەها وا بڕیاربوو، لە وەزارەتدا بەشدارییبکەن و « ساڵح یوسفیی و موحسین دزەیی »، ببن بە وەزیر.
لە یادمە، لە ماوەی ئەو پازدە ڕۆژەی، لە « بەغدا » بووم، پێوەندییەکانم لە نێوان، هەر دوو لایاندا دابەشبووبوون. بەڵام، لە ڕۆژنامەی « ئەلتەئەخی »،

کارمەکرد و یەکسەر دەسمکردەوە بە نووسین. بزانە، مرۆڤ چەد سەیرە! چەن ساتێکی ورد، لە ژیانیدا هەیە، چارەنووسی ژیانی، لە سەرەتاوە تا کۆتایی دەگۆڕێ.
- چۆن؟
لەو ساتە ناسک و دەگمەنەدا، ئاورمدایەوە، چوار ئۆتۆمۆبیلی فۆکسواگنم بینی، دەوری ئوتێلەکەیان دابوو، چەن کەسێکی تێدابوو. بەڵام، کاتێ دەچووم بۆ بارەگای ڕۆژنامەی « ئەلتەئەخی »، « حەبیب محەمەد کەریم » لەوێ بوو، « موحسین دزەیی » و خەڵکی دیەکەش، بەردەوام دەهاتن و دەڕۆین، هەرگیز، هیچ ئۆتۆمۆبیلێکم لەو ناوە نەدەبینی. ئەوە بە تەواویی، تێکیشکاندم و هەر بەو شەوە، دوا بڕیاری خۆمم دا، تا بە زووترین کات، پێوەندیی بە شۆڕشەوە بکەم و بڕۆم.
- مەبەستان ئەوەیە، ئەوانەی نێو ئۆتۆمۆبیلەکان، چاودێریاندەکردن ؟
چاودێریشیاندەکردن و پارێزگاریشیاندەکردن.
- پارێزگارییەکە ،لە لایەن پیاوەکانی خۆیانەوە بوو، یا لە لایەن حوکوومەتەوە بوو؟
لە لایەن حوکوومەتەوە بوو. سیخوڕەکان، چواردەوریان تەنیبووین. لەو کاتەدا، چوار ئۆتۆمۆبیلە سیخوڕەکانم بینی، بۆ پارێزگاریی ئەوان، بە چواردەوری ئوتێلەکەدا دەسووڕانەوە. بیرم لەوە دەکردەوە، هەمووی ماوەیە لەمەو پێش بوو، من لای ئەوان گیرابووم و دەیانویست، هەڵمواسن. ئێستە، دوای ئەوە و لە ماوەی چاوتروکاندنێکدا، بڕیاربدەم، دوایانبکەوم و لەگەڵیاندا بم!! بێ گومان، شتی وا نابێ، ڕوویدا. ئیدی، یەکسەر تێلێفۆنم بۆ « ساڵح یوسفیی » کرد، تا لە دەس ئەو تەنگوچەڵەمەیە ڕزگارمبێ.
پێم گوت : « ساڵح »، من دەمەوێ، یەکسەر بڕۆم بۆ « کوردستان ». پاشان، هات بۆ لام بۆماڵەوە و گوتی: بەیانیی خۆت ئامادەکە، لە بەیانیی زووتر نییە، « حەبیب محەمەد کەریم »، لەگەڵت دێ. ئیدی، یەکسەر دەرچووم.

پ5 : چۆن بوون بە پێشمەرگە و بۆچی، ئەو ڕێبازەتان هەڵبژارد؟
و5 : من نەمدەتوانی، لەگەڵ حوکوومەتدا هاوکارییبکەم.
- باشە نەدەکرا، لەگەڵ کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد »دا کاربکەن؟
هەرگیز نەمدەتوانی، بەو شێوەیە، لەگەڵ ئەو کۆمەڵەدا کاربکەم.

ـ ئایا نەدەکرا، واز لە هەموو شتێ بێنن، لەگەڵ هیچ لایەکیاندا کار نەکەن، وەک فەرمانبەرێ لە « بەغدا » کاربکەن و بۆ خۆتان بژین؟
نەخێر. چونکە، من بڕوایەکی تەواوم، بە « بارزانیی » هەبوو. ئەو بڕوایەشم، بە هیچ شێوەیە، لەق نەدەبوو.
ـ من مەبەسم لە بڕواپێکردن نییە. بەڵام، گەر وەک فەرمانبەرێ، لە « بەغدا » کارتانبکردایە و دانیشتنایە، ئایا، حوکوومەتی « عێراق » دژایەتیاندەکردن؟
نەخێر. بەڵام، من لەوێ نەمامەوە و دەرچووم.
ـ واتە: بە بڕوایەکی تەواوەوە، چوونە ڕیزی شۆڕشەوە؟
بەڵێ. لە ڕێی باوەڕەوە چووم. من پارێزەرێکی باشبووم. دەمتوانی، سەرکەوتنی پتر بەدەسبێنم. سەروەت و سامانیشم هەبوو. ئەو کاتەی پێوەندییم بە « پارتیی »یەوە کرد، لە ماڵەکەی خۆمدا، دوو ئۆتۆمۆبیلم هەبوو. بەڵام، گەورەترین کەسیان، جووتێ پێڵاویان نەبوو!!!
ـ مەبەستان لە ساڵی « 1948 »ە؟
بەڵێ. ساڵی «1948» و تا ساڵی «1958»یش، هەر باری ئابووریم باشبوو.

پ 6 : کاتێ چوونە دەرەوە، کەی و لە کوێ، بۆ یەکەمین جار، چاوتان بە « بارزانیی » کەوت؟ لە سەرەتادا، پێوەندییتان لەگەڵیدا چۆن بوو؟
و6 : لە کۆتایی مانگی « سێپتێمبەر »، یا سەرەتای مانگی « ئۆکتۆبەر »ی ساڵی «1968»دا ڕامکرد. هەر کە چووم، یەکەم جار، « ئیدریس و مەسعوود » پێشوازییان لێ کردم. هەر دووکیان هێشتا تازە، لە بزووتنەوەکەدا کاریان دەکرد. یەکسەر، بردیانم بۆ لای « مەلا مستەفا ». لە ڕاستییدا، « مەلا مستەفا » بیری زۆر تیژ و بەهێزبوو. دیارە، ئەوە تەنیا وەک ئەمەکێ وابوو، بۆ ئەو شتانەی کاتی خۆی، وەک پارێزەرێ، لەگەڵ « بارزانیی »یەکاندا کردبووم. بۆیە، جگە لەو چیرۆکەی، دەربارەی خوشکەکەم بۆم گێڕایەوە، گوتی: « جەرجیس » دەمەوێ، شتێک پێ بڵێم: لە کاتی گفتوگۆکاندا، دەربارەی تۆ زۆرم نووسی، تا بەرەڵاتکەن. بەڵام، ئەو سەگە نەفرەتلێکراوانە، پەسەندیان نەدەکرد. بە « عەرەبیی » دەیگوت: « کلالیب » نەیدەگوت: « کلاب ». گوتی: دوای ئەوەی، فرمانی لەسێدارەدانتان دەرچوو، دوو کەس لەو گیراوانە، بە لای منەوە گرنگبوون، یەکێ لەوانە تۆ بووی، ئەوی دیکەشیان، زەعیم « حەسەن عەبوود » بوو. ڕاستیدەکرد، چونکە، لەو بارەیەوە شت زۆرە و درۆ ناکا.

ـ « حەسەن عەبوود » کێیە؟ عەرەب بوو؟
بەڵێ. عەرەب بوو. کاتی خۆی لە « مووسڵ »، فرماندەی لیوای پێنج بوو. ئەم پیاوە، لە کاتی شۆڕشی « بــــارزان »دا، فرماندەی ئەو هێزە چەکدارەی « عێراق » بوو، بۆ ئەوەی، « بارزان » داگیرکەن. کاتێ پەلاماریاندا، جاشی « زێباریی »یان لەگەڵدا بوو. « حەسەن » هاوڕێم بوو، لە خوێندنگەش، لە یەک پۆلدا بووین. ئەمە خۆی بۆی گێڕامەوە: تەماشادەکا، « زێباریی »یەکان دەیانەوێ، تۆڵە لە « بارزانیی »یەکان بکەنەوە، بە تەنەکە نەوتەوە، پەلاماریان دەدا و دەیانویست، خانووەکانی « بارزان » بسوتێنن. « حەسەن »، لە بەر جۆگەی ئاوەکەی « بارزان »دا ڕادەوەستێ، دەمانچەکەی دەردێنێ و دەڵێ: هەر کەسێ بێتە پێشەوە، یەک گوللە بە تەوقی سەرییەوە دەنێم. بەو شێوەیە، گوندی « بارزان »ی، لە سوتاندن ڕزگارکردبوو. « بارزانیی »یەکان، بەو بەسەرهاتەیان زانیبوو، « مەلا مستەفا »ش، لەو دوورەوە ئاگاداری ئەو ڕووداوە بوو.
ـ واتە: « بارزانیی »، پیاوێکی بە ئەمەکبووە؟
بەڵێ. خەڵکێکی زۆر دانیشتبوو، « عەزیز عەقراویی »ش لەوێ بوو. دوایی گوتی: نوێنەری « کۆمۆنیستی عێراق » هاتن بۆ لام و گوتیان: ئێمە، پلانێکی تایبەتییمان داناوە، بۆ ئەوەی، دەرگەی گرتووخانە بشکێنین و هاوڕێکانی خۆمان دەربازکەین. بۆ ئەو کارە، پێویستمان بە چەک و پارە هەیە، دەبێ، ئۆتۆمۆبیل بکڕین. گوتم: چەندتان دەوێ؟ گوتیان: دە هەزار دینار.
« بارزانیی » گوتی: وەڵلایی وە بیلایی وە تەڵلایی، لەو کاتەدا، شۆڕش لە دە هەزار دینار زیاتری نەبوو. گوتم: ئەوە، دە هەزار دینارەکە لای منە، بەڵام، من ئەو دوو کەسەم دەوێ، « جەرجیس و حەسەن عەبوود ».
جا، هەر لە ڕاستییشدا، « کۆمۆنیست »ەکان نیازی شتێکی وایان هەبوو. لەبەرئەوەی، ئەو کۆمۆنیستانەی گیرابوون و لە گرتووخانەدا، فرمانی خنکاندنیان درابوو، هەموویان کادێری پێشکەوتوو و لە ئەندامانی لیژنەی ناوچە و سەرکردایەتیی کۆمۆنیستەکان بوون.
ـ ئەمە چ ساڵێ بوو؟
لە ساڵی «1963»دا بوو. دوای ئەوەی، « بەعسیی »یەکان کودەتاکەیانکرد. دوایی، « بارزانیی » گوتی: پاشان، « کۆمۆنیست »ەکان ڕۆشتن و نەگەڕانەوە. منیش گوتم: باش بوو نەگەڕانەوە، وا من خۆم بەربووم، تۆش دە

هەزار دینارەکەت بۆ گەڕایەوە و هیچت لە کیس نەچوو. « بارزانیی » پێکەنی. ئەوە یەکەم پێکگەیشتنمان بوو.
ـ ئایا، لەو دانیشتنەدا باسی پۆلێتیکتان کرد؟
نەخێر. تەنیا قسەکردنبوو.
ـ کەی دانیشتنی ڕامیاریی، لە نێوان ئێوە و « بارزانیی »دا دەسپێکرد؟
دانیشتنی ڕامیاریی، لە نێوان من و « مەلا مستەفا »دا نەبوو. « مەلا مستەفا »، ئەو جۆرە شتانەی نەبوو. هێندێ شتی پچووکی دەگوت، ڕێبازی خۆی، پێ ڕووندەکردەوە. « مەلا مستەفا »، ئەو پیاوە ڕووناکبیرە نەبوو، وەک من و « برایم ئەحمەد »، پێنووس و ڕاستە بە دەسەوەبگرێ، تا، شتەکان بپێوێ و بیانبڕێ، پاشان وەک جلوبەرگ لەبەریانکا. چەن ووشەیەکی دیاریکراوی ڕێنیشاندەری هەبوو، بۆ ئەوەی بیلێ، وەک جوتیارێ، بە شێوەیەکی پێچوپەنای دیارکراو دەیگوت. تۆش دەبووایە، لە مەبەسەکەی تێبگەیشتیتایە.
ـ واتە: بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، قسەی نەدەکرد؟
نەخێر. ڕاستەوخۆ قسەیدەکرد، بەڵام، بە شێوەیە لە شێوەکان دایدەپۆشی. ئەو قاڵب و لێکدانەوە تایبەتییانەی، من و تۆ و « برایم ئەحمەد » و کەسانی دیکە بەکاریاندێنین و لە خوێندنەوەوە فێریانبووین، ئەو بەکاری نەدەهێنا.
ـ ئایا، لە کێشە و باسی ڕامیارییدا، ڕاوێژی پێ دەکردن؟
نەخێر. هەرگیز نەیدەکرد.
ـ ئایا، هیچ گرفتێکتان لەگەڵ « بارزانیی »دا هەبوو؟
نەخێر. من هیچ جۆرە گرفتێکم لەگەڵیدا نەبوو. بەڵام، هێرشمدەکرد. هەر کاتێ پێکدەگەیشتین، باسی شتێکی ناخۆشم بۆ دەکرد. هەموو جارێکیش، شتی ناخۆش نەبوو. دەربارەی ئەو شتە تایبەتییانەی، لە شۆڕشدا ڕوویان دەدا، هێندێ شتی دیاریکراوم پێ دەگەیشت و منیش، بە شێوەیەکی ناخۆش بۆم دەگێڕایەوە.
ـ ئەو شتانە دەربارەی کەموکوڕییەکانی شۆڕش بوون؟
بەڵێ. دەربارەی کەموکوڕییەکان بوون.
ـ ئەدی « بارزانیی » چی دەگوت؟
لە بیرمە، جارێکیان، کارەساتێکی خراپ ڕوویدابوو، تاوانێ لە لەشکری یەک کرابوو. لەو کاتانەدا، لە « ئامێدیی »، « ئەسعەد خۆشەویی » سەرکردەی لەشکری یەک بوو. « کەریم سنجار »یش، لەوێ لێپرسراوی دادگە بوو.

ڕاووڕووت و دزییەکی بێ وێنە هەبوو، بە شێوەیە بوو، تەنیا خوا نەبێ، کەس ناتوانێ، باسیکا.
ــ لە چ ساڵێکدا ڕوویدا؟
لە ساڵی « 1970 » تا « 1974 »، بە شێوەیەکی بەردەوام بوو.
ــ مەبەسم لە ڕووداوەکەیە؟
ڕووداوەکە، لە ساڵی « 1974 »دا بوو. یەکێ لە دیانەکان نەیدەویست، سەر بۆ « ئەسعەد خۆشەویی » دانەوێنێ و واز لە زەویەیەکەی خۆی بێنێ. لەبەرئەوە کوشتی.
ــ ناوی چی بوو؟
ناوەکەیم لە بیرچۆتەوە. لەو کاتانەدا، من خۆم لە کۆمیتەی ناوەندیی و هەموو شتێکی دیکە دوورخستبۆوە. بێ گومان، دوایی ئەمەت بۆ باسدەکەم. لێپرسراوی داد « ساڵح یوسفیی » بوو. نووسراوێکم نووسی. « کەریم سنجاریی » لەوانەیە ترسابێ، یەکسەر، تاوانبارەکەی بەردابوو. « ئەسعەد خۆشەویی » زۆر زۆرداربوو. ئەو و « عیسا سوار »، لە زۆردارە خوێنڕێژەکان بوون. تەنانەت، کاتێ لە ساڵی « 1975 »دا، سوپای « عێراق » چووە نێو « ئامێدیی »یەوە، خەڵک بە هەلهەلە و چەپڵەلێدان، بەرەوپیریانچوون. شۆڕش گەیشتبووە ئەو ڕادەیە!
ــ باشە، « بارزانیی » بۆ لێی نەدەپرسینەوە؟
لەبەرئەوەی « مەلا مستەفا »، دەسی لە شۆڕش بەردابوو. من دەتوانم، بە دڵنیاییەوە بڵێم: پزیشکەکان گوتبوویان: تۆ تووشی نەخۆشیی« شێرپەنجە » بووی، چەن ڕۆژێکی کەم، لە ژیاندا ماوە. لەبەرئەوە، « مەسعوود و ئیدریس » هەر دووکیان، کاروباری شۆڕشیان بە دەسەوەگرتبوو، بەڵام، ڕایان نەبوو، تەنیا « دارا، محەمەد مەحموود عەبدولڕەحمان و مەحموود عوسمان »، ڕایان هەبوو. شۆڕش بەم شێوەیە بەڕێوەدەچوو. لەگەڵ ئەوەشدا، ڕای « مەلا مستەفا »یان، لە فرمانە گەورەکان و بڕیارە مەزنەکاندا وەردەگرت، وەک ئەوەی، فرمانەدەی هێزێ لا ببرێ، لێپرسراوێکی گەورە، لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە بگوێزرێتەوە، دەس لە ناوچەیەکی دیاریکراو بوەشێنن ... تا.
لە دوا ڕۆژەکانی شۆڕشدا، چەن هێزێکی سەربازیی « عێراق »، بە خێرایی، نزیکی « دۆڵی شەهیدان » بوونەوە. ئەو ناوچەیە بۆ شۆڕش، ناوچەیەکی ستراتیژیی زیندووی گرنگبوو. گەر بە تەواویی، ئەوێیان بگرتایە، چەن

یەکــەیەکی ســەربازیی جــەنگاوەر دەیانتــوانی، لە پشــتــەوە بۆمــان بێن و چواردەورمـان لێ بگرن. دوای ئەوەی، جـەنگ لە کوردسـتـاندا دەسـپێکردەوە، ورەی پێشمەرگە ڕوخابوو. ئەو گەرموگوڕیی و ورە بەرزەی پێشوو نەمابوو.
ـ پاشـان، باسی ئەوەش دەکەین. ئێسـتـە، باسی جوتیـارە « دیان »ەکەمـان بۆ تەواوکە.
« مەلا مسـتـەفا » هات بۆ لام. وەک پیشـەی خۆی، دەوروبەری کاژێری دوازدە، یەکی شـەو سەردانیدەکردم. تکایەکی تایبـەتیی لێ کردم، گوتی: گەر هێندێ شت هەبوو، وەک ئەو دەنگوباسـانەی لای من و تۆ گـرنگن، بۆم بنووسـە. ئەو شـــەوە، باسی ئەو بابـەتەم بۆ کــرد. پێم گــوت: ئەم شـــتـــانە ڕاست نین، شۆڕشەکەمان لە دەسدەچێ. بە خوا من هـەرگیز ناتوانم، درۆ بە دەم مردوو و پیـاوی چاکەوە بکـەم. تا ئێسـتـەش لە یادمـە، گوتی: گـەر بـەو شێـوەیەبێ، من گوتوومـە و دەشیـڵێم: پیـاو لە کوردسـتـاندا نییـە! منیش، بە سـوعبـەتەوە پێم گوت: من و تۆش؟ من وەک هـاوڕێیـەک قسـەم لەگـەڵ دەکرد. ئەو بە ناوی ڕووتی خۆمەوە، بانگیدەکردم و منیش، تەنیا بە « مەلا مستەفا » بانگمدەکرد. تەنانەت « ئەزبەنـیی » و « کـاکـە »ش نەبوو. ئەو خـۆی، منـی لە ســەر ئەوە ڕاهێـنابوو. هەر کــە بە ناوی « جــەرجــیس »ەوە و بێ « کــاکــە » بانگیکردم، یەکــســەر تێگەیشتم، منیش پێویستە، بە « مەلا مستەفا » بانگیکەم. گوتی: چیت دەوێ؟ ئەمـە قـسـەی ئەو بوو. گـوتی: گـەر دەتەوێ، سـزایانبـدەم، دەبێ، هەمـوو ئەو لێپرسـراوانە، لە قوژبنی گرتووخانەکان توندکـەم. ئەمەی پێ گوتم. لەبەرئەوەی پێویستی نەدەکرد، ئەو قسانەبکا، لە بەر خۆیەوە، داوای لێبووردنیدەکرد.
ـ مەبەسـتـان ئەوەیە، « بارزانیی » نەیدەتوانـی، هیـچ شتێ، دژی ئەو زۆردارانە بکا؟
بە خوا، من لەو باوەڕەدام، دەیتوانی، شتێ بکا.
ـ ئەدی، بۆ نەیدەکرد؟
من لەو ڕووەوە، ڕووداوێکی دیاریکراو بۆ دەگێڕمەوە. « سـاڵح یوسفیی » ، هـەر چەند، بیـریدەکەوتـەوە، دەلەرزیی. دەیویسـت، بگری. زۆرداریکی دیکـە هـەبوو، نزیکبـوو، سـەگێ بوو بۆ خـۆی، نەفـرەت لـە گـیـانی بێ، « عـیـسـا سـوار »ی فرمـاندەی هێزی « زاخـۆ » بوو. ئەم پیاوە، تەمـەنی هەژدە ساڵ بـوو، کـاتێ، لەگەڵ « مەلا مستەفا » ڕۆی.
ـ بۆ « سۆڤیەت » ؟

بەڵێ. لە دوای کارەساتەکە، بەرەو « ئێران » بەڕێوەبوو، کوشتیان و سزایان دا. ئەوی پێی بڵێ شەهید، نەفرەت لێ کراوە! ئەم پیاوە، لە ناوچەکەدا، وەک ڕێگەیەکی نێودەوڵەتیی وابوو. « حەشیشە، کۆکایین و هێرۆیین »ی دەرباز دەکرد. هەروەها، ئەو پێنج پێشمەرگەیەی کوژران، ئەو بەرپرسیاربوو. لەبەر ئەوەی، ئەوانە هەژاربوون، نەیاندەزانی، ئەو شتانەی، بە پشتی یەستر دەیان گواستەوە، باری « هێرۆین و کۆکایین » بوو، بەڵکوو، وایاندەزانی، کەرەسەی سەربازییە. حوکوومەتیش، بەپێی یاسای خۆی گرتنی و لە گرتووخانەی « مووسڵ » خنکاندنی. ئەم ڕووداوەی دەمەوێ، ئێستە باسیکەم، ئەوەی پێوەندیی بە « مەلا مستەفا »وە هەیە، لە سیمینارەکەدا باسمکرد. من لە زۆر شت و لەو بارانەوە، « مەلا مستەفا » بە ڕاست نازانم و پاکانەی بۆ ناکەم. بەڵام، ڕامیارەکان چاکەیان هەیە و هەڵەی گەورەشیان هەیە.
بازرگانێ هەبوو، لە کوردەکانی « سووریا » بوو. ڕێ بۆ ئەو کراوەبوو. لە ڕێی « زاخۆ » وە، جگەرە و هێندێ شتی گرنگی دیکەشی دەهێنا و دەیفرۆشت، پێدەچوو، دەسەڵاتە مۆنۆپۆلیییەکەی « ئەسعەد خۆشەویی و عیسا سوار »ی، لە ناوچەکەدا شکاندبێ. لەبەرئەوە، « عیسا سوار » گرتی و لە گرتووخانەی توندکرد. ئەو پیاوە، حەوت منداڵی هەبوو. دوای ئەوەی، ماوەی مانگێ دیار نەما و نەگەڕایەوە، ژنەکەی هاتبوو بۆ « زاخۆ » و بە دوای مێردەکەیدا دەگەڕا. ئەوانیش، سوکایەتییان پێ کردبوو، سوکایەتییان پێ کرد، سوکایەتییان پێ کرد، تا لە کۆتاییدا، گەیشتە لای « عیسا سوار ». ئەویش، پێی گوتبوو: بابە! من هەقم چییە بەسەرەوە، « ساڵح یوسفیی » فرمانیداوە، بگیرێ. لەبەرئەوەی « عیسا سوار »، ڕقی لە « ساڵح » بوو. تەماشاکە، بزانە، شۆڕشەکە بە چ پلەیەکی نزم گەیشتبوو!
« ساڵح یوسفیی » گوتی: بە خوا کاکە « جەرجیس »، من لە « بەغدا » دەچووم بۆ « تەئەخی ». دەبینم، ژنێک و حەوت منداڵ، لە دەرەوە لای دیوارەکەوە دانیشتوون. کاتێ چوومە ژوورەوە، ژنەکە هەستا، ئەژنۆی گرتم، گریا، پاڕایەوە و گوتی: تکات لێ دەکەم، مێردەکەم بۆ بەرەڵاکە. گوتم: بابە مێردەکەت کێیە؟ من تۆ ناناسم، تۆ کێی؟ بە خوا، گەر هەزار سوێندم بۆ بخواردایە، کە من مێردەکەی ناناسم و هیچ شتێ لەو بارەیەوە نازانم، بڕوای پێ نەدەکردم و هەر بڕوای بە « عیسا سوار » دەکرد. « عیسا سوار »یش خۆی گرتبووی.

دوای ئەوەی، هەموو چیرۆکەکەی بۆ گێڕامەوە، بروسکەیەکم بۆ « مەلا مستەفا » نارد و بۆم نووسیبوو: ئەمە کارێکی جوان نییە. من لە « بەغدا » نوێنەری شۆڕشم، برادەرەکەت « عیسا سوار »، بەم شێوەیەم لەگەڵدا دەکا.
« مەلا مستەفا »ش، درێژەی بەم شتە دا و هەر بروسکە بوو، دەهات و دەچوو. « سالّح »، بە شێوەیە ئەو کێشەیەی گرتبوو، لەوانە بوو، « مەلا مستەفا » توڕەببووایە و « عیسا سوار »ی لابردایە. گوتم: بەرەلّایکەن. بەرەلّاکرا. بەلّام، ڕازی نەبوو، « عیسا سوار » لابەرن!
جارێکیان پێم گوت: « عیسا سوار »، کاری وامان بۆ دەکا. گوتی: من ناتوانم، دەمەتەقێ لە سەر ئەوە بکەم و لەوێ دەریکەم، لەبەرئەوەی، گەر دەری کەم، ئاژاوەیەکی تەواو، لەو ناوچەیە دروسدەبێ.
هەر بە ڕاستییش، لەو ڕووەوە لە سەر هەقبوو. ئەو ناوچەیە، پێویستی بە پیاوێکی زۆردار هەبوو. بەلّام، ئەو بە تەواویی، بۆگەنیکردبوو، یەکێ شتێکی بکردایە، سزایدەدا و پارەی لێ دەسەند، لە سەر حسێبی شۆڕش، بە تەواویی دەولّەمەندبووبوو.
ــ دوایی، پێوەندییتان لەگەڵ « بارزانیی »دا گەیشتە کوێ؟
لە دواڕۆژەکانی سەردەمی « مەلا مستەفا »دا، بە دوو مانگ پێش ئەوەی، شۆڕش کۆتاییپێبێ، بە شێوەیەکی تایبەتیی، داوای لێ کردم، پڕۆژەیەکی « ئۆتۆنۆمیی » بۆ بنووسم. پاشان، بۆم نووسی و بۆشم چاپکرد. گوتی: پێویستە، ئەمە تەنیا، لە نێوان خۆماماندا بێ و کەس بەم شتە نەزانێ. منیش نووسیم. وێنەیەکیشی تا ئێستە، هەر لای خۆم ماوە. ئێستەش لە بیرمە، چۆنم زانی، « بارزانیی » دەیویست، ئەو پڕۆژەیە، پێشکەش بە « کیسنجەر، نیکسۆن و شا »ی « ئێران » بکا، لەبەرئەوەی، لە کاژێری پێنجی بەرەبەیاندا، « عەبدولوهەیمەنی کوڕی شێخ سولەیمان » هات بۆ لام، کە ئێستە پارێزگاری « هەولێر »ە.
ــ ئەوە زووتربوو.
بەڵێ. نازانم، ئێستە چییە. بەلّام، ئەو کاتە، وەک « بۆی » کاریدەکرد. لەو کاتانەدا، « بۆی » وەک « پەیامبەر » وابوو.
ــ تەتەر؟.
ئا. تەتەر.
ــ لە نێوان ئێوە و « بارزانیی »دا؟

نەخێر. لە نێوان هەموو خەڵکەکەدا هەڵدەسورا. هات وگوتی: « مەلا مستەفا » دەیەوێ، سەردانی « ئێران » بکا. گوتم: یەک لاپەڕەی ماوە، وا چاپیدەکەم. گوتی: من دادەنیشم و چاوەڕێدەکەم، هەر ئێستە دەیەوێ، چونکە، جلە ئەفەندییەکانی خۆی لەبەرکردووە و چاوەڕێدەکا. دانیشت، تا تەواوبوو، پاشان، بردی.

ـ بە « عەرەبیی » نووسیتان؟

بەڵێ. پاشان، لە « تاران » هەمیشە پێکەوە بووین.

ـ دوایی، دێینە سەر ئەو باسەش.

پ7 : پێوەندییتان لەگەڵ، ئەندامانی سەرکردایەتیی و پەلیتبیرۆی « پارتیی »، پێش دووبەرەکییەکە چۆن بوو؟

و7 : پێش دووبەرەکییەکە، جگە لە « برایم، جەلال، عەبدولعەزیز شەمزینیی و عەبدولڕەحمان زوبێحیی »، کەسی دیکەم، لە ئەندامانی پەلیتبیرۆ نەدەناسی.

ـ تەنیا ئەو چوار کەسەتان دەناسی؟

بێ گومان، پێوەندییەکی دیاریکراوی دۆستایەتییشم، لەگەڵ « نووریی شاوەیس »دا هەبوو.

ـ ئەو کاتە، ئەندامی پەلیتبیرۆ بوو؟

بەڵێ. بەڵام ئەو لە « مووسڵ »، بەڕێوەبەری « ئیشغال » بوو، جاروبار دەهات. من باسی ئەو کەسانەت بۆ دەکەم، کە لە « بەغدا » دەژیان. لەگەڵ « حیلمیی عەلی شەریف »یشدا، پێوەندییم هەبوو، ئەویش لەوێ بوو. بەڵام، ئەو ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی بوو. ئەو کاتە، « حەبیب » ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی نەبوو.

ـ « جەلال تاڵەبانیی »، ئەندامی پەلیتبیرۆ بوو؟

لەو بڕوایەدام، ئەندام بووبێ.

ـ ئەدی پێوەندییتان، لەگەڵ ئەو چوار کەسەدا چۆن بوو؟

زۆر باشبوو. من هیچ کاتێ، ناکۆکیی ڕامیاریی، تێکەڵاوی دۆستایەتیی ناکەم. دەتەوێ، نامەکانی « عەزیز شەمزیی »نیت پیشاندەم؟

ـ دوایی. ئەدی دوای دووبەرەکییەکە، پێوەندییتان لەگەڵیاندا چۆن بوو؟.

پێوەندیی سۆز و خۆشەویستیی بوو. واتە: بەرانبەریان، هەستم بە دوژمنایەتیی نەدەکرد، بەڵام، هەستم بە ئازاردەکرد. چونکە، بە ڕۆیشتنی

ئەوان، « پارتیی » کادێری ڕێکوپێک و ڕاستی ونکرد. لە دەروونی خۆمدا، هەستم بە ئازار و غەم دەکرد.
– پێوەندییتان، لەگەڵ ئەندامانی پەلیتبیرۆی، پارتەکەی « بارزانیی »دا، چۆن بوو؟
ئەوە کێشەیەکی زۆر ئاڵۆزە. بێ گومان، کاتێ چووم بۆ ئەوێ، پێشوازییەکی زۆر باشیان لێ کردم. منیش، هۆی ئەو پێشوازییە گەرموگوڕەم دەزانی.
– دیارە، پێویستیان پێتان بووە؟
تا بڵێی، پێویستیان پێم بوو. هەموویان ماندووبوون. ئەمە وام لێ دەکا، باسی خۆم بکەم. لەبەرئەوەی، لە ڕێی قسەکانمەوە دەتوانین، شتێ لە چۆنێتی، ئەو پێوەندییەی نێوان من و ئەندامانی پەلیتبیرۆ هەڵێنجین،
– فەرموو. تکام وایە، زۆر بە ڕوونیی و ڕاشکاویی باسیانبکەی. لە ڕاستییدا، ئەم لایەنەم زیاتر مەبەسە.
گەر بەراوردێ، لە نێوان ئەوان و ئەو کادێرانەی، کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد »دا بکەم، ئەوانەی کارم لەگەڵدا دەکردن و لەگەڵیان ڕێکدەکەوتم، کارەساتە، کارەسات. ئێستەش دەیبینی، ئەو کارەساتە گەورەیە، هەر بەردەوامە.
– مەبەستان ئەوەیە، سەرچاوەی ئێش و ئازاربوون بۆ بەڕێزتان؟
بەڵێ. سەرچاوەی ئازاربوون. تا ئەو ڕۆژەی، لە نێو گۆڕم دەنێن، بیرم ناچێتەوە.
– یەزدان تەمەنتان درێژکا. دەکرێ، یەکەبەیەکە، لە « حەبیب »ەوە تا، پچووکترین ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییان، بە ناو باسیانکەن؟
هەوڵدەدەم. هەرگیز، دژی ئەوە نیم. پێش ئەوەی، شۆڕش دەسپێکا، جگە لە « حەبیب »، کەسی دیکەم، لەو تاقمە نەدەناسی. ئەوە، ئەو کاتەبوو، ساڵی «1959»، لە سەردەمی « عەبدولکەریم قاسم »دا خۆم شاردبۆوە. ئەمەش، بەسەرهاتێکی دیاریکراوی خۆی هەیە. یەکەم شت، لە کوردستان بەرپرسیاریی دادگەیان بەرەوڕووی من کردەوە. دوای چەن ڕۆژێ، « حەبیب »، ئەو « حەبیب »ەی کە دەزانی، چۆن بوو بە سکرتێری « پارتیی ». دەیزانی؟
– بەڵێ. لە کاتی دووبەرەکییەکەدا بوو بە سکرتێر.
بەڵام، بە درێژیی ئاگات لێیە؟
– نەخێر.

دوای ئەوەی، وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەمەوە، بیرمخەرەوە، تا، بۆت باسکەم.
بەڵێ. « حەبیب » لێپرسراوی ڕۆژنامەی « خەبات » و « دەنگی پێشمەرگە » و گۆڤاری « کادێر » بوو. هێندە ماندووبوو، دەیویست، لەو بەرپرسیارییانە خۆی ڕزگارکا. هەمووی لە ملی منەوە ئاڵاند. من بووم بە لێپرسراوی، بەشی ڕاگەیاندنی نووسینی « پارتیی ». لەبەرئەوەی، چەن زمانێکی بیانییم دەزانی، ئامادەکردنی بەرنامەکانی ڕادیۆی « عەرەبیی »یان پێ سپاردم.
پاشان، بە تەواویی باریانکردم، هەموو بەرنامەکانی بەشی « ئینگلیزیی و ئاشووریی »یشان دا بە سەر مندا. دەنگوباسەکانم، بە « ئینگلیزیی »، لە ڕادیۆوە دەخوێندەوە، دوکتۆر « مەحموود »یش، دەیکرد بە « فڕەنسیی » و پاشان دەیخوێندەوە. بەڵام، بە « ئاشووریی »، « فڕەنسۆ حەریریی » دەیخوێندەوە.
هێندێ کادێری « پارتیی »م دەبینی، لە هەر یەکێ لە جوتیارەکانی کوردستان نەزانتربوون. هیچ شتێکیان نەدەزانی. باسی هەر بابەتێک، لەگەڵدا بکردنایە، تەقەی سەریان دەهات. هەر شتێ پێوەندیی بە باری« ڕێکخستن، پارتایەتیی، پۆلێتیک و جیهان »ی دەرەوە هەبووایە، ئەوان « کەڕ، لاڵ و کوێر» بوون. تەنیا ئەوەبوو، پێشمەرگەبوون و چەکیان، بۆ کورد هەڵگرتبوو، ئەگینا، کەرێ بوون، بارە گوێزت لێ بنانایە، خڕەیان نەدەهات!
چووم بۆ پەلیتبیرۆی « پارتیی » و پێم گوتن: برایینە! « پارتیی » فەوتاوە. هەموو سەرسامبوون و سەیری یەکدییان دەکرد. گوتیان: پێشنیازت چییە؟ گوتم: پێشنیازدەکەم، پەیمانگەیەکی کادێرانی بەرز بکەینەوە. گوتیان: چی؟ تۆ دەڵێی چی؟ ئەوە لای ئەوان، شتێکی نوێ بوو! هەموو پارتێ، بە تایبەتیی، پارتە چەکدارە تێکۆشەرەکان، بە شێوەیەکی بەردەوام دەبێ، کادێر ئامادە کەن، تا، گەر سەرکردایەتییەکەیان تێداچوو، بتوانن، سەرکردایەتی ڕێکخراوەکە بە دەسەوەبگرن.
گوتم: ئێوە هەمووتان، لەو گرنگییە تێدەگەن، بەڵام دەبێ، سەرکردایەتییەکی جێگری دیکەش هەبێ. ئێمە، ئەو کەرەسەیەمان نییە. ئێوە، لە هەموو کوردستاندا، هەموو ئەندامانی لێژنەی ناوچەکان، باش دەناسن. ئەوانە، هیچ نازانن. گوتیان: کەواتە چی بکەین؟ گوتم: با پەیمانگەیەکی کادێران بکەینەوە. دیاربوو، ئەوان پێشنیازەکەیان بە دڵبوو، بۆیە گوتیان: باشە، پێڕەوەکەیمان بۆ بنووسە. ئەمە گەواهییەکە کەسیان ناتوانن، نکوولیی لێ

بکەن. منیش، هەمووویم نووسی. هەروەها، ئەو وانە و بابەتانەی، لە پەیمانگەکەشدا بڕیاربوو، بخوێنرێ، هەموویم بە نووسین پێشنیازکرد. ئەوانیش، یەکسەر پەسەندیانکرد و پارەیان بۆ بڕییەوە.
« ئیدریس و مەسعوود »یش، زۆر بە گەرمییەوە، پێشوازییان لێ کرد. پێم گوتن: من پەیمانتاندەدەمێ، بابەتە قوورسە زانستییە ڕووتەکان، لە ئەستۆی خۆم بگرم. دوو بابەتم هەڵبژارد. یەکەم: مێژووی « عێراقی ڕامیاریی ».
دووەم: « فەرهەنگی ڕامیاریی ». واتە: ئەو زاراوە ڕامیارییانەی، بە زۆریی بەکاردێنران. « هاشم عەقراویی »، بوو بە بەڕێوەبەری پەیمانگەکە. لەو کاتەدا، هیچ ئیشێکی نەبوو. خۆشەویستیش نەبوو.
ـ لە لایەن کێوە؟
لە لایەن هەموانەوە.
ـ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییش بوو؟
بەڵێ. ئەمەم لە نێوان دوو کەوانەدا بۆ دابنێ، پێویستە باسیکەم. یەکەیەکە، باسی هەمویان بۆ دەکەم. تۆ ناتەوێ، یەکیەک بیانناسی؟
ـ ئەدی کو!!!
دوای ڕێککەوتننامەی «11/مارس»، نوێنەرەکانی « پارتیی »، وەک « مەحموود عوسمان، سامیی، موحسین دزەیی، نافیز جەلال » و چەن کەسێکی دیکەش، بۆ وتووێژکردن لە « بەغدا » بوون. من و « حەبیب کەریم »، پێکەوە لە سەرەوە مابووینەوە. « حەبیب » هات بۆ لام. گوتی: « ئەحمەد حەسەن بەکر»، داوای لە « مەلا مستەفا » کردووە، بلاڤۆکێ بلاوکاتەوە، لە هەموو سەرۆک تیرە و هۆزە نەیارەکانیی و هەموو ئەو جاشانەی، چەکیان دژی شۆڕش هەڵگرتبوو، خۆش بێ. چونکە لە کاتی خۆیدا، لەوە دەترسان، « مەلا مستەفا » لێیان خۆش نەبێ.
ـ واتە: « بارزانیی »، بە ویست و ئارەزووی خۆی، ئەو کارەی نەکردووە؟
نەخێر. بە فەرمانی « سەرۆک کۆماری عێراق ـ ئەحمەد ح. بەکر » کردی.
ـ ئەمە یەکەم جارە، شتی وا دەبیسم!
ئەدی من بۆچی، ئەو شتانە بۆ تۆ باسدەکەم؟ لەو بارانەوە، من لە « برایم ئەحمەد » زیاتر، شتم لایە و دەزانم.* چونکە، ئەو لە هەموو ئەو شتانەوە دووربوو. من لە نێویاندا بووم، لە هەمان زۆنگاودا بووم. من ئێستە، ناوی دەنێم، زۆنگاو.
ـ زۆنگاوی شۆڕش؟

بەڵێ. من خۆم بە پاک نازانم و لە هیچ بەرپرسیارییەک ڕاناکەم، بەڵام، ئەو کاتە نەمدەتوانی، وازیان لێ بێنم.

– بۆ؟

لەبەرئەوەی، ئەو کاتە هەر کەسێ وازیبێنایە، بە ناپاکیان دادەنا. بەڵام، من خۆم دوورخستەوە. ئەوانیش، لە سەر پلەوپایە و شوێن، لە نێو خۆیاندا شەڕیاندەکرد. سەیر ئەوەبوو، « عەبدولوەهاب ئەتروشیی » و تاقمەکەی، لە سەر جادەکانی « ناوپردان »، بە دەنگی بەرز، جنێویان بە « دارا » دەدا. چونکە دەترسان، پارێزگاریی « سولەیمانیی » بۆ خۆی دانێ. لە لایەکی دیکەشەوە، « دارا » دەهات و دەچوو، خۆی دەکوشت، دەیویست، ببێ بە پارێزگاری « سولەیمانیی ». پاشان، باسی « دارا »شت بۆ دەکەم. کاتی خۆی، هەر زوو، خۆم لەو کێشانە دوور خستەوە. ئەو خەڵکەی لەوێ بوون، وام تێگەیاندن، کە من لە ساڵی «1970»دا ئەندامێکی جێگری کۆمیتەی ناوەندیی بووم. ڕۆژێکیان حەبیب هات و گوتی: ئەز بڵاڤۆکێکم، دەربارەی ئەو لێخۆشبوونە نووسیوە. « مەلا مستەفا » دەڵێ: با « جەرجیس » بێ، تا لەو بارەیەوە قسەبکەین. بە تەواویی لە بیرم نەماوە، « حەبیب » چی نووسیبوو. بەڵام، باشم بیرە، ئەوەی « حەبیب » نووسیبووی، خوێندمەوە. گوایە: « مەلا مستەفا »ش خوێندبوویەوە. بە « حەبیب »م گوت: هێندێ ووشە و لێکدانەوەی دیاریکراوی تێدا نووسراوە، « مەلا مستەفا » ئەوانە، لە هەموو شتێکدا ناڵێ!

– « حەبیب »، بڵاڤۆکەکەی بە ناوی « بارزانیی »یەوە نووسیبوو؟

بەڵێ. بە ناوی « بارزانیی »یەوە. گوتی: هەرچی چۆنێ بێ، تۆ بڕۆ، بزانە، ئیشەکە چی لێ بەسەردێ. نازانم، چۆن بڵاوبۆوە، گوایە: من پێوەندییم بە خوالێخۆشبوو دوکتۆر « خالید »ەوە کردووە. ئەوەی لە « هەولێر » کوشتیان، ئەوە نەبوو، پەرتووکێکی لە سەر ژنانی کوردستان نووسیبوو.

– مەبەستان لە « عەبدولخالق مەعروف »ە ؟

بەڵێ. خوا لێی خۆشبێ، برادەرمبوو. مرۆڤێکی چاکبوو. هات بۆ لام و ڕیکۆردەرێکی پێ بوو. نازانم، ئەو دەنگوباسە، چۆن بڵاوبووبۆوە، چۆنی زانی

---

* کاتی خۆی، نووسەر لە کۆتایی ساڵی « 1994 »دا، چاوپێکەوتنێکی، لەگەڵ مامۆستا « برایم ئەحمەد »یشدا سازکرد و لە ساڵی « 1995 »دا، لە شێوەی پەرتووکێکدا بڵاوکرایەوە. بۆیە، مامۆستا « جەرجیس » لێرەدا، ناوی مامۆستا « برایم » دێنێ.

بوو، من دەچم بۆ لای « مەلا مستەفا ». لە پڕ، لە دەرگەی ماڵەکەیان دام.
کردمەوە، دەبینم، « هاشم عەقراویی » بوو. هاتە ژوورەوە و هەموو گیانی
دەلەرزیی. بە شێوەیەکی سەیر دانیشت. خۆشهاتنم لێ کرد و گوتم: چییە؟
گوتی: کاکە « جەرجیس » بیستوومە، دەچی بۆ لای « مەلا مستەفا ». منیش
دەزانم، تۆ لای « مەلا مستەفا »، شوێن و ڕێزێکی تایبەتیت هەیە. من ددمەوێ،
قسەیەکی باشم بۆ بکەی.
ـ ئەمە هەمووی، دوای ڕێککەوتننامەکەی « 11/مارس » ؟
بەڵێ. پێم گوت: « هاشم »، تۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییت و چەن شتێکی
دیکەشم، بۆ باسکرد. گوتی: کاکە! من دەمەوێ، ببم بە پارێزگاری « دهۆک »
و برادەرانیش، هەرایانە لە سەری و ئەوەش مافی خۆمە. تۆ خۆت دەزانی، من
دوو مامم، لە شۆڕشدا کوژراون. یەکێکی دیکەشم، چەن ساڵە لە گرتوخانە
دایە. خۆشم لە سەرەتاوە، بەشداریی شۆڕشم کردووە. پێم گوت: دەمەوێ، بە
ڕاشکاویی، شتێک پێ بڵێم: من تۆ دەناسم و دەزانم، لە « مووسڵ »
مامۆستای سەرەتایی بووی. کاتێ پیلانەکەی « شەواف » ڕوویدا، تۆ خۆت، بە
یەکێ لە کۆمۆنیستەکان دادەنا. کاتێ گۆڕانکاریش دەسپێکرد، بەو پێیەی
تۆ، یەکێ لە پێشکەوتووخوازەکان بووی، کردیانی بە پشکنەر. واتە: بەرز
کرایتەوە. ئێستەش، بڕیاریانداوە، ببی بە بەڕێوەبەری گشتیی. ئیدی، لەوە
زیاتر، چیت دەوێ؟ گوتی: نا، من پارێزگارییەکەی « دهۆک »م دەوێ. من
دەمزانی، ژنەکەی زۆری لێ کردبوو. نامەوێ، دەربارەی ژنەکەی قسەبکەم.
ـ باش نەبوو؟
ئا. گوتم: گوێبگرە، من بۆ خۆم، داوای هیچم نەکردووە، ناشتوانم، داوای هیچ
بۆ کەس بکەم. چونکە، من « مەلا مستەفا » باش دەناسم. کاتێ، یەکێ هەوڵ
بۆ یەکێ دەدا و دەیەوێ، لە کارێکی حوکوومەتدا دایمەزرێنێ یا، پێشیخا، ئەو
ڕقی لێی دەبێتەوە. ئەو شتەی هەبوو. کاتی خۆی، « ئەحمەد حەسەن بەکر »
پێشنیازیکرد، « ئیدریس »، ببێ بە جێگری سەرۆک کۆمار. « مەلا مستەفا »
گوتی: هەرگیز، شتی وا نییە. « بارزانیی »یەکان نابێ، ببن بە فرمانبەری
دەوڵەت. من ئەوەم دەزانی. جگە لەوەی، هیچ بۆنەیەکی وا نییە، ئەو باسەی
لەگەڵدا بکەمەوە. چونکە، من بۆ کارێکی دیکە دەچم. بەڵام، گەر لەو بارەیەوە
قسەکرا، پەیمانتدەدەمێ، دەرهەق بە تۆ، قسەی باش بکەم. سوپاسیکردم و
ڕۆی.

چووم بۆ لای « مەلا مستەفا »، بە خوا، تا ئێستەش لە بیرمە، چوارچێوەی چاویلکەکەی ئاسنبوو، هەر ئەو چاوێلکەیەبوو، کاتی خۆی، لە « یەکێتی سۆڤێت » دروسیکردبوو، بە دەسییەوە گرتبوو، « عەبدوڵلا ئاغای پشدەریی » لابوو، هەستا و ڕۆی. هەر دووکمان دووقۆڵیی ماینەوە. « عەبدولخالق »یش، لە دەرەوەبوو. نامەکەم دایە. « مەلا مستەفا » هەستا، خوێندییەوە و گوتی: من ئەمەم بە دڵ نییە. من قسەی وا ناکەم. تۆ ئەم بڵاڤۆکەت خوێندۆتەوە؟
گوتم: بەڵێ.
– ئەوەی « 11/مارس » ؟
نەخێر. بڵاڤۆکی لێخۆشبوونەکەی، کە « حەبیب » نووسیبووی. گوتی: من شتی وا ناخوێنمەوە. پێم گوت: گەر من تۆزێ چاکیکەم و ڕێکوپێکیکەم، تۆ دەڵێی چی؟ گوتی: دەچم نوێژدەکەم. دوایی، قسەی لێ دەکەین.
– « بارزانیی » نوێژیدەکرد؟
نوێژی چی! با بۆت باسکەم. دوا ڕۆژی بوو، کاتێ، بۆ نەخۆشییەکەی دەیویست، سەردانی « واشنتۆن » بکا، کۆمەڵێکی پچکۆلە بووین و هەموو پێکەوە دانیشتبووین.
من و « مەلا مستەفا » بووین. « لیوا ـ کەمال عەلەمدار »یش، لای ئێمە پەنابەر بوو. هەروەها، « عەمید ڕوکن ـ تەها یاسین، موحسین دزەیی، عەلی عەبدوڵلا » و هێندێ کەسی دیکەشی لێ بوو. ئاوڕی لە « سالّح مەحموود »ی کوڕی خوشکی دایەوە، ئەو نوێژیدەکرد و بەڕۆژوودەبوو، گوتی: با دواپێک، لەگەڵ ئەم کۆمەڵەشدا بخۆینەوە. لەوانەیە، ئیدی نەیانبینمەوە. بە خوا، « سالّح » ڕۆیی و قاپێ « ویسکیی » هێنا. پێکێکی دەبڵی، بۆ « مەلا مستەفا » تێکرد، بۆ هەر یەکەش لە ئێمە، پێکێکی ئاسایی بۆ تێکردین. « مەلا مستەفا »، یەکسەر هەڵیقوڕاند.
– واتە: نوێژیشیدەکرد و دەشیخواردەوە؟
ئا. ئەوە گرفت نەبوو. « سۆفیی »یەکان، ئەو گرفتانەیان نییە.
– باشە. ئەدی بڵاڤۆکەکە چی بەسەرهات ؟
« مەلا مستەفا » چوو بۆ نوێژ. منیش دانیشتم و ئیشەکەم جێبەجێکرد. دوای ئەوەی هاتیشەوە، هەر تەماشاشی نەکرد و نەشیخوێندەوە. ئەو بڕوایەکی دیاریکراوی، بە من هەبوو. یەکسەر، ناردی بۆ وێزگە و خوێندرایەوە.
– هیچ جیاوازییەک، لە نێوان نێوەڕۆکی هەر دوو نووسینەکەدا هەبوو؟

باش لە بیرم نەماوە. بەڵام، هێندێ ووشەی نەرمی تێدابوو، شتێکی پیشاندەدا.
ـ وەک بڵێین: لاوازیی شۆڕش؟
شتێ لەو بابەتانە بوو. چی دیکەت دەوێ؟
ـ ئەوە، چاوپێکەوتنی نێوان خۆتان و « بارزانیی » بوو. بەڵام، باسی سەرکردەکانی « پارتیی »تان، بۆ تەواو نەکردم، وەک « هاشم عەقراویی ».
ئەوەمان تەواوکرد. بە هیچ شێوەیە لای « مەلا مستەفا »، باسی « هاشم »م نەکرد.
ـ باسی « حەبیب محەمەد کەریم »مان دەکرد.
کاتی خۆی، « حەبیب »، یەکەم کەسبوو، لە پەنجاکاندا، ناسنامەی کۆمۆنیستیی وەرگرت. پاشان، لەگەڵیان تێکچوو، بوو بە نەتەوەیی و هاتە ڕیزی « پارتیی »یەوە. پێوەندییم لەگەڵ « حەبیب »دا، زۆر پێوەندییەکی توندوتۆڵبوو. دوای دووبەرەکییەکەیساڵی « 1964 »، « مەلا مستەفا » ویستی، ئەو ڕووداوە، جارێکی دیکە دووبارە نەبێتەوە.
ـ مەبەستان، لە ڕووداوەکەی « برایم ئەحمەد »ە ؟
بەڵێ. ئەوە مەبەسی « مەلا مستەفا » بوو. ڕۆژێکیان، « عەلی عەبدوڵلا، نووریی شاوەیس » و هەموو ئەندامانی دیکەی، پەلیتبیرۆی « پارتیی » لەوێ بوون. « عەلی عەبدوڵلا » چەپبوو، « مارکسیی » بوو. « جەلال تاڵەبانیی »، لەگەڵ « عەلی عەبدوڵلا »دا پێکەوەبوون. لەبەردەمی خۆمدا، « جەلال » ئاوڕی لە « عەلی عەبدوڵلا » دایەوە و پێی گوت: تۆ بووی منت فێری مارکسییەت دەکرد! هەر سێکیان دەسیانکرد بە پێکەنین. گەر تۆ پەرتووکەکەی منت خوێندبێتەوە، « ئەلحەرب ئەلکوردیە »
ـ « وە ئینشیقاق 1964 ».
بەڵێ. « مەلا مستەفا »، هەر سێکیانی پێکەوە گرتبوو.
ـ وا بوو. دوایی، « عەلی عەبدوڵلا » پەشیمانبووبۆوە.
« مەلا مستەفا »، « عەلی عەبدوڵلا »ی دوو مانگ گرت. « ناهیدە »ش، لای « مەلا مستەفا »، هەوڵی بۆ « نووریی شاوەیس » دا، بەرەڵایانکرد و گرفتەکە کۆتاییپێهات. هەروەها، « عەبدولعەزیزی شەمزینیی »، لەبەرئەوەی، کوڕی « شێخ عەبدولقادر » بوو، یەکسەر، بەریدا و گوتی: برۆ. چونکە، کێشە و باسی تیرەگەریی، ڕۆڵی خۆی هەیە.

ـ بەڵێ. ڕاستە. « بارزانیی » پێشتریش، لە « سۆڤێت » دەیناسی.
بەڵێ. وا بوو. « مەلا مستەفا » ویستی، کۆمیتەی ناوەندیی دامەزرێنێ و بە دەس خۆیەوە بێ. ئەو کاتە، « حەبیب » لە شۆڕشدا نەبوو، بەڵکوو لە « بەغدا » بوو. « مەلا مستەفا »، لەو کاتەوە « حەبیب »ی دەناسی، کە لە ڕۆژنامەی « خەبات » کاریدەکرد. نازانم، چۆن بیری لەوە کردەوە و پەسەندیکرد!
نامەیەکی بۆ نارد بۆ « بەغدا ». بۆی نووسیبوو : وەرە دەرەوە و لە نێو شۆڕشدا کاربکە. وەک بیرم بێ، « حەبیب » ئەو کاتە، لەگەڵ « یەدوڵلا عەبدولکەریم »، پێکەوە کاریاندەکرد و لقی پێنجی « بەغدا »یان بەڕێوەدەبرد. ئەو کاتە هێشتا، « حەبیب » ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییش نەبوو.
ـ « یەدوڵلا » برای « حەبیب » بوو؟
نەخێر. هەر دووکیشیان، لە کوردە « فەیلیی »یەکان بوون. لەوانەیە، لە یەک تیرە بووبن. پاشان، « حەبیب » هات. « بارزانیی »، « حەبیب »ی بە سەردا سەپاندن، تا، سەریان پێ شۆڕکا و قسەیان بۆ نەمێنێتەوە. واتە: تا پێیان بڵێ، من ئەم پیاوەم هێنا، کە ئەندامی کۆمیتەی پشکنین بوو، کردم بە سکرتێری « پارتیی ».
ـ ئەوە لە کاتێکدا بوو، « نووریی شاوەیس، عەلی عەبدوڵلا، دوکتۆر مەحموود و سامیی » لەوێ بوون و « بارزانیی »، هیچ بایەخێکیشی پێ نەدان.
نا، ئەو کاتە هێشتا، « سامیی » هیچ نەبوو. « کۆمۆنیست » بوو، پەنای بۆ شۆڕش هێنابوو، لە خۆی دەترسا، لە سەر کێشەی « مووسڵ »، دوو جار، بە گرتنی هەمیشەیی و کارکردنی قوورس، فرمانی گرتنی درابوو، ئەویش، ڕای کردبوو.
ـ لە لایەن حوکوومەتەوە؟
بەڵێ.
ـ باشە. کەواتە، لە باسی « حەبیب » بووینەوە؟
نەخێر. ئینجا « حەبیب »، هەر چەند پێشکەوت، بەڵام، هەمیشە هەستی بە لاوازیی خۆی دەکرد. لەبەرئەوەی، « بەغدا »ی لەکیسچووبوو، زۆر دڵتەنگ و بێتاقەت بوو. خۆی پیاوێکی شارییبوو، حەزی بە خواردنەوە، دانیشتن و ڕابواردن دەکرد. تەنانەت، زۆر جار، بە من و هێندێ کەسی دیکەشی دەگوت: منیان بە سوخرە گرتووە و بە زۆر هێناویانم. هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، ئەمە، هەموو قسەکانی ئەو پیاوە بوون!

« حەبیب »، باش دەینووسی. واتە: نووسینەکانی باشبوون. بە تایبەتیی، دوایی گوتارێکیت دەدەمێ، کە لە سەر من نووسیوێتی و جنێوی زۆری پێ داوم، لە سەر ئەوەی، دەربارەی « فیدرالیزم »، ڕای خۆمم دەربڕیبوو، پێش ئەوەی بگەڕێیتەوە، کۆپییەکی ئەوەشت دەدەمێ.
بەڵام، گەر باسی « عەلی عەبدوڵڵا » بکەین، نزیکەی پشگوێخرابوو. واتە: دانیشتنیان پێ گەرمدەکرد. کاتێ، کۆبوونەوەدەبوو، بۆ ئەوەی، دەمەتەقێبکەن و بیروڕا وەربگرن، ئەو دەنگی نەدەدا و چاوەڕێیدەکرد، تەماشایدەکرد، ژمارەی پەنجەکانی دەژمارد و یەکسەر، دوای دەنگی زۆربە دەکەوت.
ـ واتە: پیاوێکی بێ هەڵوێستبووە؟
لە ڕاستییدا، نازانم چی بوو. « عەلی عەبدوڵڵا » مرۆڤێ بوو، لە هەموو گرفتێ خۆی دووردەخستەوە. لەبەرئەوە، لە هەموو ژیانی ڕامیاریی خۆیدا، هیچ ناخۆشییەکی نەدیوە. هەمیشە، وەک قاڵب وابوو، لەگەڵ هەموو شتەکاندا، دەقیدەگرت و خۆی دەگونجاند. نازانم، بڵێم چی! بەڵام، لەو بڕوایەدام، تەواو نەبوو، کەموکوڕیی لە مێشکیدا هەبوو، زۆر ڕقهەڵگر و دڵڕەش بوو.
ـ ئایا، شتێکی تایبەتییتان لە سەری هەیە، بۆمان باسکەن؟
بەڵێ. چەن چیرۆکێکی دووروودرێژ و پانوپۆڕی زۆری، لای من هەیە. بەڵام، لە سەر کێشەی پارێزگاریی « سولەیمانیی »، شتێک بۆ باسدەکەم. « عەلی »ش دەیویست، ببێ بە پارێزگاری « سولەیمانیی ».
ڕۆژێکیان، من لە ڕۆژنامەی « تەئەخی » کارمدەکرد. ئەویش لەوێ، لە پەلیتبیرۆی « پارتیی » بوو. « عەزیز عەقراویی » هات. ئەو کاتە، « عەزیز » لای « مەلا مستەفا »، پلەوپایەیەکی گەورەی هەبوو. بێ گومان، « عەزیز » هاوڕێمبوو، بە شێوەیەکی بێ سنووریش، ڕێزی لێ دەگرتم. ئێستەش، هەمیشە نامەم بۆ دەنێرێ، من بە مامۆستای خۆی دادەنێ. منیش، بە شێوەیە قسەم لەگەڵدا دەکرد، وەک چۆن، قسە لەگەڵ شاگردێکی خۆمدا دەکەم. ئەویش، بە هەموو سنگفراوانییەکەوە، لێی قەبووڵدەکردم، لەبەرئەوەی، دڵی زۆر باشبوو. بەڵام، شێتبوو، زۆر زوو توڕەدەبوو، خێراش ڕازیدەبوو، توانایەکی فراوانی گەورەی هەیە. بەڵام بە داخەوە، ناتوانێ، کەڵکی لێ وەرگرێ. کەم چیکڵدانەیە و هێمن نییە، هەر ڕۆژەی، لە سەر بیروباوەڕێکە و هەڵبەزودابەزدەکا. لە پڕ هات، خۆی کرد بە ژوورا و گوتی: بە خوا، باوکی باوکی بە نەحلەتدەکەم. پێم گوت: « عەزیز » کێ؟ گوتی: ئەوەی لەوێ

دانیشتووه. گوتم: مەبەست « عەلی عەبدوڵڵا »یە؟ گوتی: بەڵێ. پێم گوت: ئێوە هەر دووکتان، ئەندامی پەلیتبیرۆن! دەسیکرد بە پێکەنین. زۆر ڕقی لێی بوو. گوتی: ئا ئەو ڕەشەوڵاخە دەیەوێ، ببێ بە پارێزگاری « سولەیمانیی ». هەر کەسێ، لە بازاڕەکانی « سولەیمانیی » بگری، گەلێ لەو زیرەکترە. جا، هەر لە ڕاستییشدا وایە، دانیشتووانی « سولەیمانیی »، خەڵکێکی شارستانیی و پێشکەوتوون، خەڵکێکی هوشیارن. واتە: ئەوە شتێکی گاڵتە نییە.
تۆ خەڵکی « سولەیمانیی »ت؟
- بەڵێ.
من نەشمزانی، تۆ خەڵکی ئەوێی. بەڵام، بەرزترین دەستە لە نێو کورددا، لە ڕووی زیرەکیی و تواناوە، لە نێو خەڵکی « سولەیمانیی »دا هەڵکەوتوون. کەس لە هیچ شتێکدا، فریایان ناکەوێ.
گوتی: « عەلی عەبدوڵڵا »، ئێستە هاتووە و دەیەوێ، ببێ بە پارێزگاری « سولەیمانیی ». لەو شتەدا، « عەزیز » هەقیبوو. بەڵام، پەلیتبیرۆ لە نێو خۆیاندا، بووبوون بە دوو بەشەوە. واتە: پێوەندییان، وەک چیرۆکی « جبە و خەنجەر »کە وابوو. عەرەبەکان، « جبە » لەبەردەکەن خەنجەرەکانیشیان، لە دواوە پێیە، هەر یەکەی دەیەوێ، ئەوی دیکەیان داپاچێ. گەر چیرۆکەکانی ئەوانت بۆ بگێڕمەوە، پێویستی بە سێ تا چوار ڕۆژ هەیە. منیش پێم گوت: تۆ بۆ خوت داوەتە فەرمانبەریی؟ لەبەرئەوەی، کاتی خۆی دەمزانی، « عەزیز » پارێزگاری « سولەیمانیی » ناوێ. بەڵام، چونکە « عەلی عەبدوڵڵا» دەیویست، نامەیەکی بۆ « مەلا مستەفا » نووسیبوو، پێی گوتبوو: من دەمەوێ، بۆ پارێزگاری « سولەیمانیی » بمپاڵێوی. ئەو لە کاتی خۆیدا، بەپێی ئەوەی خوێندبووی و بەگوێرەی ئەو بڕوانامەیەی هەیبوو، بۆ پلەی لیوا بەرزکرابۆوە و بە سەرکردەی تیپی هەشت دانرابوو، کە تەنیا لە سەر کاغەزبوو، جگە لە چادرێکیش، هیچی دیکەی نەبوو. جلی سەربازییشی لەبەر نەدەکرد و دەوامیشی نەدەکرد.
- مەبەستان لەوەیە، لە سەر کورسیی پارێزگاری « سولەیمانیی »، لە نێوان ئەندامانی پەلیتبیرۆدا، پێشبڕکێیەکی زۆر هەبوو.
نەک هەر لە سەر ئەوە، بەڵکوو، لە سەر زۆر شتی دیکەش، ناکۆکییان هەبوو.
- من تەنیا مەبەسم، لە پۆستی پارێزگاری « سولەیمانیی »یە، لە نێوان « دارا تۆفیق، عەلی عەبدوڵڵا، عەبدولوەهاب و عەزیز عەقراویی»دا، ئەو بەزمەهەبوو.

بەڵێ. بەلام، پاشـان « دارا » وازی لە داواکـارییـەکـەی خـۆی هێنا. چونکە دەیزانی، دای نانێن، لەبەرئەوەی، ئەو « کـۆمـۆنـیـسـت » بوو. من کـاتی خـۆی دەمزانی، تەنانەت، گەر « عـەزیز »یش بە پارێزگار دانێن، خـۆی نایەوێ، هەر نەشدەچوو. خـۆی چاک دەیزانی، توانا و بەهرەی بەڕێوەبردنی نییە. بەلام، لە ڕقی « عـەلی » ئەوەی دەکرد. پێم گـوت: « عـەزیز »، برام! واز لەو بەزمە بێنە. گوتـی: بە خـوا! باوکی باوکیشی بە نەحلەتدەکـەم. پاشـان، ملی ڕێی گرت و ڕۆی.
دوای ماوەیەگی کـەم، « مـەحـموود عـوسمان » هاتە ژوورەوە. ئەو کاتە، ئەویش لە « بەغـــدا » بـوو. بە پێکەنـینەوە گـــوتـی: لای تۆ بوو؟ گـــوتم: بـەڵێ. لەو سـەردەمانەدا، من و « مـەحمـوود »، نێوانمان زۆر باشبوو. گوتم: چیتە؟ گوتی: بە خـوا، ئەوە مـاوەی دوو کاژێرە، لەگـەڵ « عـەزیز »دا پیاسـەدەکەم و دەمـەوێ، ڕازییبکەم، واز لە داواکارییـەکـەی خـۆی بێـنـێ و ئەو گرفتـە چارەسـەرکـەین. بەلام، کـەڵکی نییـە. « مـەحـمـوود عـوسـمـان » دەیویسـت، « عـەلی عـەبدوڵڵا » دانرێ. بۆ؟ چونکە، « عـەلی » لاوازبـوو، ئەویش دەیتـوانی بە ئارەزووی خـۆی و چۆنی بوێ، وا یاری پێ بکا.
پێی گـوتم: نـاتوانی، لەو کێشـەیەدا هەوڵێبـدەی و چارەسـەرێبدۆزیتـەوە؟ پێم گـــوت: لە بەر خـــاتری تۆ، هەوڵدەدەم، لـەبەرئەوەی « عـــەزیز »، شـــایانـی ئەو شـوێنە نەبوو. جا، هەر لە ڕاسـتییشدا وابوو. تەمـاشـاکە، چ گاڵتەبازاڕێبوو! هەمووی هەر گەمـەکردنبوو! شتێ نەبوو، ناوی مـافی گەل و « پارتیی » بووبێ، هەرگـیـز، شـتـی وا نەبوو، نـە دەنگی هەبوو، نە ڕەنگی هەبوو. هێـرشـیـان، بۆ سـەر فەرمانبەریی دەبرد، وەک چۆن هێرش، بۆ سەر لاشـەیەکی مردوو دەبەن.
ـ وەک جرۆجانەوەر!
ئا، ئا. بەو شێوەیە، هێرشیاندەکرد. پێم گوت: هەوڵدەدەم. دوکتۆر« مەحموود» دەیـزانـی، « عـــەزیز » چەن ڕێز لە من دەگـــرێ، لەبـەرئـەوە هات بۆ لام، تا یارمەتییبدەم. « عەزیز »یش، فەرهەنگێکی بە دەسەوەبوو، هەمیشە، پێویستی بە من بوو. کـاتێکیش، لە « مـــووسڵ » پارێزەربووم، زۆر بە ناوبانـگبـــووم و دەینـاسـیـم. مـەبەسـم ئەوەیە، ئەو کـەسـانەی لـەوێ بوون، منیـان دەناسی. تەنانەت، « فوواد عارف »، هەمیشە سەری لێ دەدام.
« فوواد عارف » دەناسی؟
ـ بەڵێ.

ئەویش، لە شۆڕشدابوو، گوتی: « جەرجیس »، خەڵک لەم شۆڕشەدا، دوو جۆرن. جۆرێکیان: کاتی خۆی شتبوون و ئێستە هیچ نین. جۆرەکەی دیکەشیان: کاتی خۆی هیچ نەبوون، بەڵام ئێستە، بوون بە شت. من و تۆ، لە جۆری یەکەمیانین. بەڵام، تۆ خەفەت مەخۆ. پێم گوت: کێ دەڵێ، من خەفەت دەخۆم؟ ئەو کاتێ ئەو شتانەی دەبینی، زۆر ئازاریدەدا. ئەم گۆچانە جوانەش، یادگاری دۆستایەتییمانە و خۆی پێشکەشیکردم، تا ئێستەش، هەر ماومە.
دوای ماوەیەی، « عەزیز » هاتەوە. پێم گوت: ئادەی لە بەر چاوم، نامەیە بۆ « مەلا مستەفا » بنووسە و بڵێ: من پۆستی پارێزگاییم ناوێ، شوورەییە بۆ تۆ! گوتی: بۆ؟ تۆش بووی بە برادەری ئەو؟ نازانم. چیان لە نێواندا هەبوو! گوتم: من نە هاورێی ئەوم و نە هیچ. تۆ خۆشت دەزانی، ئەو پیاوە، پلەوپایەی لای من چۆنە، چەن ڕووداوێکی دیاریکراوی تایبەتیی هەیە، نامەوێ بیان درکێنم، ناشیرینە. پێی گوتم: من پارێزگاییم ناوێ، چی لێ بکەم. کێش دەڵێ، ئەوەی من نووسیومە، « مەلا مستەفا » پەسەندیدەکا! لەبەرئەوە، ئەو شتە، لە بیری خۆت دەرکە. پێم گوت: تەواو؟ لە بیر خۆمی بەرمەوە؟ گوتی: بەڵێ، وازی لێ بێنە. گوتم: بچۆ بۆ لای « مەحموود عوسمان » و پێی ڕابگەیەنە. گوتی: هەقی « مەحموود عوسمان »ت نەبێ. دوای ماوەیە، چووم بۆ ماڵی « عەلی عەبدوڵڵا ». سەیرمکرد، دانیشتووە و نامە دەنووسێ. لەوە دەچوو، زۆری نووسیبێ و فڕێیدابێ. چونکە، سەبەتەکەی بەردەمی، پڕ کرد بوو! پرسیم: چی دەکەی؟ گوتی: بە خوا، دەربارەی پارێزگارییەکە دەمەوێ، نامەیە بۆ « مەلا مستەفا » بنووسم. من تازە نامەوێ. گوتم: نا، پێویست ناکا. ئەو پیاوەمان، لە بەزمەکە دەرێنا و کێشەکە تەواوبوو. دوایی، بوو بە پارێزگار. بەڵام، خەڵکی « سولەیمانیی »، نوکتەیان لە سەر دادەنا، بیستووتە؟
– بەڵێ. « خاڵە ڕەجەب »، نوکتەی لە سەر دانابوو. ئەدی تێبینییەکانت، لە سەر دوکتۆر « مەحموود » چییە؟
لە « بەغدا »، دوکتۆر « مەحموود »م نەدەناسی. ئەو کاتە، لە « بەغدا » ستاژێر بوو. واتە: دوا ساڵی کۆلێژی پزیشکیی بوو. جاروبار، سەری لە بارەگای « پارتیی » دەدا. پاشان، پێوەندیی بە شۆڕشەوە کرد و هەڵات. ئەو کارەشی، بە بڕوایەکی تەواوەوە کرد.
– وا بزانم، ئەویش لە سەرەتادا هەر « کۆمۆنیست » بوو.

بەڵێ، « کۆمۆنیست » بوو. بەڵام، وازی لە « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » هێنا. دوکتۆر « مەحموود »، مرۆڤێکی تا بڵێی زیرەکە. زیرەکییەکەی، نەک هەر ئاسایی نییە، بەڵکوو، لە سەروو ئەوەشەوەیە. جگە لەوەی زیرەکە، توانایەکی سەرسوورهێنەری سەیری، شت وەرگرتنی هەیە، واتە: کاتێ تۆ، لە بارەی بابەتێکی دیاریکراوەوە، قسەی بۆ دەکەی، ئەو شتە، چاکەکانی پوختەدەکا و دەتوانێ، بیانگۆڕێ و کەڵکیان لێ وەرگرێ. لە هەمان کاتیشدا، خوێنەوارە و دەخوێنێتەوە. کاتێ، زمانی « فرەنسیی » فێربوو، وەک « فرەنسیی »یەک، قسەی پێ دەکرد. هەروەها، لە دواییشدا، خۆی فێری « ئەڵمانیی » کرد.
« مەحموود »، هەمیشە دەیویست، خۆی بۆ سەرکردایەتیی، پەروەردە و ئامادە بکا. من ناڵێم، شارەزاییم، لە لێکۆڵینەوەی دەروونناسییدا هەیە، من سایکۆلۆژیست نیم. بەڵام، لە سەردەمێکی دیاریکراوی شۆڕشدا، پێوەندییم لەگەڵ « مەحموود عوسمان »دا، لە پێوەندیی هەر کەسێکی دیکە گەورەتربوو.
ـ پێوەندیی دۆستایەتیی؟
نەخێر. تەنیا پێوەندیی دۆستایەتیی نەبوو، بەڵکوو، لە ڕووی بیروباوەڕیشەوە، لە یەکدییەوە نزیکبووین. من بە هەموو بڕوایەکەوە دەڵێم: ئەو پیاوە کادێرێکی باشبوو. بەڵام، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا، هەستمکرد، پیاوێکە، ئیرادەی لاوازە. توانای خۆڕاگرتنی نییە. هەر کەسێ، لێی نزیککەوێتەوە و مەرایی بۆ بکا، زوو دەیخەڵەتێنێ و باوەڕی پێ دێنێ. ئەوەش ئەوەبوو، کە « سامیی » پێی کرد. ئەوە خاڵێکی لاوزای، زۆر گەورەبوو. لەبەرئەوەی نەیدەزانی، « سامیی » کێیە؟ ئەو وەک کەسێکی، خواپەرستی سادە وابوو، هەر کەسێ بهاتایە، ئەو کارەی پێ دەکرد. من پێوەندییم لەگەڵیدا توندبوو. هاوکارییمان، لە سەر ئەو بنچینەیە دامەزرابوو. بەڵام، من لەگەڵ « سامیی »دا جیاوازبووم. چونکە، من شێوە و ڕێی « سامیی »م نەبوو. لەم دواییانەشدا، کەمێ لە خۆی گۆڕا و لوتبەرزیی پەیداکرد. « محموود »، لەبەرئەوەی پزیشکبوو، هەر زوو لە « مەلا مستەفا » نزیککەوتەوە.
ـ واتە: بەهۆی پیشەکەیەوە ئەو نزیکییەی پەیداکرد.
بەڵێ. بەهۆی کارەکەیەوە. پاشان، وردەوردە، بوو بە نهێنگری. هەموو ئەو کاتانەی، « مەلا مستەفا » بە نهێنیی، سەردانی « ئێران »ی دەکرد، دوکتۆر « مەحموود »ی لەگەڵ خۆی دەبرد.
ـ زمانیشی دەزانی؟

فێری « فارسیی »یەکی زۆر باشبووبوو، بە ڕێکوپێکی، قسەی پێ دەکرد. من بەو شێوەیە، پێوەندییم لەگەڵ « مەحموود »دا مایەوە، تا « تاران »ی بەجێ هێشت. تەنانەت، هێندێ شتی نهێنیی و بەڵگەنامەی دامێ، کە پێوەندیی، بە گفتوگۆی یەکەمی « دارا »وە هەبوو، بە دەسوخەتی « دارا » خۆی نووسراوە، بەو زووانە چاپیدەکەم. هەروەها، لیستی پارەکانی دامێ، کە بە ناوی شۆڕشەوە وەرگیرابوون و بە ناوی کوڕەکانی « مەلا مستەفا »وە تۆمارکرا بوون. ئەوانەم هەموو هەیە.

ـ پارەکە چەن بوو؟

تکایە، من نامەوێ، لێرەدا لەو باسە بدوێم. لەبەرئەوەی، بە لامەوە گرنگ نییە. با وازی لێ بێنین. دوکتۆر « مەحموود » خۆی دەزانێ، چەن بوو. لەوانەیە، من ڕۆژێ لە ڕۆژان بیڵێم. بەڵام ئێستە، لەم چاوپێکەوتنەدا نامەوێ، بیدرکێنم.

ـ بەڵێ باشە. وەک تۆ دەفەرمووی، گرنگ نییە!

کەی « مەحموود » کەوت؟ کێ خستی؟ « سامیی » خستی. چۆن؟ دوای ئەوەی « سامیی »، گەیشتە پەلیتبیرۆ، ویستی، جێگەکەی « مەحموود » داگیرکا، لەو کارەشدا ســـــــــەرکەوت. چونکە، کەڵکێکی تەواویی، لە خاڵە لاوازەکانی « مەحموود » وەرگرت. دوایی، لە باسی « سامیی »دا، لەمەش دەدوێین. کاتێ وەک نوێنەر، چوون بۆ « بەغدا »، « سامیی »شیان لەگەڵدا بوو. « مەحموود » بە تەواویی، هەســـتی بە بارودۆخـــەکــە نەکـــردبوو. ئەو نوێنەرانەی وەک کۆمیتەیەک، بۆ وتووێژ بۆ « بەغدا » چووبوون، سەرۆکێکیان نەبوو. بەڵام، کاتێ گەیشتنە ئەوێ، « مەحموود » یەکسەر خۆی بە جێگری « مەلا مستەفا » و سەرۆکی کۆمیتەکە دانا. لەو کاتانەدا، لەگەڵ « ئەحمەد حەسەن بەکر » و لێپرسراوانی دیکەی حوکوومەتدا دەردەکەوت. هەمیشە، لە پێش « ئیدریس و مەسعوود »ەوە دەڕۆیشت. من، لە چەن دانیشتنێکدا ئامادەبووم و ئاگاداری ئەو هەواڵانە هەم. بەڵام، پێش ئەوەی، ئەو شتانە ڕووبــــــدا و من ئامادەبم، « سامیی » لە « بەغدا »وە، دوو کەسی لێ هاندابوو.

ـ « ئیدریس و مەسعوود » ؟

بەڵێ. « سامیی » پێی دەگوتن: « مەحموود »، پێش ئێوە دەکەوێ و ئێوەی، دوای خۆی خستووە. وا دەردەکەوت، ئەوانیش، بۆ باوکیان نووسیبوو، گوایە: « مەحموود »، زیاد لە بەڕەکەی خۆی، پێی لێ ڕاکێشاوە! « سامیی »، بەردەوام بەو شتانە، مێشکی پڕدەکردن. لە یادمە، ڕۆژێکیان، لەگەڵ « مەلا

مستەفا »دا دانیشتبووین. نوێنەرەکان، هێشتا لە « بەغدا » بوون. « سامیی » یەکێکی ناردبوو، دوکتۆرێکی کوردی « فەیلیی » بوو، هێشتا خوێندکاربوو، لە « ئەڵمانیا » دەیخوێند، ناوەکەیم لە بیرچۆوە، بەڵام، یەکدیمان بینیوە. مرۆڤێکی هێندە خراپبوو، هێشتا، لەوە خراپترم نەدیوە. نامەیەکی بۆ « مەلا مستەفا » هێنابوو. « مەلا مستەفا »، نامەکەی کردەوە و خوێندییەوە. دانیشتبوو، بە شێوەیەکی ئاسایی، قسەیدەکرد. پاشان، لاسایی « مەحموود عوسمان »ی دەکردەوە. لە سەر کورسییەکی بەرز دانیشتبوو، قاچەکانی نەدەگەیشتنە سەر زەویی و پێدەکەنی. « مەلا مستەفا »، ئارەزووی پێکەنینی هەستابوو. دەسیپێکرد و گوتی: هەر ئەو قسەدەکا، هەر ئەو فەرماندەردەکا، هەر ئەو وەزارەتەکان دیاریدەکا و دابەشیاندەکا. لەم جۆرە قسانە ... تاد.

« مەلا مستەفا »، نەریتێکی سەیری هەبوو. گەر ناکۆکییەک، لە نێوان دوو کەسدا، لە سەر شتێ دروسبووایە و بە شەڕ بهاتنایە، یەکسەر، مافی بەوە دەدا، کە یەکەم جار هاتۆتە لای و هانای بۆ هێناوە. ئەمەش، نەریتێکی خێڵەکییە. ئەم بیرەشی، لە چییەوە هێنابوو؟ ئەم بیرەی، لەوەوە وەرگرتبوو، دەیگوت: هەموو کاتێ، پێش ئەوەی زۆردار، هاواری لێ هەستێ، یەکسەر، زۆرلێکراو دەقیژێنێ. واتە: شتێکی سایکۆلۆژیی تێدابوو.

ماڵەکەی من، لە خوارەوە بوو. بەڵام، ماڵەکەی « مەحموود »، بە سەد مەترێ، لە سەروو منەوە بوو. شەوانە، لە بەر چرا دادەنیشتم، ئاگام لە هیچ نەبوو. شەوێ، چوومە دەرەوە. دەبینم: هێشتا، ژوورەکەی دوکتۆر « مەحموود » رووناکە. من دەمزانی، باری دەروونیی زۆر خراپە. « سامیی » هەواڵی کشانەوەی ناردبوو. یەکسەر کشانیانەوە. چووم بۆ لای. لە بارێکدا بینیم، پیاو بەزەیی پێدا دەهاتەوە. ئەو شەوە، بە تەنیا هەر منی لابووم. دەسیپێکرد، قسەی بۆ دەکردم. من قسەکانیم بە دڵ نەبوو. پێم گوت: « مەحموود » نازانم، لەوە دەچێ، تۆ نووستبی و ئاگات لە « مەحموود »ی بێ زەوا نەبێ! تۆ هیچ، ئاگات لەو پیلانانە هەیە، دژی تۆ دەگێڕرێ؟ من ئەمەم بە ڕاشکاویی پێ گوت. چونکە لە ڕاستییدا، خۆشمدەویست و هاونشینییمدەکرد. بەڵام بە داخەوە، چەن ڕووداوێکی دیاریکراو خوڵقا، نامەوێ، لێرەدا باسیانکەم. ئەو ڕووداوانە، دڵنیایکردم، « مەحموود » کەسێکە کەمێ ترسنۆکە وئازایەتی ڕووبەڕووبوونەوە و قسەکردنی تێدا نییە. ئەوەش دەربارەی دوکتۆر « مەحموود »، تەواو؟

ــ باشە. دەربارەی « سامیی »، چی دەزانن؟

من له سەرەتاوە، « سامییم »م نەدەناسی. له ساڵی « 1959 »دا، براکەم له « بەغدا » ئەندازیاربوو. ڕۆژێکیان هات بۆ لام. ئەو کاتە، هەڵبژاردنی سەندیکای ئەندازیاران بوو. پێی گوتم: پیاوێ هەیە، ناوی « محەمەد مەحموود عەبدولڕەحمان »ە و ئەندازیارە. له « ئینگلتەرە» گەڕاوەتەوە. له کاتی هەڵبژاردنی، سەندیکای ئەندازیاراندا دەیویست، لیستی پیشەدارەکان دەرچێ. ئەویش، لیستی « کۆمۆنیست »ەکان بوو. وەک یەکێکی پیلانگێڕ دانیشتبوو، بە سەر ئەم و ئەودا دەیقیژاند و هاواریدەکرد. زۆر چالاکبوو. دیارە کۆمۆنیستە. دەڵێن: « مووسڵاویی »یە و خەڵکی « ژەنگار »ە. پیاوێکی ڕەق و توند و خراپە و لەم بابەتانە. گوتم: بە خوا، من نایناسم. ئەوە یەکەم جاربوو، ناوی « سامیی » ببیستم.

هێندە دەزانم، « سامیی » کاتی خۆی، ئەفسەری یەدەک بوو. له کاتی هەراکەی « شەواف »دا، له « تەلەعفەر» دامەزرابوو. لەوێ، ئەندامی لیژنەی ناوچەی « پارتی کۆمۆنیست » بوو. کاتێ، پیلانەکەی « شەواف » ڕوویدا، ئەفسەرەکان ڕایانکرد. بەڵام، وەک دەڵێن، پێش ئەوەی، خۆیان بگەیەننە سەر سنوور، گرتیانن و هێنایاننەوە بۆ « تەلەعفەر » و فەرمانی له سێدارەدانیان بە سەردا دان. هێندێکی دیکەش دەڵێن: هێنایانن بۆ « مووسڵ » و فرمانەکەیان له سەر دەرکردن. بێ گومان، « سامیی » لەو کوشتارەدا گوناحی نەبوو. بەڵام دیارە، ئەو بە هۆی ئەوەی، لەو لیژنەیەدا کاریدەکرد، ناسراوبوو، بۆیە گرتبوویان. هەرچی چۆنێ بێ، تۆ دەزانی، ئەوە فرمانی دادگە کاتییە تایبەتییە سەربازییەکانە، بە ئارەزووی خۆیان، بڕیاردەدەن و بڕیارەکەشیان، زۆر کوێرانەیە. له ئەنجامدا، بێ ئەوەی، خۆی لەوێ بێ، دوو جار بە گرتن و کارکردنی هەمیشەیی، بڕیاری دەسگیرکردنی دەرچووبوو. بەڵام، ئەو خۆی لەوێ نەبوو، چۆن ئامادە نەبوو؟ چۆن خۆی دەربازکرد؟ نازانم چ جۆرە فێڵێکی، بەکارهێنابوو.

کاتێ، دوای کۆدەتاکەی « 1963/2/8 »، « بەعسیی »یەکان، دەسیان بە « کۆمۆنیست » گرتن کرد، ناوی ئەویش، له لیستەکەدا هەبوو. لەو کاتەدا، ئەویش گیرابوو. بەڵام نەیاندەزانی، ئەوە ئەو « سامیی »یەی، سەندیکای ئەندازیارانە، کە بە دوایدا دەگەڕێن. له یادمە، پێش ئەوەی بمگرن، چونکە، دوای کۆدەتاکەی « فێبروەریی »، من هەشت ڕۆژ له دەرەوە مامەوە، ئیدی، منیش گیرام. « حەبیب و یەدوڵڵا عەبدولکەریم » هاتن بۆ لام و گوتیان:

زۆریان لە ئەندامانی « کۆمۆنیست و پارتیی » گرتووە. دەوروبەری چوارهەزار کەس گیرابوو. ئەوان هاتن بۆ لام، نارەزاییەک بنووسین. من چاپمکرد و دام بە « حەبیب »، تا پێشکەشیانکا، منیش هێشتا، هەر خۆم حەشاردابوو. حوکوومەت پێی گوتبوون: گوێ مەدەنێ، بارودۆخەکە، بە تەواویی شڵەقاوە و کەس بە کەس نییە، ئێوە برۆن، هەموو گرتووخانەکان بگەڕێن، هەر کەسێ، سەر بە « پارتیی » بوو، بەرەڵایکەن. بەو شێوەیە، چووبوون بۆ یاریگەیەک، نزیکەی شەش هەزار کەسی تێدا گیرابوو. یەکێ لەوانە « سامیی » بوو. ئەم قسانە، پیت بە پیتی « سامیی » خۆی بۆی گێڕاومەتەوە.
ـ بەڵێ. فەرموو.
« سامیی » گوتی: کاتێ لیژنەکەم بینی، لە دڵی خۆمدا گوتم، بەم ڕێگەیە خۆم ڕزگار نەکەم، هەرگیز، ڕزگارم نابێ. گوتی: یەکسەر، چوار پێنج کەسم کۆ کردەوە و خۆم لەگەڵدا ڕێکخستن، تا گەر دەربارەی من، لێیان پرسین، گەواهییم بۆ بدەن، منیش ئەندامی « پارتیی »م. خێرا، چووم بۆ لای ئەفسەری سەربازگەکە و پێم گوت: ئێمە، ئەندامی « پارتی دێمۆکراتی کوردستان »ین و ئێوە بێ ئەوەی، جیاوازیی لە نێوانماندا بکەن، ئێمەتان گرتووە. کاتێ لیژنەکە هات، ئێمە یەک کۆمەڵبووین، هەموومان چووین بۆ لایان. ئەفسەرەکە گوتی: بەریاندەن. ئیدی، یەکسەر دەرچووم. گوتی: دەمزانی، دوای ماوەیە، هەست بە هەڵەی خۆیان دەکەن. لەبەرئەوە یەکسەر پێوەندییم، بە مامەوە « عەبدۆ عەبدولڕەحمان » کرد. ئەو، هەم مامی بوو، هەم خەزوریشی بوو. پێم گوت: دەمەوێ، یارمەتیمبدەی و بچم بۆ کوردستان. ئیدی ڕامکرد. وەک خۆشی گوتی، هەر واش دەرچوو، ڕۆژی دووەم، هەستیان بە هەڵەکەی خۆیان کردبوو، بە دوایدا گەڕابوون. من بە بیری خۆم، وەک یاساناسێ، وام بیردەکردەوە، لەو کاتانەدا، « پارتیی » بە نهێنیی کاریدەکرد، کەسکەسی نەدەناسی و کەسیش، ناسنامەی تایبەتیی ئەندامێتی « پارتیی » پێ نەبوو، تا پیشانی لیژنەکەی بدا. لەبەرئەوە، « سامیی » کەڵکی لەو هەلە وەرگرتبوو. لە ڕاستییشدا هەر واشبووە. پاشان، گەیشتبووە کوردستان. سەرەتا، هیچ نەبوو، پەنابەرێکی ئاسایی « کۆمۆنیست » بوو. دەسی بە کارکردن کرد. سەرکردایەتی شۆڕشیش، کاریان بە « کۆمۆنیست »ەکان دابوو، کەڵکیان لە توانایان وەرگرتبوو. لەگەڵ « سەلیم فەخریی »دا کاریکردبوو. « سەلیم » دەناسی؟
ـ ناوم بیستووە.

پێکەوە لە یەک پۆلدا بووین، هاوڕێیەکی نزیکبووین، مرد. لە سەردەمی « عەبدولکەریم قاسم »دا، بەڕێوەبەری وێزگە بوو. یەکێ لە « کۆمۆنیست »ە ناسراوەکان بوو. « پارتیی »، لە دەرەوە کاریان پێ سپاردبوون، لەبەرئەوەی، کادێری باش و نووسەریان نەبوو. ئەوانیش، دەسیان بە نووسین کرد. دەربارەی ئەو شتانە، لە پەرتووکی « عێراق فی عەهد قاسم »دا نووسیومە. تۆ پێویستە، هەموو پەرتووکەکانی من بخوێنیتەوە، گەر نەیانخوێنیتەوە، ناتوانی، دەربارەی ئەو شتانە بنووسی.

– زۆربەی بەرهەمەکانتم خوێندۆتەوە.

بەلآم، بە سەر ئەو شتانەدا بچۆرەوە.

« سامیی » گوتی: وەک نووسەر، کاریان پێ سپاردین و بەکاریاندێنایین. دیارە، « سەلیم » و « سامیی »، گوتاریان بۆ وێزگەکە دەنووسی.

« عەلی سنجاریی »، خزمی « سامیی »یە و لە هەمان تیرەن. ئەو کاتە « عەلی سنجاریی »، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی « پارتیی » بوو. گوتی: ڕۆژێ « سامیی » هات بۆ لام و پێی گوتم: کاکە بە داخەوە، من وا هەستدەکەم، « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »، گەلی کورد، بە ئامانجە نەتەوەییە ڕاستەقینەکانی خۆی ناگەیەنێ. لەبەرئەوە، ئێستە من پێوەندییم، لەگەڵ « پارتی کۆمۆنیست » پچڕاندووە، دەمەوێ، لە ڕیزەکانی « پارتیی »دا کاربکەم. پێم گوت: خۆشهاتی و فەرموو. ئەوەش، وێنەی من و « عەلی سنجاریی »یە، بە پشتی سەرتەوە هەڵواسراوە.

– بەڵێ، دەزانم.

« عەلی » گوتی: پێشنیازمانکرد، لە ماوەی دیاریکراوی خۆیدا، بە پاڵێوراویی مایەوە و پاشان، بوو بە ئەندام. بێ گومان، من ئەو کاتە لە گرتووخانە بووم. گوتی: ڕۆژێکیان « حەبیب » هات و پێی گوتم: کۆمەڵێ هەواڵنێری بیانیی هاتوون، دوکتۆر « مەحموود عوسمان » لێرە نییە. « مەلا مستەفا » داوای وەرگێڕ دەکا. منیش گوتم: ئەو کوڕەی خزمم لێرەیە، لە « ئینگلتەرە» دەرچووە و « ئینگلیزیی »یەکی باش دەزانێ و دیالێکتەکەشی « کرمانجیی »یە. «حەبیب » گوتی: باشە، با بێ. تۆ نازانی، « سامیی »، یەکێ لە خۆی گەورەتربێ، چۆن مەرایی بۆ دەکا و سەرنجی، بە لای خۆیدا ڕادەکێشێ. شێوازی زۆر گرنگ و سەیری، لەو بوارانەدا هەیە. گوتی: بردمان، دەسیکرد بە وەرگێڕان، زۆر لەگەڵیان دانیشت و مایەوە.

دوای ئەوەی، چاوپێکەوتنەکە تەواوبوو، خەڵکەکە ڕۆیشتن، « مەلا مستەفا » ئاوڕی لێ دامەوە و گوتی: « عەلی »، ئەمە کێیە؟ گوتم: بە خوا، ئەوە خزممە و ئەندامێکی تازەی « پارتیی »شە. گوتی: باشە. تۆزەتۆزە، لە « پارتیی »دا پێشیخەن. ئیدی لەو کاتەوە، ژیانی ڕامیاریی « سامیی » لە « پارتیی »دا دەسپێیکرد. « عەلی سنجاریی » خزمی یارمەتییدا، بەڵام، « سامیی » دوایی، ناپاکیی بەرانبەر کرد. لە « عەلی »یان دا. « عەلی سنجاریی »، یەکێ لە قوربانییەکانی « سامیی » بوو.

ـ ئەوە کوورتەیەکی، مێژوویی ژیانی « سامیی » و چۆنێتی پێوەندییکردنی بە شۆڕشەوە بوو، ئەدی، تێبینییەکانی خۆتان لە سەری چییە؟

« سامیی »، وەک پیاوێکی ڕامیار، پۆلێتیکی « پارتی کۆمۆنیست »ی جێبەجێ دەکرد. بۆ ئەوەی سەرکەوێ و بە پلەکانی سەروو بگا، دەسی لە هیچ جۆرە، شێوازێ نەدەگێڕایەوە. هەمان شێواز و ڕێگەکانی، « پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێت »ی بە کاردێنا. هەموویان بەو شێوەیە، بە پۆستەکانی پارتی گەیشتوون.

ـ واتە: لە سەر ڕێبازی « ماکیافیللیی » بەڕێوەدەڕۆی.

بەڵێ. هێندێ جار، گەر پێویستبووایە، دەس ماچکا، هیچ شەرمی نەدەکرد. هێندێ جاریش، گەر وا پێویستیکردایە، وەک زۆردارێکی خوێنڕێژ، خۆی پیشاندا، بۆ ئەوەی، دەسەڵاتی خۆی بە تەواویی بچەسپێنێ، هەرگیز، یەک و دووی لێ نەدەکرد. کوڕێکی زیرەکە، توانا و دەسەڵاتێکی تایبەتیی هەیە، ئەو شتانە یارمەتییدەدا، ئاواتە تایبەتییەکانی خۆی بەدیبێنێ. هەرگیز، لە ڕوودا دانامێنێ و ئامادەیە، لە پێناوی ئامانجەکانی خۆیدا، پێ بە پەراسوو و بڕبڕەی پشتی، هەموو کەسێکدا بنێ و وردوخاشیانکا. بۆیە، بە لایەوە گرنگ نییە، ئەوانە دوژمنی بن، یا دۆستی بن، لەنێویانبەرێ.

ـ واتە: گێرەشێوێنە؟

ووشەی گێرەشێوێن، لەو باسەدا بەس نییە. وەک « دیاگۆ »ی پاڵەوانەکەی چیرۆکی « ئۆتێلۆ »ی « شەکسپیر» وایە. ئەوە بخوێنەرەوە، کەسایەتیی ئەو، بە تەواویی، وەک کەسایەتیی « سامیی » وایە. ئاگات لەوە هەیە، « عەلی عەسکەریی، دوکتۆر خالید و شێخ حوسێن بابە شێخ »ی، لە « هەکاریی » کوشت؟

ـ بەڵێ. وەک دەڵێن: « شێخ محەمەدی هەرسین »یش، هەر ئەو کوشتی.

خوێنی « شێخ محەمەدی هەرسین »، لە ملی « سامیی » دایە.
ـ لە ملی « سامیی » دایە، یا لە ملی خۆی دایە؟
ئۆباڵەکەی بە گەردنی « سامیی »یە. چونکە، ئەو فرمانی کوشتنەکەی دەرکرد و « عەبدوڵڵا ساڵح » جێبەجێیکرد. « شێخ هەرسینیی » برادەرمبوو. نەک هەر برادەرمبوو، بەڵکوو، هێندێ مافی دیاریکراوییش، لە نێوانماندا هەبوو. پیاوێکی ڕاست و چاک بوو. من لە بەر ڕێزم، بۆ بیرەوەرییەکانی ئەو پیاوە، تا « گەلاوێژ »ی خێزانیی و منداڵەکانیم دەرکرد و هێنامن بۆ ئێرە، کارێکی زۆرم کرد و تەنیا، بە توانای خۆم، ئەو کارەم بەئەنجامگەیاند. لەبەرئەوەی، لە بارێکدا بەجێیهێشتن، پیاو گریانی بۆیان دەهات.
ـ بۆ پارەی نەبوو؟ هێندێ کەس، لە بارەی « شێخ محەمەد »ەوە دەیان گوت: لە شۆڕشدا دزبوو، ئایا ئەوە ڕاستە؟
دزی چی و تەڕەماشی چی! بازرگان بوو، بازرگانیی بۆ شۆڕش دەکرد. دەهات بۆ لای من، نووسراوەکانم بە « ئینگلیزیی » بۆ کۆمپانییەکان بۆ دەنووسی، لەوە زیاتر هیچی دیکە نەبوو. « مەلا مستەفا »، زۆری خۆش دەویست، پلەوپایەیەکی تایبەتیی، لای « مەلا مستەفا » هەبوو. دوای ئەوەی، بە یەکجاریی هاتین بۆ « ئێران »، دەهات بۆ لای و ئەویش، لێی دەپرسی: چیت دەوێ؟ ڕۆژێکیان پێی گوت: من هیچ شتێکم ناوێ. من پیاوێکم دەمەوێ، لە بازرگانییدا کاربکەم. بەڵام، گرفتێکم هەیە، ئەویش: کێشەی ڕەگەزنامەکەمە، لەبەرئەوە ناتوانم، ئیشبکەم. گەر یارمەتیمبدەی و ڕەگەزنامە « ئێرانیی »یەکەم بۆ جێبەجێکەی، زۆر سوپاستدەکەم. ئەویش گوتی: باشە. ئیشەکەی بۆ کرد. پاشان، بازرگانییدەکرد و ماڵەکەشی لە نێو « کەرەج »دا بوو. « شێخ محەمەد » خۆی، خەڵکی گوندی « هەرسین »ی « ئێران » بوو.
بەسەرهاتەکەی دەزانی، چۆن هاتن، بردیان و کوشتیان؟
ـ بەڵێ. ئەوەی من بیستبێتم، لە کاتی ناشتنی تەرمەکەی « بارزانیی »دا بوو.
نەخێر. وا نییە. دیارە نایزانی. کاتێ « سەرکردایەتی کاتیی ـ ئەلقیادە ئەلموەقەتە » دەیانویست، کاری ڕامیاریی دەسپێکەنەوە، پێویستیان بە پارە بوو. بەپێی ئەو پڕوپاگەندانەی هەبوون، دەیان گوت: هەموو پارەی فرۆشگەکانی شۆڕش، لای ئەو بوون. لەبەرئەوەی، ئەو بەرپرسی دارایییبوو. ساڵی «1974»، لە کاتی شۆڕشدا، بیرۆیەکی تایبەتیی، لە « تاران » هەبوو.
ـ بەڵێ. وایە، خۆم دیومە و ناوی بازاڕی « حوسێنیی » بوو.

له ڕۆژی چلەکەی « مەلا مستەفا »دا، بە حسێب، بچن بۆ « شنۆ »، لە دەرگەی ماڵەکەیان دا و پێیان گوت: کامێراکەت بێنە و وەرە، تا پێکەوە بچین بۆ کوردستان. گوتی: باشە. کامێراکەی هەڵگرت و ڕۆیشت. لە ناشتنەکەیدا نەبوو. چونکە، لە ناشتنەکەیدا ئێمە پێکەوەبووین. ئیدی بردیان و لەوێ ونیان کرد. دوای ئەوەی، لێیان دابوو، کوشتبوویان. ژنەکەی دەهات و دەچوو. لە دوا شتدا، من لای « شێخ محەمەد خالیدی کوڕی شێخ ئەحمەد » دانیشتبووم، ژنەکەی هات، سۆراخی مێردەکەی دەکرد و لێی پرسی. « شێخ محەمەد خالید »یش، زۆر تووڕەبوو. پێی گوت: دایکەکەم! ئیدی مەیە بۆ ئێرە و لەوە زیاتر مەگەڕێ، بڕۆ پرسەی بۆ دانێ، مرد. ئەویش دەسیکرد بە گریان، هەستا و ملی ڕێگەی وەبەرگرت. « گەلاوێژ» خۆی ماوە و ئاگای لە هەموو شتێ هەیە.
ـ بەڵێ دەیناسم. ئایا« شێخ محەمەد خالید » بۆ کوشتنەکەی پێی ناخۆشبوو؟
نەخێر. خەفەتی بۆ نەدەخوارد. بەڵام، زۆر تووڕەبوو، ئەو دژیانبوو.
ـ ئەدی، دەربارەی « نووریی شاوەیس »، دەڵێن چی؟
هەرگیز، نکوولیی لەوە ناکەم، « نووریی »، مرۆڤێکی نیشتمانپەروەر و زیرەک بوو. ئەوە کەلەپووری بنەماڵەکەیان بووە. هەر چەندە، لە « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »دا ئەندامبوو، بەڵام، لەو بڕوایەدام، لە کێشەی دووبەرەکییەکەدا، لە « برایم »، مێشکی کراوەتر، سنگی فراوانتر و نەرمتربوو. چونکە، وا هەستی دەکرد، لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا بمێنێتەوە، گەلێ باشترە، لەوەی لە ژێر سایەی حوکوومەتدا بێ. واتە: لەو باوەڕەدابوو، دەتوانێ، ڕاژەیە پێشکەش، بە کێشەی کورد بکا. بە پێچەوانەوە، نەک لەبەرئەوە بووبێ، « مەلا مستەفا »ی بە شێوەیەکی ئاسایی، خۆشویستبێ، یا، پێی باشتربووبێ، کار لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا بکا، وەک لەوەی، لەگەڵ « برایم »دا کاربکا. نەخێر. بەڵام من، لەو بڕوایەدام، هۆی ئەمەش دوو شتبوو. یەکەم: گەر لە شۆڕشدا بمێنێتەوە، پاشە ڕۆژی شۆڕش باشتردەبێ. دووەم: بەپێی بیروباوەڕە « مارکسیی »یەکەشی، ئەو ڕێیەی، بە ڕێیەکی ڕاستر دەزانی.
ـ تۆ بڵێی، بە ڕاسپاردەی « پارتی کۆمۆنیستی عێراق »، لەگەڵ « بارزانیی » بووبێ؟
ئەوەیان نازانم، دەسی ئەوانی تێدابووە، یانا! هێندەی من ئاگادارم، « مەلا مستەفا »، « مەسعوود محەمەد »ی، بە سەر « پارتی کۆمۆنیست »دا سەپاند و کردی بە سکرتێر.

ـ « مەسعوود محەمەد » یا « عەزیز محەمەد » ؟
« عەزیز ». من ئەوەم ئاگا لێیە و لێشی دڵنیام. ئەو یەکێکی نارد بۆ لایان و گوتی: دەبێ، « عەزیز محەمەد » ببێ بە سکرتێرتان.
ـ لە جێی « بەهادین نووریی » ؟
بەڵێ. چونکە « مەلا مستەفا »، چارەی « بەهادین نووریی » نەدەویست.
ـ چۆن، « بارزانیی » ڕقی لە « بەهادین نووریی » بوو؟
ئـــۆی! بە هیچ شێوەیە، خۆشی نەدەویست. دەتەوێ، بزانی، چی لە بارەیەوە دەگوت.
ـ بەڵێ.
بە نووسین دەتەوێ، یا خۆم بۆت بخوێنمەوە؟
ـ بە ئارەزووی خۆت.
« مەلا مستەفا »، « بەهادین نووریی » بانگکرد، داوای لێ کرد، هەڵوێستی خۆیان، بەرانبەر کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد » دیارییکەن. ئاگاداریکردن و سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشان، هیچ جۆرە پردێ، لە نێوانیاندا دروس نەکەن، پۆلێتیکێکی ڕاست و ڕەوان بەکاربێنن و پێچوپەنای لەگەڵدا بەکار نەهێنن.
« بەهادین »یش، دەسی بە ڕاووڕێوی هێنانەوە کرد. ڕاستەوخۆ، هیچی بە دەسەوە نەدەدا. « بارزانیی »ش، بە شێوەیەکی توندوتیژ پێی گوت: یا دەبێ، ئێوەی « کۆمۆنیست »، ئەم ناوچـــەیە بەجێبێڵن، یا دەبێ، دژی کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد » شەڕبکەن. « بەهادین نووریی »، کۆبوونەوەکەی بەجێهێشت و ڕۆی. « بارزانیی »ش، ئاوڕی لە خەڵکەکە دایەوە و گوتی: گەر ئەو پیاوە بکوژرێ، « کۆمۆنیست »ەکان دنیامان لێ دەوروژێنن و هیچیشیان پێ ناکرێ، دواییش دەڵێن: « بارزانیی »، سەرکردەیەکی « کۆمۆنیستیی » کوشت، ناڵێن: « بەهە » کەچەڵی کوشت. بە دڵتبوو؟
ـ باسی « نووریی شاوەیس »مان دەکرد.
کاتێ « نووریی »م ناسی، من پارێزەربووم. ئەویش، بەڕێوەبەری « ئیشغال »ی « مووسڵ » بوو. پێوەندییمان باشبوو. هێندێ جار، بانگیدەکردم و پێکەوە دادەنیشتین، بەڵام نازانم، بۆ وا بوو! لەوە دەچـــــوو، « کۆمۆنیست »ەکانی « مووسڵ » پێیان گوتبێ، هەموو شت، لای من باس نەکا و ئاگای لە خۆی بێ. کاتێ، دەربارەی هێندێ کێشە قسەماندەکرد، بە پارێزەوە قسەیدەکرد. ئەو کاتە، ئێمە پێکەوە، لە یەک ڕێکخراوادا کارمان نەدەکرد. دوایی، شتێکی

دیاریکراو ڕوویدا، هەر چەندە، دۆستایەتییمان مابوو، پێوەندییمان باشبوو، بەڵام، یەکسەر هەستمپێکرد، کەمێ لە من دوورکەوتەوە و زیاتر، لەگەڵ « کۆمۆنیست »ەکاندا دەڕۆی، دڵی بۆیان لێیدەدا و داکۆکیی لێ دەکردن.
پێم گوتی: کاتی خۆی، پێش ڕێککەوتنامەکەی «11/مارس »، لێپرسراوی بەشی ڕاگەیاندنی شۆڕش بووم. « بەعسیی »یەکان دەیانویست، لەگەڵ « ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات »دا، پێوەندیی دامەزرێنن. نوێنەرەکانیان هاتن بۆ « بەغدا »، تا، لە سەر چۆنێتی دامەزراندنی ئەو پێوەندییە، گفتوگۆبکەن. هەواڵنێری ڕۆژنامەی « ئەلجمهوریە »، چوو بۆ لایان و چەد پرسیارێکی لێ کردن. یەکێ لەوانە ئەوەبوو، ڕاتان بەرانبەر شۆڕشی کورد و « مەلا مستەفا » چییە؟ نوێنەرەکانی « ئەڵمانیا »ش، بە ئارەزووی خۆیان، نرخیان بۆ دانابوو. گوتبوویان: ئەوە یاخییبوونە، دەوڵەتە سەرمایەدارییی و کۆنەپەرستەکان دەیان بزوێنن و لە نێو ئەو خولیا تەسکانەدا دەجوڵێنەوە. کاتێ، ڕۆژنامەکەیانم پێگەیشت، یەکسەر، ناردم بۆ « مەلا مستەفا ». گوتارێکیشم، لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی « خەبات »دا نووسی و لە سەر ئەوە، هێرشمکردە سەر « ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات ». ئەمە لە ساڵی « 1969 ـ 1970 »دا بوو.
ـ واتە: پێش ڕێککەوتنەکە بوو؟
بەڵێ. ئیدی، زەویی ژێروژووربوو! بەو خوایەی دروسیکردووین، « ساڵح یوسفیی » نەیدەزانی، لە دیوەخانان چ باسە! بەڵام، « عەلی عەبدوڵڵا و نووریی شاوەیس »، لێیان تیژکردبووم. یەکەم جار، « ساڵح »یان نارد. دوایی، هەر دووکیان هاتن. ڕەخنەیان لێ گرتم، گللەییەکی زۆریان کرد و گوتیان: چۆن گوتاری وا دەنووسی و هێرش، بۆ سەر « ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات » دەبەی؟
ـ « ساڵح یوسفیی » گوتی؟
بەڵێ. من « ساڵح »م چاک دەناسی، لای هەموو شۆڕشیش، ناسراوبوو، هەمووشیان دەیانزانی، تەنیا هەر من دەتوانم، دەماریبگرم. واتە: لە کاتێکدا، هەموو لێی دەترسان و پێیان دەگوت: « سەییدا! » نەمدەهێشت، قسەبکا و ڕامدەکێشا. بۆ نموونە: کاتێ، « مەحموود عوسمان » دەیزانی، « ساڵح » دێ بۆ لای من، دەیگوت: تۆ تەمبێیبکە. گوتم: « ساڵح »، تۆ چی تێدەگەی؟ تۆ ئەو شتانەت خوێندۆتەوە؟ هێندێ جاریش، لێی توورە دەبووم. پێم گوت: ئەمانە بگرە و بیخوێنەرەوە. گوتی: باشە. دوایی، « نووریی شاوەیس » گەڕایەوە و گوتی: ئەوانە ڕاست نین، تۆ چۆن، هێرش بۆ سەر« ئەڵمانیای دیمۆکراسیی »

دەبەی؟ پێم گوت: کاکە! ئەمە وا نابێ، با پێت بڵێم، یەکێ لەم دوو شتە، بەدەر نییە. ئەو شتەی لە ڕۆژنامەکەدا بڵاوکراوەتەوە، من لای خۆمەوە ئامادەم، قوتییدەمەوە و داوای لێبوردنیان لێ بکەم، گەر ئەوان گوتیان، ئێمە قسەی وامان نەکردووە. « پارتی کۆمۆنیستی عێراق » و « عەزیز محەمەد »یش لێرەن، گەر ئەو باسەیان بەلاوە گرنگە، با بێن بۆ لام. گوتم: دەمەوێ، لە یەکدی تێبگەین. « عەزیز محەمەد » هات، ئەویش گوتی: ئەوە شتێکی ڕاست نییە. ئەو کۆمۆنیستانە شتێکی سەیربوون، تیشکی ڕۆژیان دەبینی، بەڵام دەیانگوت: کوا هیچ دیار نییە! شتێکی سەیرە! من نازانم، تۆ کۆمۆنیستیی، یا مارکسییت، یا هیچیان نیت، نازانم؟

- ئەوەیان خوا دەیزانێ.

گوتم: گوێبگرە « عەزیز »، ئێوە بۆ بەخۆڕایی، ئەم گێژەڵوکەیەتان دروس کردووە؟ ئەوانە، تازە نرخی ڕامیاریی خۆیان بە دەسەوەدا. دەیانەوێ، پێوەندیی دیپلۆماسیی دامەزرێنن. زۆر لە مێژە، پارتە کۆمۆنیستە دەسەڵاتدار و فەرمانڕەواکانی وڵاتە سۆسیالیستەکان، تەنانەت « یەکێتی سۆڤێت »یش، لەوان خراپتربوون. لەگەڵ « هێتلەر »دا ڕێک نەکەوتن؟ « ڕۆبنتروپ »، لەگەڵ « مۆلۆتۆف »دا دانەنیشت و لەگەڵ « نازیی »یەکاندا پەیماننامەیان ئیمزا نەکرد؟ وا نییە؟

- بەڵێ. ئاگادارم. لە سەردەمی « ستالین »دا، لە نێوان خۆیاندا ڕێککەوتن و خاکی « پۆڵۆنیا »یان دابەشکرد.

گوتم: ئێمە، هەموو شتێ بە نرخی خۆی هەڵدەسەنگێنین. گوتی: بڕوا ناکەم، بەو شێوەیەبێ. گوتم: باشە. ئێمە واز لەو شتە دێنین. بەڵام، ئێوە لە ڕۆژنامەکەتاندا بنووسن، ئێمە پێوەندییمان بە « ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات »ەوە کردووە. ئەوان وەڵامیانداوەتەوە و دەڵێن: شتی وا لە ئێمەوە دەر نەچووە. ئەو کاتە، من ئەوە پەسەنددەکەم. ئیدی، هەموویان ڕۆیشتن. « نووریی شاوەیس » بەو گوتارە، زۆر زویر و تووڕەبووبوو. دوا جار، زۆر تووڕەیکردم، گوتم: تەواو، من وازدێنم. هەر کاتێ، ناوی وازهێنانم دەبرد، هەموویان دەلەرزین.

- ئاخر دەیانزانی، « بارزانیی »، دوا بڕیار لە سەر ئەو شتانە دەدا و لەوانەیە، لێشیان زویر و تووڕەبێ!

نازانم. ئەو شتانە، لای « مەلا مستەفا » بوو، یا نا! بەڵام دەیانزانی، لە من زیاتر، کەسی دیکەیان نییە، کاریان بۆ بکا. لەبەرئەوە، ئەوە گەورەترین

گرفتی ئەوان بوو. چونکە، من دوای ئەوە، ئەرکێکی دیکەم بەسەرداکەوت، جگە لە پەیمانگەی کادێران، پێشوازییم لە ژۆرنالیستە بیانییەکان دەکرد و کوورتەیەکم لە بارەی کورد و شۆڕشەوە بۆ باسدەکردن. هەر ئەوەشبوو، وای لێ کردم، لە باری سایکۆلۆژیی ئەندامانی پەلیتبیرۆی « پارتیی » تێبگەم.
« مەحموود عوسمان و سامیی »، لەبەرئەوەی، زمانی بیانییان دەزانی. پێش ئەوەی، من بچمە دەرەوە، کاتێ ژۆرنالیستەکان دەهاتن، هەر ئەوان قسەیان دەکرد، هەموو ئەوانی دیکەیان، مۆڵدابوو. لە بەر چاوی ژۆرنالیستەکان، خۆیان وا پیشاندەدا، تەنیا سەرۆکی تاقانەن.
بەڵام، کاتێ من چوومە دەرەوە، هەموو سەرکردایەتی « پارتیی » دەهاتن بۆ لام، هەموو ئەو کادێر و فەرماندەی هێزانەش، سەردانیاندەکردم و دەیان بینیی، ژۆرنالیستەکان هاتوچۆی من دەکەن، ئەوانیش، هەر یەکەیان، بەسەرهاتێکی تایبەتیی سەیریان هەبوو. منیش، پێشکەشی ژۆرنالیستەکانم دەکردن، هەر یەکێ، هەر شتێکی گرنگی کردبووبێ، من بۆم باسدەکردن. ئەوانیش، زۆر سوپاسیان دەکردم. بۆ نموونە: ڕۆژێکیان « شێخ رەزای گولانیی » هات بۆ لام. دەیناسی؟
ـ بەڵێ. خزمایەتییمان هەیە.
خزمتە! « شێخ رەزا » پێی گوتم: ئەی کاکە « جەرجیس !»، بە خوا تۆ، شۆڕشێکت لێرە بەرپاکردووە. پێم گوت: شۆڕشی چیم کردووە؟ گوتی: کاتی خۆی، ژۆرنالیست و بیانییەکان دەهاتن، ئێمە، زمانمان نەدەزانی، کەس باسی ئێمەی نەدەکرد. ئەوانەی زمانیان دەزانی، ئێمەیان، بەوان نەدەناساند، تەنیا، قسەیان بۆ خۆیان دەکرد. « شێخ رەزا »، پیاوێکی کراوە و قسە لە ڕوو بوو. لە گرتووخانە، هەر دووکمان پێکەوەبووین. هەمیشە دەیگوت: «جەرجیس» شەترنجی فێرکردم. کاتێ، « سەرکردایەتی کاتیی » دامەزرا، « نووریی شاوەیس » لە « لەندەن » بوو. بە هاوکاریی لەگەڵ « سامیی »دا، لەگەڵ « سەرکردایەتی کاتیی »دا کاریاندەکرد. دوایی، لە « پارتیی » دەرچوون و کاتی خۆی پێکەوە، پەرتووکی « ئەلبەدیل ئەلسەوریی »یان دەرکرد.
ئەوان، هۆی تێکشکاندنی شۆڕشەکەیان، بۆ لادان لە « مارکسیزم و لێنینزم » دەگێڕایەوە!!! ئاگات لێیە، چۆن بوو؟!! ئەوەش، کۆمێنتارێکی زۆر گەورەی تایبەتیی، خۆی هەیە. من نامەوێ، هەموو شتێ لێرەدا، باسکەم، لەبەرئەوەی، هەمووی لەو پەرتووکەدا دەنووسم. « نووریی » لە « لەندەن » مایەوە. منیان

داوەتکرد بۆ لای خۆیان. « ناهیدە »ش، ئەو کاتە لەوێ بوو. هەروەها « ڕۆژ » و برا گەورەکەشی لەوێ بوون.
- « ڕەنج ».
بەڵێ. مەبەسم ئەوەیە، پێوەندییمان، هەمیشە بەردەوامبوو. پێوەندییەکی باشمان، لە نێواندا هەبوو، ڕێزی یەکدیمان دەگرت.. چـــــونکە، من خۆم، « نووریی شاوەیس »م خۆشدەویست، لەبەرئەوەی، لە بیروباوەڕی خۆی، لای نەدەدا و زیرەکبوو. لە هەمان کاتیشدا نەیدەویست، لە سەر حسێبی خەڵکی دیکە، پێشکەوێ، لێیاندا، خۆی بە پلەوپایە بەرزەکان بگەیەنێ و دەسیان بەسەردابگرێ.
- بەڵام، من لەوە ناگەم، چۆن لە یەک کاتدا، ئەندامی هەر دوو پارتـــــــی « دیمۆکرات و کۆمۆنیست »ەکانیش بوو؟
ئەوەیان، من ناتوانم، وەڵامـتـبـدەمـەوە، هێندێ شت هەیە، ناتوانم، وەڵامی بدەمەوە. بەڵام، ئەوە شتێکی ڕاستە و لە « پارتی کۆمۆنیست »دا ئەندامبوو.
- بەڵێ. دەزانم ڕاستـە. تەنانەت « بەهادین نووریی »ش، لە یاداشتـەکـەی خۆیدا، باسی ئەوە دەکا. ئەدی، ڕاتان بەرانبەر « دارا تۆفیق » چۆنە؟
ئۆف ! ئۆف ! من کـاتـێ، « دارا »م ناسی، « پارتیی » نەبوو، بەڵام، سـەری شۆڕشی دەدا. بێ گومان، « دارا » خزمی ژنەکەی « ئیدریس » بوو. یەکەم جار، لەو ڕێگەیەوە، پێوەندیی لەگەڵ شۆڕشدا پەیداکرد، دەهات، لەگەڵ کاربەدەسانی شۆڕشدا قسەیدەکرد و بیروڕای دەگۆڕییەوە. خۆی کۆمۆنیست بوو. ئەو و « سامیی »، هەر دووکیان پێکەوە، لە « لەندەن » دەیانخوێند. هەر دووکیان لە نێوان خۆیاندا، هاوکارییاندەکرد.
- برادەربوون؟
هەر برادەر نەبوون، بەڵکوو، هاوڕێی خـوێندن بوون و پێکەوە، لە « پارتـی کـۆمـۆنیـسـتی عـێـراق »دا کـاریاندەکـرد. چوار دانە ساڵ، لە « پارتی کۆمۆنیست»دا پێکەوەبوون. دوایی، خوێندنیان تەواوکرد و پێکەوە گەڕانەوە. بێ گومان، ئەو کاتەی، ئەو پێوەندیی لەگەڵ شۆڕشدا دامەزراند، من لەوێ نەبووم، من گیرابووم. چونکە، وەک بیستم، پێوەندییەکە لە ساڵی «1966»دا دروسبوو. وا دەردەکەوێ، « دارا » پێی گوتبێ: من دەتوانم، پێوەندیی لە نێوان شۆڕش و « یەکێتی سۆڤێت »دا دروسـکەم و یارمەتیی بۆ شۆڕش پەیداکەم. « مەلا مستەفا » پیاوێ بوو، یارمەتیی لە ڕاست و چەپ وەردەگرت. پیاوی

کاربوو. له هەموو دەوڵەتەکان، یارمەتیی وەردەگرت، هەر له « ئیسرایل و ئێران »ەوە، تا « یەکێتی سۆڤێت ». وا پێ دەچێ، « یەکێتی سۆڤێت »یش، لەو بارەیەوە، هیچ زانیارییەکیان نەبووبێ. « دارا »، ئەو بیرەی لای ئەوان چاند. بۆ؟ چونکە دەیویست، له هەر دوو لایان نزیککەوێتەوە، تا خۆی، بە سەر هەر دوو لایاندا بابدا، چاکەی بە سەر هەر دوولایانەوە هەبێ و لای هەر دوو لاشیان، پلەوپایە پەیداکا.

ـ واتە: لای « سۆڤێت » و لای « بارزانیی »ش.

بەڵێ. توانیبووی، پەیمانیان لێ وەرگرێ، لە ماوەیەکی کەمدا، وێزگەیەک بێنن. « دارا »، ئەوەی بە « مەلا مستافا » ڕاگەیاندبوو، ئەویش گوتبووی: بەڵێ، ئێمە پێویستمان، بە وێزگەیەکی بەهێزە. چۆن دەیگوێزنەوە و چۆن دەیهێنن، سێ ساڵ درێژەیکێشا. دوایی، وازیان لێ هێنا. وا بزانم، پاشان، پارەیان دەنارد، ساڵی شەست هەزار دۆلاریان بۆ دەناردین. ئەوەش پارەیەکی زۆر کەم بوو. بەلاّم، « مەلا مستەفا » باوەڕێکی هەبوو، دەیگوت: مادام ئەو پێوەندییە، لەگەڵ « سۆڤیەت »دا دروسبووە، پێویست ناکا، بپچڕێنرێ. کاتێ منیش، ساڵی « 1968 » چوومە دەرەوە، « دارا » هێندێ جار دەهات، دوو سێ ڕۆژ، یا هەفتەیەک دەمایەوە و پاشان دەگەڕایەوە. سەری لە منیش دەدا و چەن کاژێرێ لام دەمایەوە. بەو پێیەی دەیزانی، من لەوێ، شوێنێکی تایبەتییم هەیە و بایەخم پێ دەدەن. نازانم، لەوانەیە وای زانیبێ، من بۆ ئەو کارە هانیدەدەم. من هەر ڕۆژەی، بۆ ئەم پرۆسێسە و بۆ ئەو نەخشەی بەڕێوەبردنە، جۆرە پلانێکی دیاریکراوم هەبوو، واتە: پلانێکی نەگۆڕم نەبوو.

ڕۆژێکیان کتوپڕ، لە ساڵی « 1970 »دا، « دارا »، جلی چاکەتوپانتۆڵی لەبەرکردبوو، هات و گوتی: کاکە من دەمەوێ، ماڵاواییت لێ بکەم. دەچم، گفتوگۆ لەگەڵ « بەعس »دا دەکەم. چۆن لە « بەعسیی »یەکان نزیککەوتەوە و گفتوگۆی لەگەڵدا دامەزراندن، باسێکی زۆر دوورودرێژە. بەلاّم، وا دەردەکەوێ، بە شێوەیەکی بەردەوام، ڕاپۆرتی ناردبێ. ئەو ڕاپۆرتانەی، بە خەتی خۆی نووسراون، هەموویانم هەیە. کاتی خۆی، « مەحموود عوسمان » دایمێ. منیش، فۆتۆکۆپیم کردوون. لەم پەرتووکەی ئەم جارەدا، بڵاویان دەکەمەوە.

« دارا »، چۆن لە نێوان « سۆڤێت » و « بارزانیی »دا کاریدەکرد، بە هەمان شێوەش، لە نێوان « بەعس » و « بارزانیی »دا هەڵدەسوڕا، بۆ ئەوەی، لای

« بەعسیی »یەکانیش، ڕەواج پەیداکا. ناڵێم، خوا لێی خۆشبێ، چونکە، قوربانیی دەسی خۆی بوو، بە دەسی خۆی، گۆڕی بۆ خۆی هەڵکەند.
– مەبەستان ئەوەیە، دوای هەرەسەکەی ساڵی « 1975 »، بۆ لای « بەعس » گەڕایەوە؟
بەڵێ. دوای ئەوەی شۆڕش ڕوخا، چوو بۆ لای « بەعسیی »یەکان. بزانە، لە بەر خاتری شوێن و پلەوپایە، چی پێ کردین؟! بزانە، لە بەر خاتری خۆی، چی بە سەر شۆڕشەکە هێنا؟! ئەویش و « سامیی »ش، پێکەوە تاوانبارن. هەر واش دەرچوو، ڕۆی.
بەڵام، دەنگوباسی گفتوگۆکردن، ئەوە ئیشی « عەزیز شەریف » بوو. ئەمەش، خۆی بۆی باسکردم. چونکە، کاتێ دەهات بۆ سەرەوە، بە بۆنەی منەوە، ئاهەنگیان بۆ دەگێڕا، هاوڕێیەکی زۆر گەورەمبوو. کاتێ، بە « عەزیز » بانگم دەکرد، قسەم لەگەڵ دەکرد و بە گژیدادەچووم، پێم دەگوت: تۆ چۆن، بووی بە وەزیر؟ « مەسعوود »، تەماشایدەکردم و پێی دەگوتم: تۆزێ ئاگات لە قسەکانت بێ، ئەوە پیاوێکی بەڕێزە. منیش پێدەکەنیم و پێم دەگوت: « ئەبو هیلال » وەرە، بزانە، « مەسعوود » دەڵێ چی؟ « مەسعوود » نازانێ، پێوەندیی نێوانمان چۆنە و لە کەیەوە دەسپێکردووە؟ من چۆن، وا بە ئاسایی قسەم لەگەڵدا دەکرد، یا، ئەو بەو شێوەیە دەیدواندم، هەموو ئەو شتانە، بۆ سەردەمێکی دیاریکراوی کۆنتر دەگەڕێتەوە. بەپێی ئەو قسانەی، « عەزیز » بۆی گێڕامەوە، لە « ئەڵمائاتا »، کۆنگرەیە دەبەسرێ. لەوێ، « سۆڤێت » پێی دەڵێن: دەبێ، کێشەی کوردستان چارەسەرکەی. دیارە، « بەعسیی »یەکان لەو بارەیەوە، داوای یارمەتییان لێ کردبوون. من نامەوێ، ئەو باسە لێرەدا، بە درێژیی بگێڕمەوە، بێ گومان، ئەو دەکۆمێنتانەش، لە چاپی سێیەمی، پاشکۆی پەرتووکی « لیمازا تەبقا ئەلەحقائیق مەکتومە عەن ئەلشەعب ئەلکوردی؟ »دا بڵاودەکەمەوە. کاتێ دارا چوو بۆ ئەوێ، ئیشەکەی « عەزیز »ی تەواوکرد. لێرەدا نامەوێ، باسی ئەو هەوڵەی « دارا » بکەم، بەڵام، قسە قسەدێنێ، بە تایبەتیی، ئەو ڕاپۆرتانەی، لەوێوە بۆی دەناردین، هەمووی، دەربارەی ئەو گفتوگۆیانە بوون، لەگەڵ « بەعسیی»یەکاندا دەیکرد. هەرچی چۆنێ بوو، کاتێ « دارا » زانی، ئیشەکە سەر دەگرێ، زۆر بە گەرمیی، کەوتە خۆی، تا لەو ناوەدا، پارچە نانێکی دەسکەوێ!
– ئەو کاتە، « دارا » ئەندامی « پارتیی » بوو؟

« دارا »، هەرگــیــز ئەندامی « پارتیی » نەبووە. چوار ڕۆژ پێش کـۆنگرەی هەشت، لە مانگی « 1970/8 »دا کرا بە ئەندام.
ـ سەیرە!
چوار ڕۆژی مابوو، کۆنگرەکە بگیرێ. « دارا »، نامەیەکی نووســـــی، تا، لە « پارتیی »دا وەرگیرێ. ئەندامانی پەلیتبیرۆ، هەموو ڕقیان لێی بوو. لەبەر ئەوەی دەیانزانی، هەر کە هات، دس بەسەر هەموو شتێکدا دەگرێ.
ـ لەبەرئەوەی لە « بارزانیی »یەوە نزیکبوو؟
جگە لە ماڵی « بارزانیی »، « مەحموود عوسمان و سامیی »ش، موڵکی خۆی بوون، لە هەر دووکیانەوە نزیکبوو. هــــــەر دووکیانی، دەستەمۆکردبوو. بێ « سامیی »، هەرگیز هیچی نەدەکرد، پێکەوە بە پرس و ڕا، کاریاندەکرد و هاوکاریاندەکرد.
پەلیتبیرۆ، داواکارییەکەیان پەسەند نەکرد. لەبەرئەوەی، پێڕەوی نێوخــــۆی « پارتیی » دەیگوت: سـەرەتا دەپاڵێورێ، پاشـان پێویستـە، ماوەی شـەش مانگێکی بەسەردا تێپەڕبێ، ئینجا، بە ئەندام وەردەگیرێ.
« دارا »، چوو بۆ لای « مــەلا مـســتــەفــا »، نـاڕەزایی خــۆی دەربڕی. ئەویش، نامەیەکی بۆ پەلیتبیرۆ نووسی. نامەکە، « ئیدریس» نووسی و « مەلا مستەفا » ئیمزایکرد. لە نامەکەدا نووسیبووی: لە بەر بارێکی نائاسایی دیاریکراو، لەبەرئەوەی، هەر لە سەرەتای ساڵی « 1966 »ەوە، بۆ کێشەی کورد دڵسۆز بووە و کاری بۆ شۆڕش کردووە، من بۆ ئەندامێتی «پارتیی » دەیپاڵێوم. ئەم پاڵاوتنەی ئێستـەشی، لەبری ساڵی « 1966 »، بۆ حــسێبکەن. لەبەرئەوە پێویستە، لە « پارتیی »دا وەرگیرێ. ئێستە تێگەیشتی، چۆن لە « پارتیی »دا وەرگیرا؟
پاشان، لە کۆنگرەشدا بەشدارییکرد. « عەزیز عەقراویی » خۆشی نەدەویست. کاتی خۆی، بۆی باسدەکردم، پێدەکەنی و دەیگوت: سبەی هەڵبژاردنی کۆنگرە دەسپێدەکا. « ئیدریس » و « مەسعوود »، ناوی لە لیستەکەدا دەنووسن، ڕازییبی و ڕازیی نەبی، هەڵدەبژێررێ! هەر واشبوو، بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی دانرا. کاتێ، هەڵبژاردن دەسپێکرد، کۆنگرەم بەجێهێشت و چووم، نووستم. زۆر کەس، منیان هەڵبژاردبوو. دەشمزانی، وەک ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندیی ڕەسەن، لە هەڵبژاردنەکەدا دەردەچم. بەڵام، دوایی هێندێ برادەر، بۆیان باسکردم، لەبری ناوەکەی من، ناوی « دارا »یان دەخوێندەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، بە جێگری یەکەم، یا دووەمی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی دەرچووم. کاتێ، « عەزیز عەقراویی، هاشم عەقراویی، سمایلی مەلا عەزیز » و چەن کەسێکی دیەکەش ڕایانکرد، من لە کۆمیتەی ناوەندییدا، بووم بە ئەندامی تەواو.
– باشە، کاتی خۆی، لە ساڵی « 1973 »دا، ئەو کۆمەڵە بۆ هەڵاتن؟
ئێی، ئەوەش چیرۆکێکی درێژە. دەتەوێ، شتێ لەو بارەیەوە بزانی؟
– بێ گومان.
« عەزیز عەقراویی »، ڕقی لە « زوبێر ئاغا » بوو. ناویان نابوو « هۆلاکۆ »
– مەبەست لە « زوبێر ئاغا »ی « زێبار »ە؟
بەڵێ، خاڵەکەی « مەسعوود ». کاتی خۆی، جاش بوو، هات و « مەلا مستەفا » لێی خۆشبوو. وا بزانم، دوایی، لە شوێنێ بوو بە فرماندەی هێز. لە کاتێکدا، « عەزیز » چوو بۆ « ئاکرێ »، لەگەڵ کۆمـــەڵێ خەڵکدا دانیشتبوون. لە پڕ، « زوبێر ئاغا » خۆی دەکا بە ژووردا، جگە لە « عەزیز »، هەموویان لەبەری هەڵدەسن. « زوبێر ئاغا » دادەنیشێ، « عەزیز » هەڵدەسێ و دەڕوا، تەنانەت، سڵاویشی لێ نەکردبوو. وا دەردەکەوێ، دوایی « مەسعوود »، لە سەر ئەوە، گلەیی لێ کردبێ. لەبەرئەوە، لە سەر ئەو بەزمە، گرفت لە نێوانیاندا پەیدا بوو. « هاشم عەقراویی » خاڵی « عەزیز » بوو.
– ئەدی « شەوکەت عەقراویی »؟
« شەوکەت »، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندیی نەبوو.
– بەڵام، ئەویش لەگەڵیاندا ڕۆی.
بەڵێ، ئەو و پێنج تا شەش کەسی دیکەش ڕۆیشتن. « عەلا »ش لەگەڵیان ڕۆی. برای بەڕێوەبەری پاراستنەکەمان بوو، ناوی چی بوو، لە بیرم چۆوە.
– « شەکیب ». کەواتە، هۆی تێکچوونەکە، ڕامیاریی نەبوو؟
لەوە زیاتر، هیچ شتێکی دیکەی دیاریکراو، لە نێوانیاندا نەبوو. هێندێ کێشە و باسی دیکە هەبوو، پێوەندیی بە بەڕێوەبردنی « پارتیی »یەوە هەبوو. لەبەر ئەوەی « عـەزیز »، دوای ئەوەی، وازی لە بیـری پارێزگـاری « سـولەیمانیی » هێنا، لە « هەولێر »، بوو بە سکرتێری لقی دوو، وەک بۆم باسکردی.
« عـەزیز »، مرۆڤـێکی زۆر سـاویلکەبوو، دڵ و دەروونی باشـبوو، دەیویست، ڕاژەبکا. هەر لە سەرەتاشەوە، ئەندامی « پارتیی » بوو، کاتی خۆی، « ساڵح یوسفیی » ڕایکێشابوو.

ـ ئایا، کۆمەڵەکەی « عەزیز عەقراویی » و ئەوان، پێشتر، هیچ جۆرە، پێوەندییەکی نهێنییان، لەگەڵ حوکوومەتی « عێراق »دا هەبوو؟
نەخێر. یەکسەر ڕۆیشتن. هیچ جۆرە پێوەندییەکی نهێنییان نەبوو.
ـ ئایا، لە نێوان « بارزانیی » و ئەو کۆمەڵەدا، ناکۆکیی ڕامیاریی هەبوو؟
نەخێر.
ـ واتە: تەنیا شتی تایبەتیی و تاکەکەسیی ڕووتبووە؟
بەڵێ. بە تایبەتیی ئەو شتانەی « هاشم» کردنی، یا با بڵێین: ژنەکەی« هاشم» لە « دهۆک » کردبوونی، ناخۆشبوون و ئازاریان زۆربوو. کاتی خۆی، « عەلی سنجاریی» هات بۆ لام. تەماشاکە، مێشکی ئەو جۆرە کەسانە، چەن تەسکە. بزانە، ئەو کێشانە، بە چ پلەیەک گەیشتبوو. هات و وێنەکەی خۆی پێ بوو. گوتی: من ئێستە، لە کۆشکی کۆمارییەوە هاتووم و سوێندمخوارد. منیش گوتم: سوێندت لە سەر چی خوارد؟ گوتی: بووم بە جێگری پارێزگاری پارێزگەی « دهۆک ». کاتی خۆی، « هاشم » زۆر هەوڵیدا، دوای ئەوەی، هەموو هەوڵدانەکانی، لەگەڵ من و کەسانی دیکەدا، سەری نەگرت. پاشان، لە وەزارەتی ڕاگەیاندن، بە بەڕێوەبەری گشتیی ڕۆشنبیریی کوردیی دایاننابوو. چوو بۆ لای « شێخ حەمە خالید » و پێی گوتبوو: من پارێزگاریی « دهۆک »م دەوێ. ئەویش یەکسەر، نامەیەکی بۆ نووسیبوو، بە یەکێکدا ناردبووی بۆ « مەلا مستەفا ». نووسیبووی: ئەمە دەیەوێ، ببێ بە پارێزگاری « دهۆک ».
ـ بەم قسانەدا، وا دەردەکەوێ، ئەندامانی پەلیتبیرۆی « پارتیی »، لە نێو خۆیاندا، پێوەندییەکی باشیان نەبووە؟
هەموویان وا بوون. هەر یەکەیان، دژی ئەوی دیکەیان بوو، تەڵەیان بۆ یەکدی دادەنا، دژی یەکدی، پیلانیاندەگێڕا. کاتێ، یەکدییان دەبینی، پێکەوە دادەنیشتن و پێدەکەنین. بەڵام، کاتێ جیادەبوونەوە، هەر یەکەیان، ئەوی دیکەیانی، بە قسەی ناشرین دەشت.
ـ « بارزانیی »، ئاگای لەو پێوندییەی نێوانیان هەبوو؟
هەرگیز، بەو شتانەی نەدەزانی. چونکە، کەس نەبوو، دژایەتییبکا. هیچ هێزێ نەبوو، لە ڕوویدا ڕاوەستێ. واتە: لە دوا ڕۆژەکانیدا، کوێربوو. هەموو شتێ، هەر ئەوەبوو، کە « ئیدریس » و « مەسعوود »، پێشکەشیاندەکرد. « لیوا ـ عەبدولڕەحمان قازیی » دەناسی؟
ـ ناویم بیستووە.

کاتی خۆی، له ساڵی « 1945 »دا، فەرماندەی بەشی « تۆپ » بوو. لەو کاتەشەوە، هاوڕێی « مەلا مستەفا » بوو. ڕۆژێکیان هات بۆ لام. تا بڵێی، پیاوێکی تووڕەبوو. نێوچەوانی دابوو بە یەکدا. لە دەرگەی دا، خۆی کرد بە ژووردا و پێی گوتم: ئەوە، ماوەی چوار ڕۆژە لێرەم، دەمەوێ « مەلا مستەفا » ببینم و ناتوانم، ئەمە لە کوێ ڕوویداوە؟
من، باسی « دارا »م بۆ تەواو نەکردی. دوای ئەوەی، « دارا » بەو پلەوپایەیە گەیشت، مرخی لە پۆستی پارێزگاری، پارێزگەی « سولەیمانیی » خۆشکرد. وا بزانم، « مەلا مستەفا » ناوی دابوو، بەڵام، حوکوومەت پەسەندی نەکرد. « مەلا مستەفا »، لە سەداسەد نەیپاڵاوتبوو، بەڵام گوتبووی: گەر حوکوومەت ڕازیی بێ، منیش ڕازییم و هیچ شتێکم لە سەری نییە. « دارا »، ئیشی بۆ ئەوە زۆر کرد، بەڵام، سەر نەکەوت. لە دواییدا، بوو بە ئەڵقەی پێوەندیی، نێوان شۆڕش و حوکوومەت. ژوورێکیان، لە نهۆمی سەرەوە دابوویە، هەموو ئەو شتانەی، پێوەندیی بە ئیش و پیشە و خانەنشینییەوە هەبوو، ئەو ڕایدەپەڕاندن. « دارا » خۆی، بۆ شوێنێکی گەورە ئامادەکردبوو، بەڵام، دەسی نەدەکەوت. دوا جاریش، پیلانێکیان، دژی من گێڕا، تا، لە ڕۆژنامەی « تەئەخی » دوورمخەنەوە. پیلانەکەش سێقۆڵیی لە لایەن، « دارا، سامیی و عەلی عەبـــــدوڵڵا »وە کرا و بە سەرکەوتوویش ئەنجامیاندا. بێ گومان، « عەلی » لەو پرۆسێسەدا، ڕۆڵی ئامرازێکی دەبینی، تا لەگەڵ « سامیی »دا بێ.
ـ واتە: کڵاویان لە سەر نابوو!
لەو بڕوایەدا نەبووم، بگاتە ئەو ئەندازەیەی، داوی شەڕم بۆ بچنێ! بەڵام، وەک دەرزیی وابوو، ئامرازبوو. بێ گومان، ئەوە تێڕوانینی منە بۆ « عەلی ». ئەو بە خەسڵەتی خۆی، پیاوێکی شەڕانگێز نەبوو، بەڵکوو، پاشکۆی ئەوانەبوو، کە ئەو بەزمەیان دەگێڕا. دەیزانی، پاشەڕۆژی « پارتیی »، بە دەس « دارا و سامیی »یەوەیە، لەبەرئەوە، گوێڕایەڵی ئەو دووانەبوو.
پێش ئەوەی، ئەو باسەم لە بیرچێتەوە، شتێکی زۆر گرنگ هەیە، با بیگێڕمەوە. کاتێ، پەلیتبیرۆ بڕیاریاندا، من لە « تەئەخی » دووربخەنەوە، من لە کارکردن، مانمگرت و داوای مافی خۆشمم نەکرد، نەچووم بۆ کۆمیتەی ناوەندیی و لێم نەپرسینەوە. لەبەرئەوە، ئەوانیش بەو هەڵوێستەی من، دڵخۆشبوون، چونکە، من ئەو بزمارەبووم، کە لە سمتیان دەچەقیم. ئێستە

تێگەیشتی، بوونی ئەوان چی بوو؟ ئەوان خۆیان لێ بێ دەنگکردبوو. هەروەها، منیش دەنگم لێوە نەدەهات. لە دواییشدا، هەر ئەوان پەلاماریاندام. بە هەمان شێوە، پەلاماریاندام، کاتێ، پەیمانگەی کادێرانم دامەزراند. منیش، لە تاو شێوازی گوتارەکانی وێزگە، مێشکم دەلەرزی. لە ساڵی «1974»دا، وێزگەکە بە تەواویی، وێزگەیەکی کۆمۆنیستانەبوو. ئەمەش، کاتێ ڕوویدا، دوای ئەوەی، جەنگ لە کوردستاندا دەسپێکردەوە. هەموو بەشی ڕاگەیاندن و وێزگەیان، بە « دارا » سپارد. خۆی سکرتێری ڕاگەیاندنبوو. « دارا »، یەکەم کەسبوو، مافی ئەوەی هەبوو، تا بیستوپێنج دینار، بۆ خەڵکی بنووسێ. ئەوەش شتێکی تایبەتییبوو. چونکە، تەنیا ئەندامانی پەلیتبیرۆ، ئەو دەسەڵاتەیان هەبوو. ئەوە جگە، لە ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانیان، من مێشکم وردبووبوو.
شەوێکیان، « مەلا مستەفا » سەری لێ دام. وەک پیشەی خۆی، کاژێری دوازدەی شەو هات. پێم گوت: « مەلا مستەفا »، تۆ گوێ لە وێزگەی دەنگی «کوردستانی عێراق » ڕادەگری؟ گوتی: کام « کوردستانی عێراق »؟ من ئەو وێزگەیە ناکەمەوە و نامەوێ، گوێم لێی بێ. گوێبگرە، « مەلا مستەفا »، زۆر لێیان تووڕەبوو، گوتی: باسی وێزگەم بۆ مەکە، من گوێی لێ ناگرم. پێم گوت: با ئیدی، واز لەو قسانە بێنن، پێم ناڵێی، ئەو نامەیە چییە، بۆ « سالم ڕەبیع عەلی »یان نووسیوە و لە وێزگەکەی خۆماندا بڵاویانکردۆتەوە؟ ئێمە، چ هەقێکمان، بە سەر « یەمەن »ەوە هەیە؟ کەی ئێمە، لەوێ بووین؟ کەی ئەوان، باسی ئێمەیان کردووە؟ پێکەنی و گوتی: تۆ لەو بارەیەوە، پرسیارم لێ مەکە. من لە مێژە، تەواوبووم. بە خوا، بەو شێوەیە وەڵامیدامەوە. دوای دوو سێ ڕۆژ، « حەبیب » هات بۆ لام و گوتی: کاکە! ئێمە دەمانەوێ، بەشەکانی ڕێکخستنی « پارتیی » ڕێکخەینەوە، بەشی ڕاگەیاندن چاککەین، لەبەرئەوە، لە پەلیتبیرۆ بڕیارمانداوە، تۆ سەرپەرشتیی، بەشی ڕاگەیاندنی شۆڕش بکەی، « نووریی شاوەیس »یش، خەریکی بەشی ڕێکخستنی « پارتیی » بێ. ئەمە بڕیاری پەلیتبیرۆیە.
ـ بێ گومان، بە ئاگاداریی « بارزانیی » بوو.
نەخێر. نازانم. من ئەوەم لە « حەبیب » بیست. « مەلا مستەفا »، قسەی لەو شتانەدا نەدەکرد. ئەوەی بۆم گێڕایەوە، « مەلا مستەفا »، هەر هێندی گوت. لەو بارەیەوە، هیچی باس نەکرد. پێکەنیم و پێم گوت: « حەبیب »، ئێوە شەرم ناکەن! کێشەکەتان بەم پلەیە گەیاند! ئێستە دەتانەوێ، بە شتەکاندا بچنەوە،

کاتی ئەوە ماوە، ڕیزەکانی ڕێکخستنی « پارتیی » چاککەن؟! ئەوە ماوەی چوار پێنج ساڵ تێپەڕبوو، کاتێ من، ئەو بەشی ڕاگەیاندنەم، بۆ ئێوە بەجێ هێشت، ئاوابوو؟ بۆ بەو شێوەیەی بەسەرهات؟ گوتی: چی بکەم! گوتم: من نایکەم. هەر لە ڕاستییدا، لەو شتانە زۆر بێ تاقەتبووم، ڕۆی.
ڕۆژی دووەم، « مەحموود عوسمان » هات بۆ لام. کۆمەڵێ خەڵکم لا دانیشتبوو. گوتی: تۆ، بۆ بەو شێوەیە، لەگەڵماندا دەجوڵێیتەوە؟ نامەیەکی دامێ. خوێندمەوە و پێم گوت: کاکە! ئەو کاتەی ئێوە، منتان لە ڕۆژنامەی « تەئەخی » لابرد، تاقمێکی مۆبێلەی دانیشتن، لە بارەگای ڕۆژنامەکە مابوو، گوایە: تاقمەکە کەمی هێنابوو. ئەو کاتە، ئەو بەڵگەیەیان دروسکردبوو. کاتی خۆی، دوو مانگ پێش ڕێککەوتننامەکەی «11/مارس »، « مەلا مستەفا »، دە هەزار دیناری دامێ، بۆ ئەوەی بچم، چاپخانەیەکی پێ بکرم. کاتێ، ڕێککەوتننامەکەی «11/مارس » خوێندرایەوە، پارەکەم دا بە « حەبیب ». پاشان، هێندێ شتمان کڕی. من پارەم لە « حەبیب » وەردەگرت و وەسڵم دەدایە. واتە: هێشتا پارەکە بە دەس منەوە بوو، گەر کەمی هێنابێ، دزیی تێدا نەکراوە. بەڵام، شتێکی دیکە هەبوو، ئەویش ئەوەبوو، « سۆڤێت » شکاتیان لێ کردبووم. ئەوەش باسێکی دیکەی سەربەخۆیە.
- باشە. لە باسی « دارا »ش ڕزگارمانبوو.
نەخێر. ئاخر، ئەمە ئەو بابەتەی « دارا »یە، بۆت باسدەکەم. بە دوکتۆر « مەحموود »م گوت: گەر « دارا »ی تێدابێ و ئەو بەرپرسیاربێ، من لەو ناوەدا، ڕۆڵم چی دەبێ؟ ئەمە کێشەی « پارتیی » و شۆڕشە و دەبێ، ڕوون بکرێتەوە. گوتی: نەخێر. تۆ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندییت. تۆ و « نووریی شاوەیس »، هەر کەسە بەشی خۆی هەیە، پێکەوە هاوکارییدەکەن. ئێمە بۆ ئەو کارە، ئێوەمان هەڵبژاردووە. من و « نووریی »، لە یەک تەمەندا بووین، لەوانەیە، ئەو ساڵێ لە من گەورەتربووبێ. پێم گوت: من مەرجێکم هەیە، بۆتان دەنووسم، گەر جێبەجێتانکرد، من دێم. لەبەرئەوەی، من ئەندامی « پارتیی »م، چارەنووسی « پارتیی »م بە لاوە گرنگە. ڕاگەیاندنی « پارتیی »، بەو شێوە نزمە گەیشتووە، بە پێویستی دەزانم، لەو بارەیەوە شتێ بکەم. من وەک « عەزیز عەقراویی » و کەسانی دیکە نیم، زویربم و بڕۆم، لەبەرئەوەی، لەو بڕوایەدام، کاتێ دەبینم، کاروبارەکانی « پارتیی »، بەو شێوەیە پشگوێ دەخرێ، ئا لەو کاتانەدا، من بە هۆش خۆم دەیمەوە و ئەرکی سەرشانی خۆم

جێبەجێدەکەم. ئەوەش، بە ئەرکێکی تەواویی، نیشتمانیی خۆم دەزانم. گوتی: باشە. بەڵام چۆن؟ گوتم: تەنیا بەو شێوەیە. گوتی: داواکارییەکانی خۆت بنووسە. ئەو و « حەبیب »، منیان باش دەناسی. وا دەردەکەوێ، هەر دووکیان پێکەوە، دانیشتبوون و گوتبێتیان: بە خوا، لەوە دەچێ، « جەرجیس » نیازێکی دیاریکراوی هەبێ، لەوانەیە، ئێمە دەرەقەتی نەیەین. دووەم ڕۆژ، بە شەو بە « ئیدریس »یان گوتبوو. « ئیدریس » هات و لە نێو دەرگەکەدا ڕاوەستا. بە شەو، حوکوومەت ئەو ناوەی بۆمبارانددەکرد. گوتی: کاکە «جەرجیس !» بۆ ناچی بۆ بارەگەکەی خۆت؟ پێم گوت: بۆ کوێ بچم؟ گوتی: ئیشەکەی خۆت وەرگری. پێم گوت: من ئامادەم، ئیشەکەی خۆم وەردەگرم، بەڵام، بە مەرجێ، هەموو چاپخانەکە بە دەس منەوە بێ و من بەرپرسیبم، وێزگەکەش، هەمووی لە ژێر دەسی مندا بێ. گەر ئەو دووانەم، بە دەسبێ و کەس هاوبەشیم نەکا، ئەوا من لێرەم و ئامادەم. بە خوا، من درۆی بە دەمەوە ناکەم، چونکە مردووە، پێی گوتم: ئەمە چۆن وا دەبێ؟ ئەمە وەک ئەوە وایە، شتەکە لە سەری « دارا »دا بشکێنی. گوتم: من سەری کەس ناشکێنم. وا دەردەکەوت، لەو ناوەدا « دارا » و هێندێ کەسی دیکە، زیانیان لێ دەکەوت! گوتم: من دەمەوێ، بارەکە ڕاستکەمەوە و بە ڕێکوپێکی، کارەکان ڕاپەڕێنم. تۆ خۆت لەو بارەیەوە، من باش دەناسی. پێی گوتم: بە خوا، من تۆ دەناسم، تۆ نابەزی. گوتم: نابەزم! ئەوە بۆ من، ووشەیەکی قوورسە. من ماوەی، سێ چوار مانگە، لێرە دانیشتووم، وەک دوورخراوە و دەسبەسەر وام، کەس لێم ناپرسێتەوە، ئێستە، بایەخی منتان هەستپێکردووە، تازە هاتووی، دەتەوێ، لە ژێر دەسی یەکێکی نەزان و نەخوێندەواردا دامنێی و ناموسم بشکێنی؟! گوتی: نەخێر. پێویست ناکا، تۆ لە ژێر دەسی ئەودا بی. هەر کەسێ، لە شوێنی تایبەتیی خۆی ئیشدەکا. گوتم: من چاپخانەکەم دەوێ. چونکە، لەو بڕوایەدابووم، گەر من ڕایکێشم، ئەو شلیدەکا. گوتم: دەبێ، هاوئاهەنگییەک لە کارەکەمدا هەبێ، من لە سەر ڕێبازێ بڕۆم و ئەو لە سەر ڕێبازێکی دیکە بڕوا، نابێ. گوتی: بۆچی دەتەوێ، چاپخانەکە لە بندەسی تۆدا بێ؟ سەیرکە، بزانە، ئەمە چۆن بیر و هۆشێکە، بۆ، پێ لە سەر چاپخانەکە دادەگری؟ چاپخانەیەک بایی چەندە؟ گوتم: مەبەست چییە؟ گوتی: دەمەوێ، بزانم، چەندت دەوێ؟ گوتم: گەر تۆ منت دەوێ، سەد هەزار دیناری تێدەچێ. گوتی: بەیانیی پارەکەت پێ دەگا و بڕۆ چاپخانەیەک بکڕە. ئەمە هەمووی، پێش ئەوە

بوو، دەربارەی ڕێککەوتننامەکەی « جەزایر »، هیچ زانیارییەکمان هەبێ.
گوتم: ئەدی چاپخانەکەی دیکە، چی بەسەردێ؟
ـ دیارە، « کۆمۆنیست »ەکان بەکاریاندێنا!
گوتی: هەرچی چۆنێ بێ. من لەو بارەیەوە نامەوێ، قسەت لەگەڵدا بکەم. بەیانیی، پارەکەت بۆ دەنێرم.
ـ پارە زۆربوو؟
هەر لەوەدا نەبوو، بە میلیۆن قسەیاندەکرد. بۆ ڕۆژی دوایی، ڕێی خۆم دیاری کرد. هەموو مەرجەکانی خۆمم نووسـی. تا زۆر بە ڕێکوپێکی، لە ڕێگەی « پارتیی »یەوە، شتەکە قاڵبی خۆی وەرگرێ. چووم بۆ « چۆمان ». « حەبیب » و « مەحموود »، هەر دووکیان، لە نێو چادرێکدا دانیشتبوون. نامەکەم، لە بەر دەمیاندا دانا. یازدە مەرجم بۆ نووسیبوون، مەرجی یەکەم.
ـ لەو بڕوایەدام، پێویست ناکا، هەموو مەرجەکانی خۆتان، لێرەدا باسکەن، تەنیا هەرە گرنگەکەیان بەسە.
هەر کە چاویان، بە مەرجی سێیەم کەوت، یەکسەر گوتیان: ئەوەیان، هەر نابێ! مەرجەکەش ئەوەبوو، چاپخانەکە و وێزگەکە، لە « دارا » بسەندرێتەوە. پێم گوتن: بۆ نابێ؟ هەر دووکیان، دەسیان بەرزکردەوە و گوتیان: ئەی گوایە، نازانی؟!! « دارا » ناناسی؟!! نازانی کێیە؟!! ئیدی وازمهێنا. پاشان، کارەساتەکە ڕوویدا. ئێمە، پێش ئەوەی، بچین بۆ « تاران »، هەمـوومان لە « ورمێ » بووین. لە « ورمێ »، « دارا » و ژنەکەیم بینی. شۆفێرەکەی ناوی « عەبدوڵڵا ئاکرەیی » بوو، ئەوەش وێنەکەیەتی لەوێدا.
ـ ئەوەیان زۆر گرنگ نییە.
گوتم: ها، « عەبدوڵڵا » ئەوە چی دەکەی؟ گوتی: ژنەکەی « دارا »م هێناوە، لە بەیانییەوە تا ئێستە هاتووە بۆ بازاڕ، بە قەدەر ئاسمان، کوتاڵ و شتی دیکەی کڕیوە و ئۆتۆمۆبیلەکەی پڕکردووە. گوتم: بۆ؟ گوتی: لەبەرئەوەی بڕیاریانداوە، کۆچبکەن و بگەڕێنەوە بۆ « بەغدا ».
ـ ئەوە لە ڕۆژی کارەساتەکەدا؟
بەڵێ. دوای کارەساتەکە. کاتی خۆی، یەکسەر گەڕانەوە بۆ « بەغدا ».
ـ دیارە، سەرکردەی چاکبووە! باشە، لە نێو ئەندامانی سـەرکردایەتی « پارتیی »دا، لە ڕووی « بڕوا، پێوەندیی و خۆشەویستیی »یەوە، کامیان لە هەموویان زیاتر، لە « بارزانیی »یەوە نزیکبوون؟

بەپێی بارودۆخەکە دەگۆڕا. بەپێی بۆچوونی خۆم، لە ســـەردەمێکدا، دوکتۆر « مـەحـمـوود » بوو. مـەبەسـم ئەوەیە، هەر یەکـەی، لە کـاتێکی دیاریکراودا هەڵدەسەنگاند. هەر یەکەش، لە سەردەمێکی جیاوازدا پێشدەکەوت.

پ8 : کەی هەستان بەو ناکۆکییەی نێوان « بارزانیی » و پەلیتبیرۆ کرد؟
و8 : ناکۆکیی نەبوو.
ـ ئەدی ئەو دووبەرەکییەی لە نێوانیاندا ڕوویدا، چی بوو؟
باسی کام دووبەرەکیی دەکەی؟
ـ دووبەرەکییەکەی ساڵی « 1964 ».
من، هیچ شتێ لەو بارەیەوە نازانم. لە ساڵی « 1964 »دا گیرابووم.
ـ باشە، کەی یەکەم جار، گوێتان لەو ناکۆکییانەی نێوانیان بوو؟
من ئەو کاتە گیرابووم. لە سـاڵی «1966»دا، ئەو ناکۆکییەم بیست. وا خـۆم پیشـانـدا، ئاگام لە دووبەرەکـییـەکە نییـە. گەر ناکـۆکـییـەکـیش، لە دید و بۆچـوونیـاندا هەبێ، هیچ شـتێ، دەربارەی ئەو گـرفـتـە نازانم. چونکە، دڵم پەسـەندی نەدەکرد. تەنانەت، من پێمـوابوو، هەر دوو لایان، ئیش بۆ کێشـەی کورد دەکەن. کـاتێ، « بەزاز » بڵاڤـۆکەکەی «29/یونـی/1966»ی خـوێندەوە. دوو نامەم، بە بۆنەی ئەو ڕێککەوتنەوە نووسی. یەکێکیان بۆ « مەلا مستەفا » و ئەوی دیکەیان، بۆ « برایم ئەحمەد » بوو. لە گرتووخانە، پاسـەوانێکی لێ بوو، ئەندامی « پارتیی » بوو. ئەو لە نێوان من و « پارتیی »دا، ئەڵقـەی پێـوەندیی بـــــوو. ئەو کاتە، « عەبدولڕەحمان زوبێـحیی »، سکرتێری لیژنەی ناوچەی « بەغـدا » بوو. وا دەردەکەوێ، نـامـەکـەی بە کـۆمـەڵەکـەی دیکە نەگـەیاندبوو. داوام لێ کردبوون، ئاگـایان لە بڵاڤـۆکـەکە بێ و بە چاوی گـومـانەوە، سـەیری کـەن. بۆم نـووسـیبـوون: ئەوە بـڵاڤـۆکێکی بـاش نییـە و هـیـچی تێدا نـیـیـە. بێ گـومـان، من لە ڕووی یـاسـاییـیـەوە، بیـرم لێ دەکـردەوە. نەمـدەزانی، دەسـی « ئەمێـریکا، ئینگلیز و سۆڤێت »ی تێدایە. واتە: شـتـەکە لەوە زیاتربوو. ئەوان دەیانویسـت، « عـەبدولڕەحـمـان بەزاز »، کـەمێ بەهێـزبێ. بڵاڤـۆکـەکـە و بە درۆخسـتنەوەکەی « بەزاز»یش، لە پەرتووکەکەمدا دەردەچێ. « بەزاز »، دوایی پەشیمانبۆوە، دەقەکەیم هەمووی، بە تەواویی هەیە. ئاگات لێیە؟
ـ بەڵێ. « بـەعـسـیی »یەکـان ئازاریاندا و نـاچاریانکرد، ئەو بـڵاڤـۆکـەی دووەم بنووسێ.

پ9 : به بڕوای بەڕێزتان، فاکتەرە سەرەکیی و ڕاستەقینەکانی، دووبەرەکییەکەی ساڵی « 1964 » چی بوون؟
و9 : ئەو هۆیانە دوورودرێژن و لە پەرتووکەکەمدا، باسمکردوون.
- دەتوانن، تەنیا بۆمان ببژێرن؟
تکایە، لە پەرتووکی « الحرب الكرديه و انشقاق 1964 »دا هەیە، بیخوێنەرەوە.
- بۆ نموونە: دەتوانین بڵێین: ئەو ناکۆکییانەی لە نێوان « بارزانیی » و کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد »دا بوو، ناکۆکییەکی ڕامیاریی و دیپلۆماسیی بوو؟ ناکۆکییەک بوو، لە سەر کێشەی دیمۆکراسیی بوو، لەبەرئەوەی، « بارزانیی » دەیویست، خۆی بە سەر ئەندامانی پەلیتبیرۆدا بسەپێنێ؟
« برایم ئەحمەد »، کەسایەتییەکی ڕووناکبیر و شارستانیی بوو. وەک پیاوێ، لە کۆڕی خەباتی ڕامیاریدا قاڵبووبوو، وەک سکرتێری « پارتیی »ش دەیویست، لە سەر دەقی نێو پەرتووکەکان بەڕێوەبرِوا.
- مەبەستان لە پەرتووکە « مارکسیی »یەکانە؟
نەخێر. ئەمە چەمکێکی ئینگلیزییە، دەڵێ:
( He was determinat to go a long the book)
نموونەیەکت، لەو بارەیەوە بۆ دێنمەوە. کاتێ « مەلا مستەفا »، بۆ یەکەم جار، چاوی بە « عەبدولکەریم » کەوت، « برایم ئەحمەد »یشی لەگەڵ بوو. « مەلا مستەفا »، دەسی بە باسکردنی کرد، بە شانوبازوی « قاسم »یدا هەڵدەدا و دەیگوت: تۆ سەروەرمانی، تۆ گەورەمانی، تۆ وایت و تۆ وای. « برایم ئەحمەد »، ئەو قسانەی پێ ناخۆشبوو. دەیگوت: نابێ، سەر بۆ « عەبدولکەریم » دابنەوێنێ. بەڵام، « مەلا مستەفا » لە « برایم ئەحمەد » زیاتر، شارەزای باری سایکۆلۆژیی « عەرەب » بوو، چاکی دەناسین. « برایم »، لە بەر ڕۆشنایی، دەقی نێو پەرتووکەکاندا هەنگاویدەنا. دەیگوت: لەبەرئەوەی من، بە ناوی « پارتیی »ەوە قسەدەکەم، دەبێ، ڕەقبم، بەهێزبم، وا بم و وا بم. بەڵام « مەلا مستەفا »، وەک جوتیارێ قسەیدەکرد و دەیگوت: بە خوا، ئێمە بەو شێوەیە دەدوێین ... تاد. وەک بیەوێ، سەرنجیانڕاکێشێ.
- وەک « جوو »مکان.
ئاخر. ها ها ها. ئەوە جیاوازیی نێوان ئەو دووانە بوو.
- مەبەستان ئەوەیە، شێوازی کارکردنیان جیاوازبوو؟
بەڵێ. شێوەی کارکردنیان، قسەکردنیان جیاوازبوو. ئەوە یەکێ بوو، لەو

شتانە. دووەم: هێندێ شت هەبوو، بۆ نموونە: « برایم »، وەک درمختێ وابوو، لە بەرانبەر بادا نەدەنوشتایەوە.
ـ واتە: کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو؟
دەڵێم: وەک درمختێ وابوو، لەگەڵ هێزی باکەدا، خۆی نەدەگونجاند. زۆر بە داخەوە، ئەوەش گرفت و کارەساتی زۆری، بۆ « برایم » دەخوڵقاند. ئێستەش، ڕووداوێکی سەیری دیاریکراوم لە بیرماوە، لە ساڵی « 1963 »دا، لە « موفتیی ئەزهەر »ی وولاتی « میسر »ەوە، بڕیارێ دەرچوو. لەو سەردەمانەدا، دژی « کۆمۆنیست »ەکان هەوڵیاندەدا، چەن شتێ بکەن. یەکێ لەوانە ئەوەبوو، بڕیاریاندا، هەر پیاوێ، کچێکی « کۆمۆنیست » مارەکا، مارەیی نایێ و ژنهێنانەکەی، دروست نییە، بە پێچەوانەشەوە.
ـ کاتی خۆی، لە سەرەتای ساڵی حەفتاکاندا، « مەلا عەلی » کوردیش، لە شارۆچکەی « هەڵەبجە »، فتوایەکی لەو بابەتەی دەرکرد.
بەڵێ. لە هەمان کاتدا و بۆ ڕۆژی دووەم، بڕیارێ لە « فاتیکان »ەوە دەرچوو، دەڵێ: بیروباوەڕی ڕامیاریی، لەگەڵ بیروباوەڕی ئایینییدا جیاوازە.
ـ واتە: بەپێچەوانەی « موفتیی » ئیسلامەوە.
جا، تەماشاکە، ئەوە جیاوازیی، نێوان ئەو دووانە بوو! « فاتیکان »، لە بەردەمی بادا دەچەمییەوە، ئەو بایەش، بای « کۆمۆنیستیی » بوو. بەڵام، ئەوانی دیکە نە دەچەمانەوە، بەڵکوو، بە تەواویی دەشکان. ئێستە تێگەیشتی؟ ها؟ نموونەکە ڕاستە؟
ـ بەڵێ. باشە. ئەوە لە ڕووی شێوەی کارکردنەوە، ئەدی، لە باری ڕامیارییەوە، ئایا، ناکۆکییان لە نێواندا هەبوو؟
هەر دووکیان، بۆچوونێکی دیاریکراویان، دەربارەی چەمکی « ئۆتۆنۆمیی » نەبوو.
ـ « بارزانیی » و « برایم ئەحمەد »؟
بەڵێ.
ـ مەبەستان لە کاتی دووبەرەکییەکەیە؟
بەڵێ. با بۆت باسکەم، کەی بە تەواویی، باسی « ئۆتۆنۆمیی » دەقیگرت. کاتێ ڕێککەوتننامەی « 11/مارس » کۆتاییپێهات، حوکوومەت، کۆمەڵێکی لەو کوردانەی، لە « بەغدا » دەژیان، کۆکردەوە و دەمەتەقێی لەگەڵ کردن، وەک خۆشت دەزانی. دوایی، شێوەی پرۆژەیەکی بەڕێوەبردنی نێوخۆیان بۆ ناردین.

من لەوێ بووم. « حەمەی عەزیز، دوکتۆر مەحموود، عەلی عەسکەریی، برایم ئەحمەد، عومەر مستەفا و شەفیق قەزاز »، ئەو کۆمەڵەش، هەموو لەوێ بوون.
ـ لە « بەغدا »؟
نەخێر. لە « ناوپردان ». دوای ئەوەی، ڕێککەوتننامەکەی « 11/مارس » خوێندرایەوە و هەموو شتێ تەواوبوو، « برایم » و ئەوان هەموویان، هاتنە سەرەوە. چونکە، « مەلا مستەفا » گوتی: دەبێ، هەموو ئەندامانی سەرکردایەتییان، بێن بۆ « ناوپردان » و لە ژێر چاودێری خۆمدا بن.
پێشنیازەکانی حوکوومەتم لایە، بە دەسوخەتی « دارا »، لە سەری نووسراوە، وەک خۆی مابۆوە. کاتێ من و « برایم » خوێندمانەوە، زەردهەڵگەڕاین. پێم گوت: « برایم !» ئەمە ناخوێنیتەوە؟ خوێندییەوە و گوتی: ئەمە چییە؟ ئەمە وەک ئەوە وایە، تازە لە سەرەتاوە دەسپێبکەینەوە. ئەمە، هەر خاڵەکانی سەردەمی « عەبدولسەلام عارف » و کۆمەڵەکەیەتی. نە « ئۆتۆنۆمیی»ە و نە هیچ. بەڵکوو، خۆبەڕێوەبردنی « ناناوەندیی »ە. هەموومان تووڕەبووین.
« برایم » گوتی: مادام ئەوان، بۆچوونێکی دیاریکراویان، بۆ « ئۆتۆنۆمیی » هەیە، با ئێمەش، بۆچوونی دیاریکراوی خۆمان، بۆ « ئۆتۆنۆمیی » هەبێ.
« برایم » غەڕابوو. تێگەیشتی مەبەسم چییە؟ من بۆچی، پێت دەڵێم: هێندێ جار، هەموو شتێکی بیردەچێتەوە و بە حسێبی نیشتمانپەروەریی خۆی سەر ناکەوێ. منیش پێم خۆشبوو، گوتم: بە خوا باشە. « مەحموود »یش گوتی: زۆر چاکە. پێم گوتن: ئێمە پڕۆژەیەکی « ئۆتۆنۆمیی » دەنووسین، لە ڕادیۆکەی خۆمانەوە بڵاویدەکەینەوە. گوتیان: باشە. یەکسەر، کۆمیتەیەکمان دامەزراند. کۆمیتەکە، لە من و « برایم، شەفیق، عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە » پێکهات. دانیشتین و پڕۆژەیەکی زۆر باشی « ئۆتۆنۆمیی »مان نووسی، « 113 » خاڵ بوو. تا ئێستەش، وێنەیەکیم لا ماوە. زیاتر من و « برایم »، ڕۆڵی سەرەکییمان هەبوو، ئەوانی دیکە، بۆ پرسوڕا، لە کۆمیتەکەدا بوون. بۆ نموونە: « شەفیق »، بڕیارەکانی تۆماردەکرد. ئەندامەکانی دیکەش، لە سەر ئەو بۆچوونانە ڕازییدەبوون، کە ئێمە دەرماندەبڕین. ئێمەش، لە نێوان خۆماندا، لە سەر داڕشتنی شێوەی پڕۆژەکە، پێشبڕکێماندەکرد.
ـ بەڕێزتان و مامۆستا « برایم »؟
بەڵێ. دوای ئەوەی نووسیمان، بڕیاربوو، لە ڕادیۆوە بڵاویکەینەوە. نوێنەرەکان لە « بەغدا » گەڕانەوە. من لە کاتی خۆیدا، « ئیدریس و مەسعوود »م بینی.

پێم گوتن: ئێمە پرۆژەیەکی تایبەتیمان بۆ « ئۆتۆنۆمیی » گەڵاڵەکردووە، شتێکی باش و سەربەخۆیە. گوتیان: لە کوێیە؟ گوتم: ئەوەتە تەواوبووە و لای منە. دامنێ و گوتیان: تەماشای هەر دووکیان دەکەین. بەڵام، بۆ ڕۆژی دووەم، ئیشەکە هەڵگەڕایەوە. کەس لێی نەپرسینەوە، نەیان نارد بە دوامانداو سڵاوێکیشیان لێ نەکردین. چووم بۆ لای دوکتۆر « مەحموود ». بۆچی، من پێت دەڵێم: ئەو کەسانە، خاوەنی قسەی خۆیان نین! لێم پرسی: پرۆژەکەمان چی بەسەرهات؟ ئاخر ئێمە، پازدە ڕۆژە، کاری تێدا دەکەین. پێکەنی و گوتی: پەلیتبیرۆ بڕیاریدا، هێندێ دەسکاریی پرۆژە « ئۆتۆنۆمیی »یەکەی حوکومەت بکا و پێشنیازی لە سەر بنووسێ.

ـ پەلیتبیرۆیەکی لاوازبوون.

یەکسەر، چوومە دەرەوە. شەو، سەرم لە « برایم »دا. پێم گوت: ئەو پازدە ڕۆژەی من و تۆ، کارمان لەو پرۆژەیەدا کرد، هەروا بە خۆڕایی ڕۆی. « برایم » کۆمێنتارێکی جوانی، لە سەر ئەو بڕیارەی ئەوان دا، بەڵام، من بیرم چۆتەوە. کۆمێنتاری زۆر جوانی هەیە.

ـ ئەوە دەربارەی « ئۆتۆنۆمیی » بوو. بەڵێ. ڕاستە، تێگەیشتم، شۆڕش هیچ جۆرە بەرنامەیەکی نەبووە، لەسەر بۆش دەڕۆی. ئەدی لە ساڵی « 1964 »دا، ناکۆکیی ڕامیاریی لە نێوان « بارزانیی » و « برایم ئەحمەد »دا هەبوو؟

کاکە، گەر تۆ، ئەو بەشە تایبەتییەی، لە سەر کێشەی کورد نووسراوە و پێوەندیی، بە ناکۆکییەکەی ساڵی « 1964 »وە هەیە، بیخوێنیتەوە، ئەو کاتە، بۆت دەردەکەوێ، چۆن پیت بە پیت بە درێژی لێی دواوم.

ـ خوێندومەتەوە، وەک سەرچاوەیەکیش، بۆ یەکێ لە بەرهەمەکانی خۆم بەکارمهێناوە، بەڵام، ئەو بەرهەمە، هێشتا چاپ نەکراوە. لێرەدا، من دەمەوێ، هێندێ زانیاریی نوێم دەسکەوێ. بۆ نموونە: دەربارەی ناکۆکیی ڕامیاریی نێوانیان.

من لەوێ نەبووم.

ـ باشە، ئەدی ناکۆکیی ئایدۆلۆژیایان هەبوو؟

کاتێ بۆ دوا جار، لە « لەندەن » بووم، تێلێفۆنم بۆ « برایم » کرد، پێم گوت: دەمەوێ، چاوم پێت بکەوێ. گوتی: باشە. ناونیشانی ماڵەوەی دامێ. سوار بووم و چووم. لە ئێسگەی شەمەندەفەرەکە بینیم. بەسزمانە، بە خۆی و بە دارعەساکەی دەسییەوە، چاوەڕوانیدەکردم. سواری ئۆتۆمۆبیل بووین و

ڕۆیشتین. « جەلال »یش لەوێ بوو. گوتم: باشە، « جەلال »یش لێرەیە، تا هێندێ، لە بارەی ئەو باسانەوە قسەبکەین. من گوێم لە « برایم » ڕاگرت، گوێم لە « جەلال »یش بوو. هێندێ شتمان باسکرد. منیش، لەو بارەیەوە، هێندێ شتی پچووکم هەبوو، حەزم نەکرد، ئاراستەیانکەم.
– کاتێ، لەگەڵ « بارزانیی »دا پێکدەگەیشتن، باسی ناکۆکییەکانی نێوانیانی بۆ نەدەکردی؟
نەخێر. بەشێوەیەکی تەمومژاویی دەریدەبڕی.
– چۆن؟
دەیگوت: من « برایم »م هێنا. بڕوام بە « جەلال » هەبوو. بەڵام « برایم » و « جەلال »، ناپاکییان لێ کردم. بەو شێوەیە باسیدەکردن. پێش کارەساتەکەش، دوا شت ئەوەبوو، « برایم » هات بۆ لام. خۆی باشی لە بیرە. گوتی: با بڕۆین، ماڵاوایی لە « مەلا مستەفا » بکەین. پێکەوە بچین و دەربارەی ڕێککەوتنەکەی « جەزایر » قسەی لەگەڵ بکەین.
– مامۆستا « برایم »یش، لە چاوپێکەوتنەکەیدا، باسی ئەو شتانەی کردووە.
ئەو شەوە، لای من مایەوە. تا نزیکی بەرەبەیان، قسەی بۆ کردم. بۆ بەیانیی، « برایم » لای من دانیشتبوو. وەڵاممان بۆ « مەلا مستەفا » نارد. بێ گومان، ناوی منی نەبردبوو، چونکە، من زەوقم نەبوو، حەزم نەدەکرد، بچم. « برایم » دەیگوت: کە چووین بۆ لای، پێی دەڵێم: با دەس بە بەرگرییکردن بکەین، وەک چۆن لە سەرەتادا دەسمانپێکرد. ئێمە، لە سەرەتادا هیچمان نەبوو، یارمەتیمان لە « ئێرانیی »یەکان وەردەگرت. ئێستە، هەموو شتێکمان هەیە، چەکمان هەیە، هێزێکی زۆرمان هەیە ... تاد. « مەلا مستەفا » گوتبووی: کاتێکیان بۆ دیارییکەن. منیش گوتم: من نایەم، بۆچی بچم؟
– ئایا، لە سەر پارە و چەک، ناکۆکیی لە نێوان « بارزانیی و برایم ئەحمەد »دا هەبوو؟
نەخێر.
– لە سەرەتای شۆڕشەوە تا ساڵی « 1964 »؟
نەخێر. هەرگیز، باسی پارە و چەک لە گۆڕێدا نەبوو. بەڵام، شتێکی دیکە هەیە، « جەلال »، تا دوا ساتیش، لە نێوان هەر دوولایاندا دوودڵبوو.
– دەمەوێ، ئەم خاڵەم بۆ ڕوونترکەیتەوە.
نازانم، نازانم. « مەلا مستەفا »، « جەلال »ی زۆر خۆشدەویست.

ـ « هەژاری موکریانیی »ش لە باسی ژیننامەی خۆیدا، لە پاشکۆی پەرتووکی « شەرەفنامە »دا، هەمان شتی نووسیوە و گوتوویەتی: « بارزانیی » دەویست، لەبری « برایم ئەحمەد »، « جەلال تاڵەبانیی » بە سکرتێر دانێ. ئایا، ئەو قسەیە تا چەن ڕاستە؟

من، چۆن قسەم لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا دەکرد، « هەژار »یش، هەر بەو شێوەیە، قسەی لەگەڵ دەکرد.

ـ وەک برادەر؟

واتە: بە کراوەیی لەگەڵی دەدوا.

ـ لە سیمینارەکەی « ستۆکهۆڵم »دا گوتتان: لە سەرەتای شۆڕشدا، دەربارەی کێشەی « ئەمێریکا و یەکێتی سۆڤێت »، ناکۆکیی لە نێوان « بارزانیی و برایم ئەحمەد »دا هەبوو. ئەو ناکۆکییەش، لە ڕووی پێوەندییەکانی دەرەوەی شۆڕشەوە، بە ناکۆکییەکیی دیپلۆماسیی دادەنرێ. ئایا دواتر ئەو ناکۆکییە، لە نێوانیاندا قووڵبۆوە؟ ئایا دەتوانین، بە یەکێ لە خاڵەکانی دووبەرەکییەکەی ساڵی « 1964 »ی دابنێین؟

ئاخر، ئەوە ئەو بەزمەی دروسکرد و گەیاندنیە ئەو بارە. لە کاتی خۆیدا، « ئەمێریکایی »یەکان دەیانویست، دەسەڵاتی « عەبدولسەلام عارف » بچەسپێنن. بۆ؟ لەبەرئەوەی، « بەعسیی »یەکانی دامرکاندەوە و پەرشوبڵاوی کردنەوە. « بەعسیی »یەکان، لە سەرەتادا، پارەیان لێ وەرگرتن، پەیمانێکی زۆریان پێ دان. پاشان، پشتیان تێکردن و بە لای « سۆڤێت »دا دایانشکاند. کاتێ، « عەبدولسەلام » هات و لە «18/نۆڤەمبەر»دا لە « بەعسیی »یەکانی دا، « ئەمێریکایی »یەکان، لەوە دەترسان، « عەبدولسەلام عارف »، خۆی لە باوەشی « جەمال عەبدولناسر» بهاوێژێ. کاتێ، « عەبدولسەلام » بە کردەوە سەلماندی، نایەوێ، وەک سێبەرەکەی « عەبدولکەریم قاسم » وابێ و دوای بکەوێ، لە هەمان کاتیشدا، « عەبدولناسر » بە سەرۆکی خۆی قەبووڵ ناکا، ئیدی، لەو ڕووەوە، ئاوێ بە دڵی « ئەمێریکایی »یەکاندا کرا. هەروەها، کاتێ بینیان، پێوەندیی لەگەڵ « سۆڤێت »دا خراپە، یەکسەر، باوەشیان بۆ کردەوە. « ئەمێریکایی »یەکان، لەو بارەیەوە، وەڵامیان بۆ « مەلا مستەفا » نارد. لەوە دەچێ، « مەلا مستەفا »، ئۆرگانی هەستی شەشەمی بەهێزبووبێ. دەیزانی، « سۆڤیەت » بڕوای پێ ناکەن. گەر، تۆ پەرتووکی « ریحلە ئیلا رجال ئەلشوجعان »ت خوێندۆتەوە، لە ساڵی « 1947 »دا، کاتێ « بارزانیی »، لە

« تاران » لەگەڵ باڵوێزەکەدا یەکدیان بینی، داوای پەنابەریی لێ کرد. من، ئەو کاتەی، ساڵی « 1973 » ڕۆیشتم بۆ « بێروت »، بەو مەبەسە پێوەندییم کرد. لەو کاتەدا، پێوەندیی لەگەڵ « ئەمێریکا »دا، تەنیا لە ڕێی منەوە نەبوو، بەڵکوو، لە ڕێی « زەید ئەحمەد عوسمان »یشەوە هەبوو. باڵوێزی ئەمەریکی ناوی « Bathm » بوو، کە دواتر، لە وەزارەتی دەرەوە کاریدەکرد و سەرۆکی بەشی « ڕۆژهەلات » بوو. من لە « بێروت »، لەگەڵی دانیشتبووم، قسەمان دەکرد، پێی گوتم: ئێستە، « زەید » لە فلان شوێنەوە، بۆ « واشنتۆن » بە ئاسمانەوەیە و هەمان ڕاسپاردەی تۆی پێیە.

– بەڵێ. من دەمەوێ، ئەوە بزانم، ئایا « بارزانیی »، لە سەر کێشەی « ئەمێریکا و سۆڤێت »، ناکۆکیی لەگەڵ « برایم ئەحمەد »دا هەبوو، لەبەر ئەوەی، تۆ لە سیمینارەکەی خۆتدا باسکرد؟

بێ گومان، ئەوە بۆچوونێکە. بەلام، بابەتەکە خۆی لە چیدا دەبینێ، ئەو، لە ناخی خۆیدا دەیویست، بۆ « ئەمێریکایی »یەکانی بسەلمێنێ و پێیان بڵێ: ئەو کەسەی، ئێوە بڕواتان پێیەتی و ئامۆژگاریی من دەکەن، تا لەگەڵی ڕێککەوم، هەرگیز، هیچ جۆرە مافێ بە کورد نادا.

– ئەو کەسە کێ بوو؟

« عەبدولسەلام عارف » بوو. لەبەرئەوە، « مەلا مستەفا » دەیویست، دوو چێشکە، بە بەردێ بپێکێ. ئەم شتەش، کەی دەرکەوت؟ کاتێ، نوێنەرانی دەوڵەتی « عێراق » هاتن، « مەلا مستەفا » چاوی بە نوێنەرەکان کەوت، تێگەیشت، نوێنەرەکان، هەڵوێستی خۆیان ناگۆڕن و نالەقێن، تەنانەت، نەیاندەویست، دان بە مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورددا بنێن. ناردی بە دوای « برایم ئەحمەد و جەلال »دا. واتە: بە لای ئەواندا بایدایەوە، تیشکی سەوزی بۆ هەڵکردن و پێی گوتن: من قسە ناکەم. ئێوە، ئەو شتەی دەتانەوێ، داوایکەن. ئەوە یەکەم کاری بوو، تا بە نوێنەرەکەی « ئەمێریکا » بڵێ: تەماشاکەن، من، تا ئەندازەی ئاگربەستیش، لەگەڵیاندا ڕۆیشتم، بەلام ئەوان، لە شوێنی خۆیان ناجوڵێن و بیروڕای من وەرناگرن. ئەمەشی بۆ ئەوە کرد، تا دۆستایەتیی خۆی، لەگەڵ « ئەمێریکا »دا تێک نەدا. بەلام، « برایم » لە مەبەسەکەی تێ نەدەگەیشت و هەستی بەوە نەدەکرد، کە ئەم کارەی « مەلا مستەفا »، پرۆسێسێکی سەرکەوتووە و قازانجی لێ دەکرێ. دوایی، هەموویانی کۆکردەوە، کۆنگرەی بەست و بڕیاریان لە سەر ئەو شتە دا.

- واتە: مامۆستا « برایم ئەحمەد »، بە پێچەوانەی « بارزانیی »یەوە، بە لای « سۆڤێت »دا دایدەشکاند؟
بەڵێ. بڕوای پێیان بوو.

**پ10** : ئایا، دێمۆکراسیی وەک شێوازی کارکردن، لە نێو « پارتیی »دا، بە شێوەیەکی گشتیی و لە نێوان ئەندامانی پەلیتبیرۆدا بە شێوەیەکی تایبەتیی، ڕەچاودەکرا؟
**و10** : بە هیچ شێوەیە. هەرگیز، شتێ نەبوو، لە نێو پەلیتبیرۆدا، ناوی دێمۆکراسیی بێ. هەموو فرمانەکان، لە سەر ڕێیوشوێنی « پارتە کۆمۆنیستەکان »، لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەردەچوون.
- باشە. گەر دێمۆکراسیی نەبوو، پێوەندیی نێوان « بارزانیی » و پەلیتبیرۆ چۆن بوو؟
بیرۆی « ئیدریس و مەسعوود » هەبوو.
- مەبەستان لە بارەگای « بارزانیی »یە؟
بەڵێ.
- ئایا دەتوانین، « بارزانیی » بە دیکتاتۆرێ لە سەر « پارتیی » ناوبەرین؟
« مەلا مستەفا »، دەسەڵاتێکی دیکتاتۆرانەی، لەگەڵ « پارتیی »دا پیادەدەکرد. بەڵام، لەگەڵ شێوە و ئەو پێناسانەی دیکتاتۆریی، کە لە پەرتووکەکاندا هەیە، جیاوازبوو.

**پ11** : ڕۆڵی « پارتی کۆمۆنیست »، لە دووبەرەکییەکەیساڵی « 1964 »دا، چی بوو؟
**و11** : زۆر ئاڵۆزبوو. چونکە، ڕۆڵی ئەوان، دووسەرەبوو. ئەمەش، بۆ دەرکەوتەیەکی دیاریکراو دەگەڕێتەوە. دوای کۆدەتاکەی « 8/فێبرووەری »، کاتێ « کۆمۆنیستەکان »، بە کۆمەڵ بۆ « کوردستان » ڕایاندەکرد، لەوانەش، « عەزیز شەریف » و هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی، پەنایان بۆ شۆڕش دەهێنا. ئەو کاتەش، ڕێککەوتن لەگەڵ « بەعسیی »یەکاندا، بە دەس « برایم ئەحمەد »ەوە بوو. ئەویش، بە هۆی « کەریم قەرەنیی »یەوە دەسیپێکرد. ئەفسەرێکی کۆن بوو. دەیناسی؟
- بەڵێ.

« کەریم »، پێوەندیی لەگەڵ « تایەر یەحیا »دا دامەزراند. یەکەم هەنگاو ئەوە بوو، دەیانویست، دەسپێشکەرییەکە، لە دەس بارەگای « بارزانیی » وەرگرن و کێشەکە، لەگەڵ دەسەڵاتدارانی نوێدا ببڕێننەوە. هەموو ئەو کۆمۆنیستانەی دەهاتن، دەیان گرتن و دەیان دانەوە دەس « بەعسیی »یەکان.

ـ کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد » ؟!

بەڵێ.

ـ ئەوە یەکەم جارە، شتی وام گوێ لێ دەبێ!

لە منی وەرگرە. من، بۆت باسدەکەم. لەو کاتانەدا، « مەلا مستەفا » دەرگەی بۆ کردنەوە و هەموویان، هاتن بۆ لای ئەو. لەوانەش، هەموو ئەندامانی پەلیتبیرۆ هەڵاتن و هاتن. ئەدی، لە بەر چی، من بە دڵمبوو! لەبەرئەوەی، لەو بارانەوە، زۆر بە باشی، دەسی خۆی دەوەشاند، زۆر سەیربوو! ئەو پیاوە، دووربینبوو. واتە: دەیزانی، ڕۆژێ لە ڕۆژان، لەگەڵ « بەعسیی »یەکاندا، ڕێک ناکەوێ. بەڵام، بەرانبەر « کۆمۆنیست »ەکان دەبێ، هەڵوێستی هەبێ. هەر لە بەر ئەو هۆیەشە، « کۆمۆنیست »ەکان خۆشیاندەوێ.

ـ بەڵێ. تەنانەت، لە دووبەرەکییەکەشدا، دژی کۆمەڵەکەی « جەلال تاڵەبانیی » پشگیریی « بارزانیی »یان کرد.

دوایی، بوون بە دوو بەشەوە. بەشێکیان دەیانویست، ئاشتیانکەنەوە. واتە: هەمیشە ئەوان، وەک ئەو « تورکمانە » سەگانەی، ئێستە لە « کوردستان » هەن، وابوون. تۆ، گوێت لە قسەکانی « عیسمەت قۆجاق » بووە؟

ـ بەڵێ. لە ڕۆژنامەی « ئەلشەرق ئەلئەوسەت » دا خوێندمەوە.

تەماشاکە، بزانە، کار بە چی گەیشتووە؟! چەن شوورەییە! بە چ نزمیی و سوکییەک گەیشتوون! ئەوان، چەکدار کراون، لە نێوان « پارتیی » و « یەکێتیی »دا، وەک هێزێکی نێوبژیکار دامەزراون. ئەو بەشەی کۆمۆنیستەکانیش دەیانویست، ئەو ڕۆڵە ببینن.

ـ وەک کێ؟

وەک کۆمەڵەکەی « بەهادین نووریی » و هێندێکی دیکەش.

ـ واتە: دەیانویست، ڕێکیانخەنەوە؟

بەڵێ. ئەوەش، ئەو کاتە لای « مەلا مستەفا »، پەسەند نەبوو. بە داخەوە، زۆر لە کۆمۆنیستەکان گیانیان لە دەسدا، لەبەرئەوەی، دایاننەوە بە حوکوومەت.

ـ ئەدی ئەو کۆمۆنیستانەی، پشگیریی « بارزانیی »یان دەکرد، کێ بوون؟

هەموو ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی بوون.
ـ واتە: جگە لە « بەهادین نووریی »؟
بەڵێ. ئەوانەی، پەنایان بۆ « مەلا مستەفا » هێنا، هەموویان، لە کەڵەکەڵەکانی جووڵانەوەی « کۆمۆنیستیی » بوون، وەک « عەبدولقادر ئیسماعیل، عەزیز شەریف، عەبدوڵلا ئیسماعیل بوستانیی و عامر عەبدوڵلا ». پاشان، بەرەو « سووریا » ڕۆیشتن، لەوێشەوە، چوون بۆ « سۆڤێت ». « مەسعوود محەمەد » و هێندێ کۆمەڵی دیکە مانەوە.
ـ « عەزیز محەمەد ».
هەمیشە تێکەڵاویاندەکەم.
ـ کەواتە: لە هەموو بارێکدا، کۆمۆنیستەکان دەسیان لە دووبەرەکییەکە و قووڵبوونەوەی ناکۆکییەکەدا هەبووە؟
بەڵێ. حەزیاندەکرد، هێزێکی لاواز هەبێ، لەبەرئەوەی دەیانویست، ڕۆڵی نێوبژیکار ببینن و لەو نێوەدا، جێ پێی خۆیان بکەنەوە و وردەوردە بەهێزبن.

**پ12** : ڕۆڵی ئەم دەوڵەتانەی لای خوارەوە لە دووبەرەکییەکەدا چی بوو؟
ـ « عێراق ».
**و12** : لە ناکۆکییەکەدا ڕۆڵی هاندەریان هەبوو.
ـ « ئێران ».
ئەو کاتەی، « برایم » و ئەوان، بۆ « ئێران » هەڵاتن، وەک خۆی بۆی باسکردم، لە بارودۆخێکی زۆر خراپدا بوون. « ئێران » دەیویست، لەو ناوەدا، گەمەیە بکا. دەیویست، لەگەڵ سەرکەوتوودا بێ. لە هەمان کاتدا، لە بنەڕەتدا، پێوەندییەکە لەگەڵ « برایم »دا بوو. لەبەرئەوەی، « مەلا مستەفا »، کاتێ « ئێرانیی »یەکان پێوەندییان پێوە کرد، لە ڕێی مامی « عەلی عەبدوڵلا »وە پێوەندییان پێوە کردن.
ـ مامی « عەلی عەبدوڵلا »؟
بەڵێ. ئەو پیاوە، ژەنەڕاڵ « سەیادیی » دەناسی، سەرۆکی « ساواک »ی « ورمێ » بوو. بەو شێوەیە، دەنگی ئەو پێوەندییە بڵاوبۆوە. « مەلا مستەفا »، لە سەر ئەوە سووربوو، « برایم ئەحمەد » و « جەلال » بنێرێ، تا لەگەڵیان ڕێککەون.
ـ مامۆستا « برایم »یش، هەر بەو شێوەیە باسیدەکا.

بەڵێ. بەڵام، « برایم » ئەوەی ڕەتکردەوە. تۆ، ئەو شتانەی لە منی وەردەگری، وێنەی نییە. کاتێ، « برایم » و « جەلال » و کۆمەڵەکەیان، بەرەو « ئێران » دەرچوون، ماوەی ساڵ و نیوێ مانەوە. « برایم و جەلال »، لە بارەی ژیانی خۆیانەوە، زۆر شتیان بۆ باسکردووم. بێ گومان « محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانیی »ش، باسی باری ژیانی خۆیانی بۆ دەکردم. لەبەرئەوەی، « ڕۆژبەیانیی »شیان لەگەڵدا بوو. « جەمیل »، برا و دۆستێکی ئازیزمە، نامەم بۆ دەنێرێ و داوای بەرهەمەکانم دەکا.

ـ ئێستە، لە « بەغدا »یە؟

بەڵێ. پاشان لە سەرەتای ساڵی « 1966 »دا، « برایم و جەلال »، پێوەندییان کرد و گەڕانەوە. لە سەرەتاوە، پێوەندییەکە بە « تایەر یەحیا » و ئەفسەرەکانی سوپاوە بوو. گرنگ ئەوەیە، پێوەندییان بە « عەبدولڕەحمان بەزاز »ەوە کرد. لەو بڕوایەدام، « برایم » خۆی، « بەزاز »ی دەناسی.

ـ وا بزانم، لە زانکۆی « بەغدا »، مامۆستای « جەلال تاڵەبانیی » بووە، ئەو زیاتری دەناسی.

بەڵێ. « جەلال »یش دەیناسی. بێ گومان، ئەمە خۆی لە خۆیدا، کارتێکی دیاریکراوی باشبوو. خۆشهاتنیان لێ کردن، هەموویان گەڕانەوە و مافی دەرکردنی، ڕۆژنامەیەکیان دانێ. بە ناوی « پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عێراق »یشەوە کاریاندەکرد. کاتێ، لە سەر بڵاوکراوەکەی « 29/یوون »، گفتوگۆ دەسپێکرد، « بەزاز »، پێی لە سەر ئەوە داگرت و گوتی: دەبێ، لای دووەمیش ئامادەبێ و لە گفتوگۆکەدا بەشدارییبکا. « مەلا مستەفا »، پێی ناخۆشبوو، تا دوا ساتەکانی گفتوگۆ، لە سەر ئەوە سووربوو، نابێ، دوو گفتوگۆ هەبێ. بەڵام، ئەندامانی پەلیتبیرۆکەی خۆی، بە سەریدا سەرکەوتن. « مەلا مستەفا »، دیکتاتۆربوو، بەڵام، کاتێ ڕووبەڕووی، کۆمەڵێکی یەکدەنگ دەبۆوە، ملیدەدا. من، لە چەن شێوەیەکی وادا بینیومە.

ـ بۆ نموونە؟

بۆ نموونە: ساڵی « 1974 »، پێش ئەوەی، جارێکی دیکە، جەنگ لە کوردستاندا دەسپێبکاتەوە، ئەندامانی پەلیتبیرۆ، هەموویان لە ترسی تازەبوونەوەی جەنگ، زارەترەکبووبوون، مردبوون. هەر لە « نافیز جەلال »ەوە تا « سامیی »، هەموویان دژی جەنگبوون. ئەو کاتە، من و « مەلا مستەفا »، تەنیا یەک دیوارمان لە نێواندا بوو. هەموو ڕۆژێ، من دەمبینی. هێندێ جار،

پێکەوە « شەترنج »مان دەکرد و هێندێ جاری دیکەش، پێکەوە تەماشامان دەکرد. هێندێ جار، ئەو سەری لە من دەدا، هێندێ جاری دیکەش، من دەچووم بۆ لای. ئەمەش، هەمووی لە بەیانییاندا بوو، پێش ئەوەی، دانیشتنەکانی دەسپێبکا. مەبەسم ئەوەیە، ڕۆژ نەبوو، ئێمە یەکدی نەبینین. لەو کاتانەشدا، ئەو دەیزانی، پێوەندیی نێوان من و پەلیتبیرۆ، بە تەواویی پچڕاوە و تەنانەت، سەرەداوێکیشمان لە نێواندا نەماوە. حەزم نەدەکرد، بە هیچ شێوەیە، کەسیان لێ ببینم. « مەلا مستەفا » پێی گوتم: تۆ لای من دەبی. جا بزانە، پێوەندییمان چۆن بوو! هەموویان، لەوە دەترسان، شوێنەکانیان لە دەسچێ. دەیانویست، دوا مووی پێوەندییەکانی نێوانیان لە پچڕاندن ڕزگار کەن. بەڵام، « مەلا مستەفا » بڕیاربوو، جەنگ دەسپێبکاتەوە. ئەو شتە، کۆتاییپێهاتبوو. چونکە، هیچمان دەست نەکەوتبوو. بە هۆی « سامیی »یەوە، تەنانەت، « کەرکووک »یشمان لە دەسچووبوو.

ـ بۆ؟

پێم گوتی: کاتێ گفتوگۆ دەسپێکرد، لە سەر کێشەی « کەرکووک »، « مەلا مستەفا » تووڕەبوو. « عەبدوڵڵا سەلوم سامەڕایی » دەرکرد. داوای لە من کرد، هەر لە کۆنەوە تا ئەو ڕۆژە، دەربارەی ڕەسەنێتی « کەرکووک » و کوردێتی « کەرکووک »، باسێکی مێژوویی ڕووت بنووسم. لێکۆڵینەوەیەکم نووسی و بڕیاردرا، چاپکرێ، بەڵام، بە دەسی ئانقەس چاپ نەکرا و سەری تێداچوو. بە داخەوە نازانم، چییان لێ کرد! ئەوانەی پەلیتبیرۆ بە ترس و لەرزەوە چووبوون بۆ لای و پێیان گوتبوو: گەر جەنگ دووبارەبێتەوە، گرفتێکی گەورە دروسدەبێ و تووشی زیان دەبین. هێندێ قسەی دیکەی، لەو بابەتانەیان بۆ کردبوو. لەو بڕوایەدام، ئەوان لە سەر هەقبوون. لەبەرئەوەی، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا زانیبوویان، بە کردەوەکانیان، چۆن ورەی پێشمەرگە بڕوخێنن! هەستیان بەوە دەکرد، ئیدی پێشمەرگە، بە هەمان دڵ و گیان شەڕ ناکەن، وەک چۆن، لە ساڵی «1961»دا شەڕیاندەکرد. بەڵام، بێ گومان باسی، کردەوەکانی خۆیان نەدەکرد.

لەبەرئەوە، هەموو پێکەوە، بە یەکجار، چووبوون بۆ لای « مەلا مستەفا » و گوتبوویان: بەڵکوو، « ئیدریس » بچێ بۆ « بەغدا » و دواپێشنیاز، پێشکەش بە « بەعس » بکا. پێشنیازەکەش ئەوەبوو، ڕاگەیاندنی « ئۆتۆنۆمیی » دواخرێ. ئەمە ژوورەکەی من بوو، ئەوەش ژوورەکەی « مەلا مستەفا » بوو. دەمبینین،

چۆن هەموویان ڕیزبووبوون. هەموویانم کەبسکردبوو. دەمزانی، شتێ هەیە. من، خۆم لێ دووردەخستنەوە!
دوایی، بڕیاریاندا، « ئیدریس » بچێ بۆ « بەغدا » و چاوی بە « سەددام » بکەوێ، بۆ ئەوەی، هەرچییەکیان لەو تاڵەمووە، پێ ڕزگاردەکرێ، ڕزگاریکەن. چونکە دەیانزانی، گەر ئیشەکە دواخرێ، ئیدی کێشەکە، وەک خۆی دەمێنێتەوە و دەمەێ. لە کۆتاییشدا، سەری خۆمان، لە بەردەمی« سەددام »دا ڕادەگرت، تا بۆی بتاشینایە!
بەڵام، من « سیخوڕ »م هەبوو، ئەویش « سابیر »ی برای « ئیدریس » بوو. گوتم: « سابیر » برۆ، بزانە، ئەوانە بۆچی هاتوون؟ دوای ماوەیە، پێی گوتم: بۆ نازانی، هاتوون، تا « ئیدریس »، بۆ لای « سەددام » بەڕێکەن، بۆ ئەوەی، هەر یەکەیان لە جێی خۆی بمێنێتەوە؟! ئەو شتە دیاربوو.
ــ شانۆگەریی بووە!
بەڵێ. شانۆگەریی بوو. بە « سابیر »م گوت: ئەمە بە قسە ناکرێ، دەمەوێ، نامەیە بۆ « مەلا مستەفا » بنووسم. پێی دەڵێم: هەڵەیەکی گەورە دەکەی، گەر « ئیدریس » بنێری بۆ « بەغدا ». لەبەرئەوەی، یەکەم: ئەوە خاڵێکی لاوازی گەورە پیشاندەدا. دووەم: هیچمان لێ دەس ناکەوێ. چونکە، لە بنەڕەتدا، ڕێککەوتننامەی « 11/مارس » بۆ ئەوەبوو، « بەعسیی »یەکان بەهێزبن، تا جارێکی دیکە، لێمانبدەنەوە.
ــ زۆر ڕاستە.
دانیشتم و بۆم نووسی: دەمەوێ، بیرتبخەمەوە، تۆ پێویستت بە بیرکردنەوە هەیە. ئەو کارە هەڵەیە و نیشانەی لاوازییە ... هتد. نامەکەم نووسی و دام بە « سابیر ». ئەوانیش، هەموو لە کۆبوونەوەکەدا دانیشتبوون. « سابیر » یەکسەر ڕۆیی و نامەکەی دابوویە. نازانم، دوایی چی ڕوویدا، بەڵام، دوای ئەوەی، ئەوان دەرچوون، من سەردانی « مەلا مستەفا »م کرد. گوتی: چۆن دەزانی، ئەوانە هاتوون، بۆ ئەوەی « ئیدریس » بنێرم بۆ « بەغدا »؟ گوتم: ئیدی زانیوومە. لێم پرسی: دوابڕیارت چییە؟ گوتی: نامەکەی تۆم خوێندەوە، هەر ئەوەیە تۆ نووسیوتە. بەڵام، من بە تەنیابووم و ئەوان هەموویان، لەو بوارەدا یەک وون. گوتم: تۆ لە کوڕەکەت ناترسی، وا نامەی پێدا دەنێری؟ ویستم، هەستی باوکی تێدا بجوڵێنم. گوتی: ئەوان بڕیاریانداوە، بچێ. من ناتوانم، بڵێم: نابێ. تۆ نموونەت نەویست، ئەوە نموونەیەکبوو.

ـ « توركيا ».
لەو بارەیەوە ناتوانم، شتێک بۆ باسکەم. بەڵام، لەو کاتانەدا، « تورک »ەکان، بە تەواویی، لە هەڵوێستمان ڕازییبوون.
ـ واتە: لە هەڵوێستی « بارزانیی » ڕازییبوون؟
بەڵێ.
ـ « سووریا ».
لە ڕاستییدا، لەگەڵ « سووریا »دا پێوەندییمان هەبــوو. پێوەندییمان، لەگەڵ « سووریا »دا، لە ئەنجامی ئەو ناکۆکییەدا بوو، کە لە نێوان « بەعس »ی ژمارە یەک لە « بەغدا » و ژمارە دوو لە « دیمشق » زیادیکرد. واتــــــە: لە نێوان « سەددام » و « حافز ئەسەد »دا بوو. پێوەندییمان لەگەڵ دروسکردن و تا ڕۆژی ڕێککەوتننامەکەی « جەزایر »یش، ئەو پێوەندییە هەر بەردەوامبوو. پێش ئەوەی، « مەلا مستەفا »، بڕیاری کشانەوەی تەواو بدا، پەلیتبیرۆ، بە ڕەزامەندیی « ئیدریس و مەسعوود » بڕیاریاندا، « ساڵح یوسفیی و عەلی سنجاریی »، و وا بزانم، « دارا تۆفیق »یش بنێرن بۆ « سووریا ». بۆ ئەوەی بزانن، هەڵوێستی « سووریا »، لەو بەسەرهاتەدا چۆن دەبێ. تا چ ئەندازەیەک دەتوانن، یارمەتیمانبدەن، تا لە سەر بەرەنگاربوونەوە بەردەوامبین. دوایی، هەموو شتەکان تێکچوو.
ـ من مەبەسم لە ڕۆڵی « سووریا »یە لە دووبەرەکییەکەدا.
هیچ جۆرە ڕۆڵێکیان نەبوو. زۆر دووربــــــــــــوون. چونکە لەو کاتانەدا، « سووریی »ەکان، بە دەس گرفتی گەورەی تایبەتیی خۆیانەوە، دەیان نالاند.

**پ13** : خەسڵەتی ئەو پێوەندییەی، لە سەرەتای دامەزراندنی « پارتیی »دا، لە نێوان « بارزانیی » و کادێرە ڕووناکبیرەکاندا هەبوو، چۆن بوو؟ بۆ نموونە: لەگەڵ « هەمزە عەبدوڵڵا » و « عەلی عەبدوڵڵا »دا، پێوەندییان، لەو ڕووانەوە چۆن بوو؟
**و13** : بە خوا، لە ڕاستییدا، پێوەندییەکی زۆر باشبوو. بۆ نموونە: « مەلا مستەفا »، بڕوایەکی زۆر گەورەی، بە « هەمزە » هەبوو. واتە: نامەی، بە سپێتی بۆ ئیمزادەکرد.
ـ ئەدی دوای ئەوەی، لە « یەکێتی سۆڤێت »ی پێشوو گەڕایەوە؟
من لەو بڕوایەدام، هەر کەسێ سەردانیدەکرد، پێوەندیی لەگەڵدا دەبەست.

بەڵام، ئەو خۆی دانەدەبەزییە خوارەوە، لەبەرئەوەی، پیاوێکی خێڵەکییبوو، پێوەندییەکانی، لە سەر ئاستی خێڵەکیی دامەزراندبوو، لەگەڵیاندا، شاد دەبوو. بەڵام، هەمیشە لەگەڵ دەستەی ڕووناکبیراندا، هەستی بە جۆرە لە ڕوودامانێ دەکرد.

ـ ئایا، لە نێوان « بارزانیی » و ئەندامانی پەلیتبیرۆدا، لە ڕووی ڕووناکبریی و ئاستی ڕامیارییەوە، جیاوازییەکی زۆر هەبوو؟

داوای لێبووردندەکەم، ئەو پرسیارە، ساکارییەکی زۆری پێوە دیارە. لەبەر ئەوەی ناشێ، لەو ڕووەوە، شتێ دەربارەی ئەو پێوەندییە پێشبینیبکرێ. بۆ نموونە: « مەلا مستەفا »، لە ڕێکخستنی ئەم ڕێکخراو یا ئەو لیژنەی ناوچەدا دانەدەنیشت، قسەیان بۆ بکا. ئەوانەی هەموو، بۆ پەلیتبیرۆ بەجێهێشتبوو.

ـ ڕاستە. بەڵام لە سیمینارەکەی خۆتاندا گوتتان: « بارزانیی » مرۆڤێکی ڕووناکبیربوو. چۆن؟

ئەو پلەی ڕووناکبیرییەی، ئەو هەیبوو، چۆن بوو؟ یەکەم: زمانی « فارسیی »، بە شێوەیەکی زۆر باش دەزانی. هۆنراوەی « فارسیی » دەخوێندەوە. هەموو دیالێکتەکانی، زمانی « کوردیی » دەزانی. ماوەی یەک کاژێر یا دوو کاژێر، لە سەر یەک، بە « عەرەبیی » دەدوا و چاوی بۆ نەدەنوقاند. گەر تۆ، گوێت لە گوتارەکەی کۆنگرەی هەشتی بووایە، کە هەمووی بە « عەرەبیی » خوێندەوە، ئەو کاتە بۆت دەردەکەوت، چۆن « عەرەبیی »یەکی دەزانی!

ـ زمانی « ڕووسیی »شی دەزانی.

« ڕووسیی »یەکی دەزانی، تەنانەت، هێندێ « ڕووس »، شەرمیان لێ دەکرد. من هاوڕێیەکم هەبوو. نازانم، لێرەدا بۆم باســــــکردووی، یانا؟ ئیشوکاری « پۆڵۆنیا »ی دەکرد. دەهات بۆ لام، گوێی لە موزیکی کلاسیک دەگرت. من خۆم، شەیدای موزیکی کلاسیکییم. ئەویش دەیوست، تۆماریانکا. دۆستایەتییەکی باش، لە نێوانماندا دروسبووبوو. لە هەمان کاتدا، برادەری « مەلا مستەفا »ش بوو.

لە بارەی کەسایەتیی « مەلا مستەفا » و تێبینییەکانی خۆی لە سەری، دەیگوت: کاکە! من خۆم دایکم « ڕووسیی »یە، دەبێ، من بە « ڕووسیی »یەکی زۆر باش، قسەبکەم، هەر وەک چۆن، « ڕووس »ەکان قسەی پێ دەکەن، لەبەر ئەوەی، لەگەڵ زمانی دایکدا فێریبووم. کاتێ « مەلا مستەفا »، بە « ڕووسیی» قسەم لەگەڵدا دەکا، من تەریقدەبمەوە!

ـ ببوره. زمانزانی،ن پێوەندییەکی زۆری، بە ڕووناکبیرییەوە نییە. بەڵکوو، زیاتر پێوەندیی، بە « لێهاتوویی، بەهرە و زیرەکیی »یەوە هەیە.
هەموو زمانێ، بەرانبەر بە یەک کەسە. لەبەرئەوەی، ئەوە کەسەی زمان دەخوێنێ، پێویستە، بە دوای نووسین و وێژەی ئەو زمانەدا بگەڕێ و بیخوێنێتەوە. « مەلا مستەفا »، ماوەی دوازدە ساڵی ژیانی، لە « ڕووسیا » هەروا بەخۆڕایی، بە سەر نەبردووە و « ڕووسیی » خوێندووە. ئێستە دەزانی، مەبەسم لە چییە؟
ـ بەڵێ.
من لە « دیلمان »، سەرم لە ژوورە تایبەتییەکەی خۆی داوە. پەرتووکخانەیەکی زۆر گەورەم دیوە، تا سەرەوەی، بە پەرتووکی « ئایینیی » و « عەرەبیی و کوردیی » سیخناخکرابوو.
ـ ئەدی « ڕووسیی »؟
« ڕووسیی »ش. هێندێ جار، دەربارەی « فقەی ئیسلام »ی دەمەتەقێم لەگەڵدا دەکرد، زۆر جاریش، لە دانیشتنەکانیدا، لەگەڵ زانا ئایینییەکاندا ئامادەدەبووم، دەربارەی کێشەی ئاین و لۆجیک، دەمەتەقێیدەکرد، زانیارییەکی زۆری هەبوو. بەڵام، ئەو وەک من و تۆ نەبوو، دانیشێ و لە چوارچێوەی قاڵبێکی دیاریکراودا، بیری خۆی دارێژێ. لەبەرئەوەی، لە شوێنێکی وا ڕێکوپێکی « ئایدۆلۆژیایی، فەلسەفیی و کەلتووریی »دا، گەورە نەبووبوو و پەروەردە نەکرابوو، یا، لە ئەڵقەیەکی ڕووناکبیریی دیاریکراودا، پێ نەگەیەندرابوو.
ـ ئەمانە هەمووی ڕاستن. ئایا، « بارزانیی » دەینووسی؟ تاقەتی نووسینی هەبوو؟ بۆ نموونە: نامەی دەنووسی؟ گوتاری دەنووسی؟
بەڵێ. نامەی تایبەتیی دەنووسی. بەڵام، گوتاری نەدەنووسی.
ـ بە دەسی خۆی، نامەی دەنووسی؟
بەڵێ. دوو یا سێ جار دیومە، بە « ڕووسیی » نامەینووسیوە، هێندێ جاریش، بە « عەرەبیی ». بەڵام بە زۆریی، کارەکانی خۆی، بە « ئیدریس و مەسعوود » ڕادەپەڕاند.
ـ واتە: لە دوای مردنی، هیچی لە پاش بەجێ نەماوە.
هیچ جۆرە شتێکی، بەجێ نەهێشتووە. هێندێ جار، باسی ئەو ڕووداوانەی بۆ دەکردین، کە لە کاتی گەشتەکەیاندا، لە « مهاباد »ەوە بۆ سەر سنووری

« سۆڤێت » کردبوویان، بەشێکی زۆریشی، لە پەرتووکەکەی « مەسعوود »دا هەیە.
– خوێندومەتەوە.
جگە لەوە، وا بزانم، کاتێ لە سەرەتادا گەڕایەوە، لەوانەیە، ساڵی « 1959 » بووبێ، لەو بارەیەوە ،گفتوگۆیەکی لەگەڵ گۆڤارێکی « بەغدادیی »دا کرد، تا ئێستەش، وێنەکەیم لەبەرچاوە، وەک ئەو وێنەیەی لای من، بەشی سەرەوەی لەشی دەرچووبوو. ئیدی لەوە زیاتر، هیچی دیکەی لێ نازانم.

**پ14 :** ئایا « بارزانیی »، بڕاوی بە پارتایەتیی و کاری ڕامیاریی هەبوو؟
**و14 :** لەو بوارەدا گرفتیکی دووفاقانەی هەبوو. هەمیشە دەمانبینی، کاتێ زویردەبوو، دەیگوت: « پارتیی » کێیە؟ « پارتیی » چییە؟ پێویست بە پارت ناکا. بەڵام، لە ناخی خۆیدا، هەستی بە پێویستیی بوونی « پارتیی » دەکرد. دەیزانی، پارت چەن پێویستە. ئەوەشی لە دوو شتەوە بۆ ساغبووبۆوە.
1. لە شۆڕشی ساڵی « 1945 »ی « بارزان »ەوە فێربووبوو. کەڵکی لە پەندەکانی شۆڕشی « بارزان » وەرگرتبوو. کاتێ لە شۆڕشی « بارزان »دا، ڕووناکبیرەکان چواردەوریان گرتبوو، هەموو پارتە نهێنییە کوردییەکان لەگەڵیدا بوون « ڕزگاریی، شۆڕش ... تاد » هەروەها، کۆمەڵەکان هەموویان لەگەڵیدا بوون، یارمەتیی شۆڕشیان دەدا، هەواڵ و دەنگوباس و بڵاوکراوەیان بۆ دەنارد و بە پارەش یارمەتییاندەدا.
2. دەیزانی، پارت بۆ کورد پێویستە. ئەمەش دیسانەوە، لە « سۆڤێت »ەوە فێربووبوو. لە ماوەی دوازدە ساڵدا تێگەیشت، هێز و توانای پارت چییە. بەڵام، لە گوتەکانیدا دووفاقیی هەبوو. لە دڵی خۆیدا دەیزانی، بێ « پارتیی » هیچ ناکرێ. بەڵام، لە نێوان نوێنەرانی « پارتیی » و خودی « پارتیی » خۆیدا، جیاوازییدەکرد. لەبەرئەوە، ئەو وەک کەسێ وابوو، شتێکی خۆشبوێ، بەڵام، لە بەردەمی خەڵکیدا وا پیشانبدا، کە ڕقی لێیەتی. هەستیدەکرد، « پارتیی » پێویستە، گەر ئەو هەستەی نەکردایە، لە مێژبوو، وازیلێدەهێنا و دەڕۆیشت.
– بەڵام، وەک لە ساڵی « 1964» و لە سەردەمی « عەبدولسەلام عارف »دا بیستمان، « بارزانیی » لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەکانی « عێراق »، گوتی: باوەڕم بە پارتایەتیی نییە، پێویست بە هیچ پارتێ ناکا و ئامادەم « پارتیی »ش هەڵوەشێنمەوە.

هەمووی درۆیە. ئەو شتانەی دەگوت، بەلام، بڕوای پێی نەبوو.
ـ واتە: ڕاستە، گوتوویەتی؟
بەڵێ. هەرگیز، بڕوای پێی نییە و بڕواشی بە پێویستیی پارت هەبوو.
ـ ئەوەیان شتێکی دیکەیە. باشە، بۆچی چەن جارێ، وازی لە « پارتیی »هێنا؟
هەمووی بە دەسی ئانقەسبووە.
ـ بۆ؟
چونکە دەیزانی، گەر وازبێنێ، پەسەندی ناکەن و « پارتیی »ش وەک هەیە، نامێنێ.
ـ چەن جار، وازی لە « پارتیی » هێنا؟
سێ جار.
ـ دەتوانین، بزانین، کەی و کەی بوو؟
نەخێر. نازانم، کەی بوو.
ـ تەنانەت، ساڵەکانیشت بیر نەماوە؟
نەخێر. بۆ « مەلا مستەفا »، چۆن وازیدەهێنا؟ وازهێنانەکەی ئەو، هەر بە دەمیبوو. هەرگیز، نامەیەکی نەدەنووسی و بلێ: بۆ بەڕێز: سکرتێری گشتیی « پارتی دێمۆکراتی کوردستان ـ عێراق، برایم ئەحمەد »، تکایە وازهێنانەکەم لێ قەبووڵکەن. پاشان، ئیمزایکا. ئەوەی هەرگیز نەدەکرد، چونکە، بڕوای بەوە نەبوو، کە یەکێ هەبێ، ئەو نامەی وازهێنانی ئاراستەکا. تێگەیشتی، چۆنی بووە؟

پ15 : بەڵێ. دوای ئەوەی، ناکۆکیی و دووبەرەکییەکە پەیدابوو، کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد »، بەرەو « ئێران » ڕۆیشتن. پاشان گەڕانەوە، ئایا، هەروا بە گۆترە گەڕانەوە، یا شتێ لە نێوان « بارزانیی » و ئەواندا هەبوو؟ گەر هەبوو، گەرەنتی چی بوو؟
و15 : داوایان لە حوکوومەتی « بەغدا » کرد، بگەڕێنەوە. ئەوانیش، دەرگەیان بۆ کردنەوە و بە شێوەیەکی زۆر ئاسایی، پێیان گوتن: وەرنەوە و کاری خۆتان بکەن.
ـ مەبەسم پێش ئەوەیە، کاتێ بۆ نێو ڕیزەکانی شۆڕش گەڕانەوە.
بەشێکی زۆریان، لە سەرکردەکانیان و بە سەدان لە کادێرەکانیان گەڕانەوە، تەنیا بەشێکی کەمیان مانەوە، ئەوانیش، پێوەندییان بە حوکوومەتەوە کرد.

- نەخێر. مامۆستا وانەبوو. وەک من بیستوومە، لە سەرەتادا، جگە لە مامۆستا « برایم »، « جەلال تاڵەبانیی » و هەموو سەرکردەکانی دیکەشیان گەڕانەوە، بۆیە گەڕانەوە، تا سەرلەنوێ، هەموو پێکەوە لە « پارتیی »دا کار بکەن و ڕاژەی شۆڕش بکەن. ئایا « بارزانیی »، هیچ گەرەنتییەکی دابوونێ؟
« مەلا مستەفا » بە هیچ شێوەیە، پێوەندیی بە سەر ئەو باسەوە نەبوو. ئەو لەو کێشەیەدا، دەسی نەبوو. کاتی خۆی، لە « لەندەن » بووم، لە « برایم و جەلال »م پرسی، شتی وام لێ نەبیستن. ئەو شتەی تۆ باسیدەکەی، من ئاگام لێی نییە.
- ئەدی چۆن، لە « ئێران »ەوە بۆ نێو شۆڕش گەڕانەوە؟
گەڕانەوە بۆ « بەغدا ».
- وا دیارە، بەڕێزتان ئاگاتان لەو ڕووداوانە نییە. لە سەرەتادا، بۆ « بەغدا » نەگەڕانەوە. بەڵکوو، بۆ نێو ڕیزەکانی شۆڕش هاتنەوە. پاشان، ڕایانکرد بۆ « بەغدا ».
نەخێر. نەگەڕانەوە بۆ نێو شۆڕش، بەڵکوو، گەڕانەوە بۆ ناوچەیەکی دیاریکراو و لەوێ دانیشتن. نە پێوەندییان، بە « مەلا مستەفا »وە کرد و نە لەگەڵ شۆڕشیشدا، نێوانیان هەبوو، هەرگیز شتی وا نەبووە. گەڕانەوە بۆ شوێنێ، لەژێر چاودێریی دابوون. ئەو شوێنەش، پێشمەرگەی « پارتیی »، بە سەرۆکایەتی « مەلا مستەفا »ی لێ نەبوو.
- بەڵام، « برایم ئەحمەد » دەڵێ: « ساڵح یوسفیی » و چەن کەسێکی دیکە، لە لایەن « بارزانیی »یەوە هاتن بۆ « ئێران »، گوتیان: جگە لە « برایم ئەحمەد »، ئەوانی دیکە هەموویان، بۆیان هەیە بگەڕێنەوە.
من ئاگام لەوە نییە. چونکە، کاتی خۆی « برایم »، لەو بارەیەوە، هیچی بۆ باس نەکردم.
- باشە. گرنگ نییە. ئەدی چۆن، پەنایان بۆ دەوڵەتی « عێراق » برد؟
نامەیەکیان بۆ ناردن و گوتیان: ئێمە دەمانەوێ، بگەڕێینەوە و دەس بە کاری خۆمان بکەینەوە. لەو کاتەدا، حوکوومەتی « عێراق » دەیویست، ڕیزەکانی جووڵانەوەی نیشتمانیی کورد لەتلەتکا. لەبەرئەوە، حوکوومەت پێی وابوو، دوو بەشی دەژ بە یەک، لە نێو جووڵانەوەکەدا دروسبووە و دەتوانن، کەڵکیان لێ وەرگرن و بەگژ یەکدیاندا بکەن.

**پ16** : چۆن کەسایەتیی « بارزانیی »، لەم ڕووانەوە هەڵدەسەنگێنن؟
ـ « بارزانیی »، وەک سەرۆک هۆز:
**و16** : « مەلا مستەفا »، هەرگیز سەرۆکی هۆزی « بارزان » نەبووە. بەڵکوو، یەکێ بوو لە « بارزانیی »یەکان. سەرۆک هۆز، بە « خودانی بارزان » دەناسرێ. ئەویش، « شێخ ئەحمەد » بوو. دوای ئەوەی، « عەبدولسەلامی بارزانیی » برای، کۆچیدواییکرد، شێخایەتیی لەوەوە وەرگرت.
« مەلا مستەفا »، وەک یەکێ، لە پچووکترین جووتیارەکانی « بارزان » وابوو، وەک ئەوانیش، لە بەردەمی « شێخ ئەحمەد »دا ڕادەوەستا.
ـ ئەدی دوای ئەوەی، « شێخ ئەحمەد » مرد؟
شێخایەتیی کۆتاییپێهات. چونکە، دوای خۆی، کەسی بۆ ئەو شوێنە دیاری نەکرد.
ـ ئەوە وەک شێخی « بارزان » ڕاستە. بەڵام، ئەدی وەک سەرۆک هۆز؟
ئێستە، « بارزانیی »یەکان سەرۆک هۆزیان نییە. هەر چەندە، شتێکی وا دەڵێن، گوایە: « شێخ محەمەد خالید »ە. بەڵام ئێستە، ئەو هۆزە « بارزانیی»یە توندوتۆڵە یەکگرتووەی جاران نەماوە و لە نێو خۆیاندا شلبوونەتەوە. بە سەر چەن بەشێکدا دابەشبوون. بەشێ لە « بارزانیی »یەکان، لەگەڵ « مەسعوود » دان. بەشێکی دیکەیان، لەگەڵ « شێخ محەمەد خالید » دان. بەشەکەی دیکەشیان، لە شوێنی خۆیان دانیشتوون.
ـ « بارزانیی »، وەک سەرۆکی « پارتیی » :
« مەلا مستەفا » مرۆڤێ بوو، لە ڕێی هێزەوە، یا بە دەسی ئانقەس، بەو شوێنە نەگەیشبوو. بەڵکوو، بە شێوەیەکی سروشتیی، بووبوو بە سەرۆک. کاتێ دەمانەوێ، کارەکانی هەر سەرۆکێ، لە سەرۆکەکانی جیهان هەڵسەنگێنین، پێویستە، بە یەک چاو، سەیری چاکە و خراپەکانیان نەکەین. هەڵەکانی لە لایەک و سەرکەوتنەکانیشی لە لایەکی دیکەوە دانێین. کاتێ، باسی ڕۆڵی سەرۆکێ دەکەین و ڕۆڵی گەورەیی، هەر سەرۆکێ هەڵدەسەنگێنین، ئەو هەڵسەنگاندنە، پێوەندیی بە پلەی سەرکەوتنی ئەو سەرۆکەوە هەیە. زۆر لە سەرکردەکانی جیهان، ئەوانەی مێژوو ناوی تۆمارکردوون، دوای چەن سەرکەوتنێکی دیاریکراو ژێرکەوتوون. واتە: لە سەرەتادا، سەرکەوتووبوون، بەڵام، لە کۆتاییدا ژێرکەتووبوون. وەک « ناپلیۆن و جەمال عەبدولناسر »، لە کۆتاییدا، تووشی تەنگانە و نووشوستیی بوون. بەڵام، ناویان لە لاپەڕەکانی

مێژوودا، هەر ماوەتەوە، هەر چەندە سەرکەوتووش نەبوون. ئێمەش، هەرگیز ناتوانین، بەگوێرەی ئەو سەرکەوتنانەی « مەلا مستەفا »، لە شۆڕشدا بەدەسیهێناون، ڕۆڵی مێژوویی ئەو هەڵسەنگێنین. بەڵام دەتوانین، ئەو ڕۆڵەی « مەلا مستەفا »، بە شێوەیەکی دیکە هەڵسەنگێنین. ئەویش ئەوەیە: تا چەن، کاری لە پەرەسەندن و گەشەسەندنی هوشیاریی نەتەوەیی کورد کردووە و ئاسەوارێکی بەجێهێشتووە؟!!

– « بارزانیی »، وەک سەرکردەی شۆڕش:

« مەلا مستەفا »، ستراتیژیی بوو، لە سەرکردە زۆر چاکەکان بوو. هەروەها، تاکتیکییش بوو. دەیزانی، چۆن کەڵک لە هەل وەردەگرێ. ڕۆژێ لە ڕۆژان، سەرکردایەتی جەنگێ لە جەنگەکانی، لە سەر زەویی نەکردووە، بێ ئەوەی سەرنەکەوێ.

– « بارزانیی »، وەک سەرکردەیەکی گشتیی گەلی کورد:

دووبارە، گومانم لەمەش هەیە. بێ گومان، دوای ئەوەی مرد، ناتوانین، وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە. پێش چەن ڕۆژێ، کاتێ برادەرانی « پارتیی » هاتن بۆ لام و داوایان لێ کردم، گوتارێ بە بۆنەی یادی کۆچیدواییەوە بنووسم، گوتم: برایینە! ئێوە بەم شێوە سەیرە، پێ دادەگرن، هەموو ساڵێ ئاهەنگ دەگێڕن و یادی کۆچیدوایی « مەلا مستەفا »، دەکەنەوە، شتی وا لە هەموو سەرانسەری جیهاندا نەبووە و نییە. ها؟

– لە سەداسەد، ڕاست دەفەرمووی.

بە بۆنەی کۆچیدوایی هەموو سەرکردەیەکەوە، ساڵی یەکەم یاددەکرێتەوە. گەر تۆزێکی دیکەش بڕۆن، یادی دووەمیشی بۆ دەکەن. گەر زیاتریش بڕۆن، ئەوا یادی سێیەمیشی بۆ دەکەن. پاشان، دوای بیستوپێنج ساڵ، یادێکی دیکەی دەکەنەوە.

– یاخود یۆبێلی پەنجا ساڵەی بۆ دەکەن.

بەڵێ. شتێ لەو بابەتانە، بەڵام، ئێوە هەموو ساڵێ، خەڵکی کۆدەکەنەوە، دوایی هیچ نامێنێ، لە سەر « مەلا مستەفا » باسیکەن، تەنیا، هێندێ قسەی « بێ تام و بێ لەزەت و بێ ناوەڕۆک » نەبێ.

– مەبەستان دووبارەکردنەوەمیە؟

بەڵێ. هەموو ساڵێ دووبارەدەبێتەوە. بۆیە تکادەکەم، واز لەو بەزمە بێنن. بەڵام، وا دەردەکەوێ، دەیانەوێ، ئەفسانەیەکی بەردەوام دروسکەن. بەڵێ،

« مەلا مستەفا » وەک ئەفسانەیەکی دیاریکراوی لێهاتووە. بەڵام بەو شێوەیەش نا. دەتوانین، بە شێوەیەکی دیکە بڵێین: « مەلا مستەفا »، بوو بە ڕۆشناییەک، ڕووناکییەک، تیشکێ، ڕێی خەبات پیشانی پێشڕەوێکی دیکە دەدا.
ـ ئایا « بارزانیی »، هوشیاریی نەتەوەیی بەرزبوو؟ تا چ ئەندازەیەک پەرەی سەندبوو؟
بەڵێ. هوشیاریی نەتەوەیی، زۆر گەشەیسەندبوو. لە ڕاستییدا، من لەگەڵ ئەو کەسانەدا، یەک ناگرمەوە، کە دەڵێن: بیروباوەڕی « مەلا مستەفا »، لە نێو چوارچێوەی بیری هۆزی « بارزان » و هاوپەیمانەکانی « بارزان »دا قەتیس مابوو. ڕاستە، ئەو بە شێوەیەکی تایبەتیی، بایەخی بە هۆزی « بارزان » دەدا، بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا، کاتێ ئەو بایەخدانە، لەگەڵ کێشەی نەتەوەیی کورددا ناکۆکبووایە، ڕەتیدەکردەوە. دوای ئەوەی لە ساڵی « 1958 »دا لە « یەکێتی سۆڤێت » گەڕایەوە، بە چاوی خۆی بینی، دەستەی ڕووناکبیری کورد، لە چواردەوری کۆبوونەتەوە. نووسەر و ژۆرنالیستەکان، هێندێ شتی دیاریکراویان لە سەر دەنووسی، ناویاندەهێنا و چاوپێکەوتنیان لەگەڵ دەکرد، بە حسێب، وەک سونبولێکی تێکۆشانی نەتەوەی کورد وایە، بەرپرسیاریی نەتەوەیی گەورەتربوو. بە هۆی ئەو بەرپرسیارییەشەوە، هوشیاریی نەتەوەیی فراوانتر و مەزنتربوو، ئیدی هوشیاریی نەتەوەیشی قووڵتربۆوە.
ـ ئایا، هوشیاریی نەتەوەیی « بارزانیی »، شانبەشانی هوشیاریی ڕامیاریی دەڕۆی؟
نازانم، مەبەس لە هوشیاریی ڕامیاریی چییە؟ مەبەستەکەتم بۆ ڕوونکەرەوە،
ـ مەبەسم لە هوشیاریی ڕامیاریی ئەوەیە: ئایا، « بارزانیی » هەستی بە پێویستییەکانی باری ژیانی ڕامیاریی کوردستان دەکرد؟ ئاگای لە کێشە گرنگەکانی « عێراق » و گرفتی ناوچەکە و جیهان بوو؟
من دەمەوێ، ئەوە بڵێم: « مەلا مستەفا »، پیاوێ بوو، هەمـــــــوو پۆلێتیکی « خۆرهەڵاتی نێوەند »ی تاقیکردبۆوە، لەو بارەیەشەوە، کەڵکی لە هەنگاو و ئەزموونەکانی خۆی وەرگرتبوو. لەبەرئەوە، هێندێ هەڵوێستی وەردەگرت، بۆ من و تۆ و هێندێ ڕووناکبیری دیکەش، وا دەردەکەوت، هەڵوێستێکی سەیر و نانەتەوەییە، بەڵام، لە ڕاستییدا، هەمووی لە باری ئاڵۆزی پڕ لە گرێوگۆڵی ڕیالیزمانەی، پۆلێتیکی « خۆرهەڵاتی نێوەڕاست »ەوە هەڵیدەهێنجا.
ـ واتە: ئاگاداری پۆلێتیکی نێو دەوڵەتانیش بووە؟

بە وردیی. هێندێ جار، خۆی داوای لە من دەکرد، هەموو کاتێ، گوێ لە ڕادیۆ ڕاگرم. زۆر بە ناسکیی، پێی دەگوتم: خۆ تۆ، هەر دانیشتووی و ئیش دەکەی، گەر دەنگوباسێکی دیاریکراوی گرنگ هەبوو، بە کەڵکی من بێ، تکایە بۆم تۆمارکە. هەموو ڕۆژێ « عومەر دۆڵەمەڕیی » یا « عەبدولهەیمەن »، یەکێکیان دەهاتن و ئەو شتانەی بۆم دەنووسی، بۆیان دەبرد.
- ئایا « بارزانیی »، جیاوازیی لە نێوان ئایین و پۆلێتیکدا دەکرد؟
نەخێر. ئەوە باسێکی ناسکە. بەڵام، هەر باسیدەکەم. ئەو پیاوێ بوو، خۆی بە خواناس دادەنا. بەڵام، وا بیریدەکردەوە، خۆپیشاندان وەک پیاوێکی ئایینیی، لە بەردەمی کۆمەڵگەیەکی خاوەن بڕوا و خواناسدا، وەک جلوبەرگێکی پێویست وایە و دەبێ، سەرکردەیەکی موسوڵمان لەبەریکا. بەڵام، لە نێوەوەی خۆیدا، جیاوازیی لە کێشەی ئاییندا نەدەکرد. من هەمیشە، بە گاڵتەوە پێم دەگوت: دوا هۆزێ لە هۆزە کوردەکان موسوڵمان بووبن، هۆزی « بارزان » بوو. جا، هەر واشە، جگە لە شێخەکانیان، خووڕەوشت و ترادیسیۆنی هۆزی « بارزان »، بە تەواویی، لە خووڕەوشت و ترادیسیۆنی « دیان »ەکان دەچێ. گەر زۆر پێویست نەبێ، لە ژنێ زیاتر ناهێنن. ژنیش، خاوەنی قسەی خۆیەتی، هەرچی بۆێ، دەیڵێ و ڕای خۆی دەردەبڕێ. بە ڕاشکاویی دەڵێ: من ئەوەم دەوێ و ئەوەم ناوێ. بۆ نموونە: کچێکی « مەلا مستەفا » دەیویست، شوو بە کوڕەکەی « شێخ سولەیمانی کوڕی شێخ عەبدولسەلام » بکا. لەبەر ئەوەی، ئەو کوڕە لە « یەکێتی سۆڤێت »، دژایەتی « بارزانیی » کردبوو، یەکێ بوو لەو چوار پێنج کەسەی، لە ڕیزی « پارتی کۆمۆنیستی سۆڤێت »دا کاریانکردبوو، « بارزانیی » ڕازیی نەبوو. کچەکەش، لە سەر ئەو شووکردنەی خۆی سووربوو، دەیگوت: کوڕەکەی « شێخ سولەیمان »م دەوێ. « مەلا مستەفا »، هەرگیز نەیتوانی، تەگەرەی تێخا. بەڵام، لە کچەکەی خۆی زویر بوو. تا کۆتاییش، قسەی لەگەڵدا نەکرد، لەبەرئەوەی، قسەکەی شکاندبوو.
- « بارزانیی »، چۆن لە فەلسەفەی « مارسیزم - لێنینیزم »ی دەڕوانی؟
« مەلا مستەفا » دانەدەنیشت، باسی ئەو جۆرە شتانە بکا، وەک ئێمە، لە نێو خۆماندا باسیدەکەین. دەیگوت: ناچاریانکردبووم، تیۆری « مارکسیزم » بخوێنم. بەڵام، هەمیشە باسی ئەوەی بۆ دەکردین، پێی لە سەر ئەوە دادەگرت و دەیگوت: ئەو شتانەی لە پەرتووکەکاندا نووسرابوون و دەمانخوێند، لەگەڵ ڕیالیزمی ژیانی ڕۆژانەی ئەوێدا یەک نەبوون، نەدەگونجان و بە پێچەوانەوە

بوون. « مەلا مستەفا »، بیری زۆر تیژبوو. لەو بارەیەوە، گەلێ شتی خۆشی، بۆ دەگێڕاینەوە. ڕۆژێکیان دانیشتبووین، بە تەنیا هەر من نەبووم، گەلێ کەسی دیکەشی لێ بوو، گوتی: لە ساڵی « 1954 » بە دواوە، ماوەی سێ ساڵ، « فاسۆلیا »ی قتویان بە سەردا دابەشدەکردین. لە سەر کاغەزەکەی نووسرابوو، لە « U.S.A. »وە هێنراوە. پرسیمان ئەمە چییە؟ بۆ لەوێوە دەیهێنن؟ گوتیان: ئەوە ئەو یارمەتییانەیە، کاتی خۆی « ئەمێریکا »، بۆی دەناردین. جا، تەماشاکە، چۆن بیریدەکردەوە!
شتێکی دیکەشی بۆ باسکردین. گوتی: ڕۆژێکیان، لە « کۆڵخۆز » بووین. هەر یەکەی، پارچە قوماشێکیان داینێ، شارێکی نزیک لە تەنیشتمانەوە بوو، گوتیان: بڕۆن بۆ ئەوێ، تا ئەندازەتان بگرن و بۆتان بدرون. گوتی: پارچە قوماشم خستە بنباڵم و ڕۆیشتم بۆ ئەوێ. لە دوورەوە دەبینم، خەڵکێکی زۆر ڕیزبوون و نۆرەیانگرتووە. منیش چووم، لە دوایی دواوە ڕاوەستام. پێش من، پتر لە بیست کەس ڕاوەستابوون. گوتی: ماوەی یەک دوو کاژێر ڕاوەستام، ڕیزەکە، هەر لە شوێنی خۆی بوو، هیچ پێشکەوتنێ نەبوو، کەس نەدەجولا. پاشان، یەکێ هات و گوتی: ئەورۆ کات تەواوبوو، بەیانی وەرنەوە. پیرێژنێ لەو لاوە پەیدابوو، تەماشای منی کرد و لێی پرسیم: تۆ لە « کۆڵخۆز »ەوە نەهاتووی؟ گوتم: بەڵێ، لەوێوە هاتووم. گوتی: باشە لە « کۆڵخۆز »، مریشکی لێ نییە؟ مریشکەکە هێلکە ناکا؟ گوتم: مریشکیشی لێیە و مریشکەکانیش هێلکە دەکەن. گوتی: کەواتە، بەیانیی وەرەوە، هێندێ هێلکە لەگەڵ خۆت بێنە، یەکسەر، ئەندازەت دەگرین. گوتی: بەیانیی، هێندێ هێلکەم پەیداکرد و دیسانەوە، چوومەوە بۆ ئەوێ. هەر لە دوورەوە، ژنەکە منی بینی، بانگی کردمە ژوورەوە، یەکسەر ئەندازەی گرتم، منیش هێلکەکانم دایە. پاشان پێی گوتم: هەفتەیەکی دیکە تەواودەبێ، بەڵام، ئەم جارە دەبێ، مریشکەکە خۆی بێنێ. دوای هەفتەکە، مریشکێکم لەگەڵ خۆم برد. ئیدی ئەم جارە، وەک ناسیاویان لێهاتبوو، بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازییان لێ کردم و پێشەکیی، جلەکانیان ئامادەکردبوو، زوو دایانمێ و ڕاییانکردم. ڕیزەکەشم، هەر بەو چەشنە، بە قەرەباڵغی دەبینی و زۆر بە زەحمەت نەبووایە، لە شوێنی خۆی نەدەجولا!
ـ پێوەندیی « بارزانیی »، لەگەڵ خەڵکیدا چۆن بوو؟
لە هەموو ژیانی خۆمدا، کەسی دیکەی وەک « مەلا مستەفا »م نەدیوە، بەو شێوەیە، پێشوازی لە خەڵک بکا و وەک یەک، ڕێزی گەورە و گچکە بگرێ. هەر

کەسێ بچووایەتە دانیشتنەکانییەوە، یەکسەر، وەک زەنبەلەک لەبەری هەڵدەسا.
- ئایا ڕووی خۆشبوو؟
لەو کاتانەدا، کە تووڕەیان نەدەکرد، یا تووڕە نەبوو، دەکرایەوە و زۆر ڕووخۆشبوو، پاکترین و باشترین کەسبوو.
- حەزی لە قسەی خۆشدەکرد؟
بەڵێ. زۆر حەزی لە نوکتە دەکرد. نوکتەشی دەزانی. توانایەکی سەیری هەبوو، هێندێ جار، کاتێ بیویستایە، یا بیزانیایە، دانیشتنەکە خۆن، چەن کەسانێکی پاک و ڕێکوپێکی لێیە و لەو کەسانە دڵنیادەبوو، خەسڵەتە سەروەریی و سەرۆکییەکەی، لە خۆی دادەماڵی و وەک مرۆڤێکی ساکاریی لێدەهات، لاسایی هێندێ خەڵکی دەکردەوە و دانیشتنەکەی گەرمدەکرد. هەر ئەوەش بوو، « بارزانیی »یە جەنگاوەرەکانی وا لێکردبوو، هۆگریبن و لە پێناوی « مەلا مستەفا »دا ئامادەبن، قوربانیی بە هەموو شتێ بدەن و لە ژێر فەرمانیدا بجەنگن. قسەی « مەلا مستەفا »، هەرگیز ڕەت نەدەکرایەوە.
- ئایا پیاوێکی تووڕەبوو؟
نەخێر. خەسڵەتی توڕەییم، هەرگیز پێوە نەدیوە.
- بەڵام. بەپێی ئەو قسانەی من بیستوومە، « بارزانیی »، پیاوێکی تووڕەبووە، زۆر ڕقی لە نازناوی مامۆستا بووە. بۆ نموونە، دەڵێن: جارێ، یەکێ پێی گوتووە مامۆستا. « بارزانیی »، زۆر تووڕەبووە و گوتوویەتی: من مامۆستا نیم، « عەلی مەردان » مامۆستایە. ئایا ئەوە ڕاستە؟
من باسی ئەوەم کردووە.
- دەزانم. بەڵام، بۆ پێی ناخۆشبووە؟
لەبەرئەوەی، ووشەی مامۆستا، ووشەیەکی بڵاوبوو، زۆر بەکاردێنرا. تەنانەت، بە خوێڕیترین مرۆڤیشیان دەگوت، مامۆستا. لەبەرئەوە، هەقیبوو. من کاتێ، یەکێ پێم دەڵێ، مامۆستا، کەمێ پێی قەڵسدەبم.
- ئایا « بارزانیی »، مرۆڤی « ڕاسگۆ، قسەلەڕوو و ئازا »ی خۆشدەویست؟
بەڵێ. زۆر حەزی لە ڕاسگۆیی و ئازایی دەکرد. ڕێزی ئەو کەسانەی دەگرت، کە بە ڕاشکاویی قسەیاندەکرد.
- ئایا « بارزانیی »، ڕەخنەی قەبووڵدەکرد؟
من خۆم، ئەوەم تاقیکردۆتەوە، گوێی لە خەڵکی دەگرت.

پ17 : ئەدی، دەربارەی « ئیدریس بارزانیی »، دەڵێن چی؟ لە ڕووی «کەسایەتیی، ئاستی ڕۆشنبیریی، هوشیاریی ڕامیاریی، شارەزایی سەربازیی و دیپلۆماسیی »یەوە، چۆن هەڵیدەسەنگێنن؟ پێوەندیی لەگەڵ باوکیدا، چۆن بوو؟ نێوانیان، لەگەڵ ئەندامانی پەلیتبیرۆدا چۆن بوو؟ ڕۆڵی لە دەزگەی « پاراستن »دا چی بوو؟ بەرپرسیاریی لە « پارتیی » و شۆڕشدا، هەر لە سەرەتاوە تا دوارۆژەکانی شۆڕش چۆن بووە؟ *

و17 : دەربارەی « ئیدریس و مەسعوود »، کاتێ، باوکیان بەجێیهێشتن و دەربەدەربوو، ئەوان هێشتا، منداڵێکی شیرەخۆرەبوون. کاتێ گەڕاشەوە، دوو خوێندکاری پۆلی چوار و پێنجی ئامادەیی بوون. « ئیدریس »، ساڵێک و چەن مانگێ، لە « مەسعوود » گەورەترە. زیرەکییەکەیان، ئاسایی نەبوو، هەر دووکیان، لە سەر پلەی یەکەمیی، لە پۆلەکانی خوێندنگەدا، لە نێوان خۆیاندا پێشبڕکێیاندەکرد. هەموو خوێندکارەکانی، ئەو ئامادەییەی لێیان دەخوێند، « عەرەب » بوون. هیچیان بڕوانامەی، ئامادەییان وەر نەگرت و وازیان لە خوێندن هێنا.

کاتێ « مەلا مستەفا »، لە کۆتایی ساڵی « 1959 »دا، بە یەکجاریی « بەغدا »ی بەجێهێشت، ئەوانیش لەگەڵ باوکیان و ئەندامانی دیکەی خێزانەکەیان، گەڕانەوە بۆ « بارزان ». هەر دووکیان، خەتیان خۆش بوو، لە ڕووی لێکدانەوە و نووسین و داڕشتنەوە، بە زمانی « عەرەبیی »، باشیان دەنووسی. لە کاتێکدا، زۆر لە « عەرەب »ەکان خۆیان، زمانی دایکیان باش نازانن، ئەوان، ئەو دوو شتەیان، باش دەزانی. من خەتی هە ردووکیانم بە دڵبوو، سەیر ئەوەبوو، لە « ئێران » دەسوخەتیان لە یەکدی دەچوو، بە مەرجێ، یەکێ بە وردیی سەرنجی لێ نەدانایە، زۆر بە گران بۆی جیا دەکرانەوە. چەن نموونەیەکی زۆرم، لە نامەکانیان لایە، گەواهیی ئەوەدەدەن. کاتێ، چوومە نێو ڕیزەکانی شۆڕشەوە، یەکەم جار، هەر دووکیانم لە ژوورێکدا بینی، لەو

* ئەم پرسیارانە، بە نامە ئاراستەی مامۆستا « جەرجیس » کراوە و هەر بە نامەش، وەلامەکەی وەرگیراوەتەوە. بۆیە، وەک پرسیارەکانی دیکەی پێشوو، مەودای دەمەتەقێمان لە سەریان نەبووە. تا لە هێندێ بواری دیکەدا، پرسیاری زیاتری لێ بکەین و هێندێ شتی دیکەش ڕوونکەینەوە. لە ڕاستییدا، هەمان پرسیارم، دەربارەی « مەسعوود بارزانیی »، بە جیا لێ کرد بوو، بەلام، مامۆستا وەلامەکانی، هەموو پێکەوە گرێدابوون. بۆیە، منیش وەک خۆی، چۆن وەلامیداونەتەوە، هەر بەو چەشنەش بلاویاندەکەمەوە.

« عەرەبیی »یە ڕاستەی، قسەیانپێدەکرد و مەبەستەکانیان، بە باشیی پێ دەردەبڕی، سەرسامبووبووم. بە شێوەیەکی بەردەوامیش، ئەو شتەم تێدا بەدیدەکردن. باوکیان، زۆر خۆشدەویست، بە جۆرێ، تێڕوانینیان بۆ پلەوپایەی باوکیان، لە ڕادەی پەرستن تێپەڕیکردبوو.
« مەلا مستەفا »، لە سالّی « 1965 »دا نەبێ، پێشتر بۆ یاریدەدانی خۆی، بانگی نەکردن. هەر دووکیان، بارەگای تایبەتیی خۆیان هەبوو، لەو کاتەدا، هیچیان « پارتیی » نەبوون. لە دانیشتنە خۆشە تایبەتییەکانیاندا، زۆر لە یادگارەکانی سەردەمی لاوێتی خۆیان، بۆ باسدەکردم. « ئیدریس »، یەکسەر ڕووی لە کاری سەربازیی و دیپلۆماسیی کرد. لە کاتێکدا « مەسعوود »، هەموو خەمی خۆی، لە چوارچێوەی دامەزراندنی بیرۆیەکی ئاسایش و دەزگەیەکی هەواڵگوزاریی بۆ شۆڕش و سەرپەرشتیکردنیدا کۆدەکردەوە. ئەو دەزگەیەی، دواتر لە نێو خەڵکیدا، بە « پاراستن » ناسرا. سنووری ئەو دەزگەیە، بە هۆی ئەو ئەندامانەی « پارتیی »یەوە فروانبوو، کە ئامادەبوون، قوربانییبدەن و ژیانی خۆیان، بخەنە مەترسییەوە. وای لێهات، لە هەموو کات و ساتێکدا، دوای جموجۆڵەکانی سوپا بکەوێ، هەروەک « مەسعوود » دەیگوت: ئاگای لە نیازە نهێنییەکانی دەسەلاّتدارانیش بێ. بەلاّم، ئەو جووتە برایە، پێکەوە کاریاندەکرد و پێشەکیی، هاوکارییاندەکرد و بە تەواوییش ئاگایان لە کاری یەکدی بوو. ڕۆژێ لە ڕۆژان، هەرگیز ناکۆکییەک، لە نێوانیاندا پەیدا نەبوو. بە بڕوای خۆم، وام بۆ دەردەکەوت، هەر کاتێ هەر دووکیان، بەشدارییان لە کۆبوونەوەیەکی « پارتیی »، یا لە بەڕێوەبردندا بکردایە، هێندێ کات، گەورەکەیان شتەکانی ئاراستەدەکرد و بەڕێوەیدەبرد.
لە ساڵەکانی دواییدا، کە لە کۆتایی ساڵی «1970»ەوە دەسیپێکرد، کاتێ « مەلا مستەفا »، بەرەبەرە، لە کاروبارە لاوەکیی و کەم نرخەکاندا، پاشەکشەیدەکرد و تەنیا، لە کارە گرنگەکاندا، هەڵیدەدایە و خۆی بڕیاریدەدا، بۆم دەرکەوت، هەر دووکیان دەسەلاّتی باوکیان بەکاردێنن و پیادەیدەکەن. ئەوانیش، هەموو ڕۆژێ لەگەڵیدا کۆدەبوونەوە، تا ئیشەکانی ڕۆژانەی، پێش چاوبخەن و ڕاوێژی پێ بکەن.
بەلاّم، بە داخ و پەژارەوە باسیدەکەم، ئەزموونیان نەبوو. چونکە جیاوازییان، لە نێوان کەسایەتییەکاندا بۆ نەدەکرا. ئەو کەم ئەزموونییە، لە ساڵەکانی « 1970 ــــ 1975 »دا، گیرۆدەی داوی کۆمەڵێکی دیاریکراوی، نێو کۆمیتەی

ناوەندیی کـردن، بە تایبـەتیی، دوای ئەوەی هەر دووکـیـان، تێـیدا بوون بە ئەندام. ئـەوەش وای کـــرد، جـــۆرە دیکتـــاتۆریـــیـــەتێ، لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی پارت و شۆڕشدا پەیدابێ. ژمارەیە لە ئەندامە دڵسۆزەکان دوور خـرانەوە. هێندێکی دیکەش، تووشی شەلەلی بیـرکردنەوە و کـارکردن بوون. دوای تێکشکاندنەکەی ساڵی « 1975 »، هەستیان بە هەڵەکانی خۆیان کرد، کـاتێ، لە دەربەدەریدا هەوڵیـاندا، دەس بە کۆکـردنەوەی پارچەپارچەی پارتە لێکهەڵوەشاوەکەیان بکەن. ئەوەبوو، لە کۆنگرەی نۆدا، بە هـــەوڵ و کۆششی « ئیـدریس » توانیـان، لە دەس پاشمـاوەی ئەو کۆمـەڵە ڕزگاریانبێ. ئەوەش، چیـرۆکـێکی ئاشکرای خـۆی هەیە. لێـرەدا دەبێ، مـن دان بەوەدا بنێم، گـەر هەوڵ و توانای تایبـەتیی و ئارەزووی گـەرمـوگـوڕی ئەوان نـەبووایە، بۆ ئەوەی، ئەو ئاگرەی « مەلا مستـەفا » دایگیرساندبوو، نەکوژێتـەوە، « پارتی دیمۆکراتی کوردستـان »، بوونی خۆی لە دەسدابوو.
« ئیـدریس »، لە تاقیکـردنەوە تاڵ و لە بێ هیوابوونـە زۆرەکانی خۆیەوە، فێری ئەوەبووبوو، بڕوا بەو کەسانە نەکا، کە جێی بڕوا نەبوون. بەڵام، بە بڕوای من، ئەو پەنـدانەی درەنگ چنگکەوت. هەر چەندە، ئەو دوو برایە، لە بـــوژاندنەوەی « پارتیی »دا سەرکـەوتن، بەرەو ئەو لایەنـە تازەیە ئاراستـەیانکرد، کە کۆدەتای ئیسلامی لە « ئێران » گرتبوویە بەر و کەڵکیان لەو ناکۆکییە خوێناویانەی، نێوان ڕژێمی نوێ و ڕژێمی « عێراق » وەرگرت.
« ئیـدریس و مـەسـعـود »م، لەوەدا بـە دڵبـوو، دەیانتـوانی، بەو دوو زمـانەی دەیانزانـی، بیروباوەڕەکـانی خـۆیان، بۆ ژۆرنالیست و دیپلۆمـاسییـەکان، بە شـێـوەیەکی زۆر باش و ڕوون باسکـەن. ئەوانیش، ڕەزامـەندیی خـۆیـان، لە شێوازی دەربڕینیان نەدەشاردەوە.
تا ئـەندازەیەکی زۆر دەتـوانین، ئەو دوو برایە، لە ڕیزی کـــەســـایەتیـــیـــە سـۆزدارەکـاندا پۆلێنکەیـن. ئەوان، خـاوەنی ئەو ئارامـیی و هێمنییـە گـرنگە نەبوون و نین، کە بۆ هەمـوو ڕامیـاریێ پێـویستـە. ئەوەش، وای لێ کردوون، بە پەلە بڕیاربدەن، بڕیاری تەواو و باش و ڕاست نەدەن. زۆر جار، ئەو بەربەستە سـۆزداره کتوپڕییانە، بە شێـوەیەکی خراپ، کـاری لە بڕیارەکانیان دەکرد و ئامـانجیـان نەدەپێکا. ئەو سـەرکـردایەتییـەی، بۆ « پارتیی »ش دروسبـوو، مینتالیتێتەکەیان، هەر وەک خۆی مایەوە و دژی بیروڕاکانیان ڕانەدەوەستان، یا، بیروڕایەکیان دەر نەدەبڕی، لەگەڵ بیروڕای ئەواندا ئاوەژووبێ. ئەمەش، بە

بڕوای خۆم و بەپێی ئەو تاقیکردنەوانەی، بە تایبەتیی لەگەڵ « ئیدریس »دا هەمن، کارێکی وای کرد، حەزیان نەدەکرد، گوێیان لە بیروڕایەکی جیاوازبێ، یا تەنانەت، بایەخ بە ئامۆژگارییەک یا پێشنیازێ بدەن. بۆ نموونە: « ئیدریس »، گومانی لە دڵسۆزیی و نیازپاکیی من نەبوو. هەر چەندە، من لە « پارتیی » و چالاکیی ڕامیارییشەوە دووربووم، کەچیی، زۆر جار، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ئەو کاروبارانەی، پێوەندیی بە خۆیانەوە هەبوو، بە منی دەسپارد. بەڵام، لەگەڵ ئەوەشدا و لە هەمان کاتدا، بەرانبەر ئەو بڕوایەش، زۆر بە ئاگادارییەوە کارمدەکرد و هێندێ جار، تا پلەی تەنگپێهەڵچنین دەڕۆیی، گەر نەڵێم، دەگەییە دوورکەوتنەوەش. تا دوا ساتیش، تەنیا بە سێ کاژێر، پێش ئەوەی کۆچیدواییش بکا، پێوەندییەکی باش و بڕوایەکی بەرانبەریی لە نێوانماندا هەر مابوو. کاتێ مردیش، داخم بۆ خوارد و ئازارم پێ گەیشت. ئەوڕۆش، گوێ بۆ هەواڵەکانی کوردستان ڕادەدێرم و دەبینم، چی ڕوودەدا، لە بەر خۆمەوە، پرسیار لە خۆم دەکەم و دەڵێم: کێ دەزانێ؟ گەر ئێستە، « ئیدریس » زیندووبووایە، بارودۆخەکە چۆن دەبوو؟ ئایا جیاوازدەبوو؟ یا خراپتردەبوو؟ ڕۆژێ نەمبینین، لە سەر بیروڕایەکی دیاریکراو و لە چوارچێوەی، پلانێکی درێژخایەنی، کاری نیشتمانیدا ئۆقرەبگرن. لەوانەیە، بەشی زۆری ئەوەش، هۆکەی بۆ بارودۆخی نائارامیی بگەڕێتەوە و بە گۆڕانکارییە خێراکانی، بواری ڕامیاریی « خۆرهەڵاتی نێوەند » لێکبدرێتەوە. هاوپەیمانیی، ڕاپەڕین، پێوەندیی، دوژمنایەتیی، هەموو ئەمانە، بە زوویی دەگۆڕێن. هەر چەندە، لە ململانێ ڕامیارییەکاندا، خێرایی ئەو گۆڕانکارییانەی، ئامانجێکی نەتەوەیی و ڕزگارییخوازانە لە ئامێز دەگرن، ناتوانێن، بە سەرچاوەیەکی بەهێزی ڕامیاریی تێکۆشەر، لە پێناوی کێشەیەکدا دایان بنێین. ئەوانیش، وەک سەرکردەکانی دیکەی کورد، هێندێ جار، لە بیریاندەچۆوە، کە بە قۆناغی تێکۆشاندا تێپەڕدەبن، ئەو قۆناغە، بە سەریاندا دەسەپێنێ، مانۆڕە ڕامیارییەکان، لە سنوورێکی دیاریکراودا ڕاگرن. ئەو سنوورەش، ئەوەیە: قوربانیی بە بیروباوەڕ و ئامانجە نەتەوەییەکان نەدەن، یا لە کاتی کارکردنیاندا، پشگوێی نەخەن.

« مەسعوود »، زۆری دەخوێندەوە. نازانم، گەر ئێستە، کاتی ئەوەی هەبێ، بخوێنێتەوە. بەڵام، « ئیدریس » ئەوەی گرنگ نەبووایە و سەرنجی بۆ خوێندنەوەی ڕا نەکێشایە، نەیدەخوێندەوە. ئەوەی بە لای منەوە سەیرە،

خەونەکەی « مەسعوود ». ئەو خەونەی، بە سنگێکی فراوانەوە، باوەشی بۆ هەموو ئەندامانی سەرکردایەتی کردۆتەوە، ئەوانەی بڕوایان دۆڕاند و لە ساڵی « 1975 »دا، وازیان لە « پارتیی » هێنا و ناپاکییان لێ کرد. کاتێ، لە ساڵی « 1991 »دا و دوای ئەو مێژووەش، گەڕانەوە بۆ کوردستان، لەوانەش « کە خۆی زۆر باشی دەزانێ »، ئەوەی بە ئاشکرا، لە گوتارەکانیدا، جنێوی بە باوکی دەدا و ڕۆژنامەکانی « بەغدا »، بڵاویاندەکردنەوە. هەر وەک گوتیشم: یاد و بیرەوەریی باوکی، لای « مەسعوود » پیرۆزە!
« ئیدریس »، زوو هەڵدەچوو. لەو هەڵچوونە خێراییەشیدا، دەسپێشکەریی دەکرد و خەڵکی دیکەی، بە پەلەپەلکەر و لەخۆباییبوو دادەنا. ڕۆژێ نەمبینی، پەشیمانبێتەوە، یا داوای لێبووردن بکا، یا دان بە کەموکورتییەکانی خۆیدا بنێ. ئەوەش، کەموکوڕییەکی ئەوبوو. بەڵام، زۆر جار، دوای ئەوەی، چاوەڕوانیدەکرد و بیری لێ دەکردەوە، لە شوێنی خۆیدا بڕیاریدەدا. لە ڕۆژەکانی دەربەدەرییدا، هێندێ جار، داوای شتێکی لە من دەکرد، لەگەڵ پلەوپایەی من و کارەکەی خۆیدا نەدەگونجا، لەبەرئەوە، وەڵامێکی توند و پڕ بە پێستی خۆی، لە منەوە دەبیست و بە داخ لە دڵیی وازیدێنا و داوای لێبووردنیشی نەدەکرد. لەبەرئەوەی، خەڵکانی دیکە، هەر لە گەورەترین ئەندامی پەلیتبیرۆوە تا بە پچووکترین نۆکەری ماڵەکەی خۆیان کۆتاییپێدێ، فێری ووشەی « بەڵێ »یان کردبوو، هەرگیز، دژی بیروڕاکانی ڕا نەدەوەستان، قسەیان لە قسەیدا نەدەکرد و ناکۆکییەکیان لەگەڵیدا نەبوو. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، بڕوایەکی تەواویی پێم هەبوو. چونکە، هەرگیز گۆڕانی لە مندا بەدی نەکردبوو. هێندێ جار، ناکۆکییمان لە نێواندا پەیدادەبوو، لەو کاتانەشدا، چ بە دەمیی و چ بە نووسین، لە کاروبارە وردەکاندا، ڕاوێژی پێ دەکردم، لەو کارانەی، پێوەندیی بە « پارتیی »، یا پۆلێتیکی گشتیی، یا کاروباری تایبەتیی کەسایەتیی خۆیانەوە هەیە، لەو بارانەوە، کۆمەڵی شتی زۆرم لایە و ڕاستیی ئەو قسانەم دەسەلمێنێن.
بەڵام، « مەسعوود » هەمیشە، پێوەندیی لەگەڵ مندا، لە سەر بنچینەی، ڕێز دامەزرابوو. پێوەندییەکی ساکاربوو، تەنانەت بۆ جارێکیش، نە بە قسە و نە بە نووسین نەیدواندووم، تا، بە ناوی مامۆستاوە بانگی نەکردبم. لەو هەموو کۆبوونەوە زۆرانەی، لەگەڵیدا کردوومن، لە ڕاسگۆیی و گوێڕایەڵیی زیاترم، لێ نەدیوە. زۆر بە داخەوەم بۆی، کە ئەوڕۆ، کاروباری بەو ڕادەیە گەیشتووە.

چونکە، ئەوانەی چواردەوریانداوە، نە بە ڕاستیی لەگەڵی دەدوێن و نە پیاوی ئەوەشن، ئامۆژگاریی باشەی بکەن. « مەسعوود »یش، وەک هەموو سەرکردەی پارتەکانی ئێستە، لە زۆنگاوی « کوردستانی گەورە »دا نقومبووە. هەر خواش بۆ خۆی دەزانێ، کۆتاییان بە چی دێ!

**پ18** : چۆن کەسایەتیی ئەم بەڕێزانە هەڵدەسەنگێنن؟
ـ « برایم ئەحمەد »
**و18** : لە ڕاستییدا، تۆ پرسیاری دۆستێکی ئازیزم لێ دەکەی. کاتێ، دەربارەی « برایم » دەدوێم، هەمیشە هەوڵدەدەم، پۆلێتیک لە بیر خۆم بەرمەوە. کاتێ، قسەی لە سەر دەکەم، پتر لە ڕووی « دۆستایەتیی، توانا و بەهرە »یەوە قسەدەکەم. بێ گومان، « برایم »، مرۆڤێکی زیرەکە، زیرەکییەکەی لە سەرو ئاساییەوەیە و لە ئەندازە بەدەرە. سۆزێکی بێ وێنەی هەیە، مرۆڤێکی سۆزدارە. هەر چەندە ئەو شتانە، من بە چاکەی کەسایەتییەکی دیاریکراوی دادەنێم، بەڵام،لە هەمان کاتدا، بە یەکێ لە خەسڵەتە نێگێتیڤەکانی، پیاوێکی ڕامیار دادەنرێ.
ـ ئەدی لە باری سایکۆلۆژییەوە؟
مرۆڤێکی ئاساییە. هیچ جۆرە خەوشێکی سایکۆلۆژیی تێدا نییە. بەڵام، هێندێ جار، لە بڕیاردانا پەلەدەکا.
ـ لە ڕووی تەماعی هێز و دەسەڵاتەوە چۆنی دەبینن؟
هەروەها ئەویش، لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی، لە ژیانی خۆمدا دیومن، جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبووە و نییە. ئەویش، چاوی لە دەسەڵات دەبڕی. واتە: چاوی لە سەرۆکایەتیی بڕیبوو.
ـ دەتوانین، ئەوە بە یەکێ، لە ناکۆکییەکانی نێوان « بارزانیی » و « برایم ئەحمەد » دانێین؟
ڕۆژێکیان لە « تاران » بووین. دەربارەی « مەلا مستەفا » گوتی: ئێمە کاتێ لە « بەغدا » بووین، لەو باوەڕەدابووین، « مەلا مستەفا » بە فرمانی هێزێکی بیانیی هەڵدەسوڕێ. واتە: هێزێکی ڕۆژاوایی دەیجوڵێنێ. من خۆم، کاتێ « مەلا مستەفا »، ڕێککەوتننامەی «11/مارس »ی قەبووڵکرد، هەر چەندە، « شا » زۆری لێ کرد، پەسەندی نەکا، یەکسەر لەوە دڵنیابووم، من هەڵەبووم و « مەلا مستەفا »ش مرۆڤێکی نیشتمانپەروەرە.

ـ ئەڵڵا !
ئەو قسەیەی پێی گوتم، تا ئێستەش لە بیرمە.
ـ ئایا، لە دژایەتیکردنی « بارزانیی » پەشیمان نەبوو؟
نەخێر. نازانم.
ـ « جەلال تاڵەبانی »
کاتێ، دەربارەی « جەلال » دەدوێم، من هەرگیز ناتوانم، خۆم لابدەم، لەو پێوەندییە باشەی، لەگەڵ « جەلال » دا پاراستوومە. لەبەرئەوە، داوات لێ دەکەم، لەو بارەیەوە بمبووری. لە ماوەی ئەم دە ساڵەی دواییدا، تا ئێستە، گەر جموجۆڵەکانی لە کوردستاندا هەڵسەنگێنم، لەو بڕوایەدام و پێویستە، بڵێم: گللەییەکی زۆرم لێی هەیە، لەو بارەی ئەوڕۆ کوردستانی پێ گەیشتووە. هەر چەندە، لە سنووری زانیاریی خۆمدا، « جەلال » بە پێچەوانەی « مەسعوود » و کەسانی دیکەوە، بە تەواویی، بە ئارەزووی تاکەکەسیی خۆی ناجوڵێتەوە. چونکە، بەگوێرەی ئەوەی من دەیزانم، ئەو بە بیروڕای خەڵکی دیکەوە بەسراوەتەوە. واتە: لە نێو ئەلقەی تەسکی ڕێکخراوەکەی خۆیدا، بڕیار دەدا. مل بۆ ئەو بیروڕا و بڕیارانە دادەنەوێنێ، کە لە لایەن ڕێکخراوەکەیەوە دەردەچێ، بە شێوەی کۆمەڵ کاردەکا و هەڵدەسوڕێ. من لەو بڕوایەدام، بەو شێوەیەبێ.
ـ ئەدی « مەسعوود بارزانیی » ؟
ئەدی پێم نەگوتی، بە پێچەوانەی « جەلال »ەوەیە. من لە لایەن خۆمەوە، سەرەڕای هەموو ئەو شتانەش، پێوەندیی دۆستایەتییمان لە نێواندا هەیە و هەرگیز ناتوانم، لە بیریکەم، ئەوەش بڕیاری منە لە سەری.
ـ ئایا « جەلال تاڵەبانیی »، کادێرێکی زیرەک و نووسەرێکی باشە؟
دەنووسێ. بەڵام، بە گران دەنووسێ، خۆشی دان بەوەدا دەنێ. بەڵام، لە وتووێژەکانیدا قسەزانە. دەزانێ، چۆن دانیشتن و دیالۆگ، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بەڕێوەبەرێ. زیرەکیشە.
ـ ئەدی لە ڕووی چالاکییەوە چۆنە؟
بۆ ئەوەی، سەرنجی خەڵک بە لای خۆیدا ڕاکێشێ، شێوازێکی تایبەتیی خۆی هەیە. پێشمەرگە خۆشیان دەوێ. ڕووداوێکی دیاریکراوم لە بیرە. دەڵێن: جارێکیان، لەگەڵ کۆمەڵێ پێشمەرگەدا، پێکەوە بە کوردستاندا دەگەڕێن و گەشتدەکەن. پێشمەرگەیە دەبینێ، پێڵاوەکانی کونکونبووە و دڕاوە، سەری

پەنجەكانی بە دەرەوەدەبێ و نزیكەی بەپێی پەتی دەڕوا. یەكسەر پێلاوەكانی خۆی دادەكەنێ و دەڵێ: دەبێ، ئەم پێلاوانەی من لە پێكەی.
لە كاتی چاوپێكەوتنەكانیدا، لەگەڵ هێندێ ژۆرنالیستدا، دوو جار، من ئامادە بووم. دەربارەی ناكۆكییەكانی لەگەڵ « مەلا مستەفا »دا، پرسیاریان لێ دەكرد. بەڵام، « جەلال » خۆی بە دووردەگرت و ناوی « مەلا مستەفا »ی، بە خراپ نەدەهێنا. جا نازانم، لە بەر خاتری من بوو، یا هەر ئەوە بیر و بۆچوونی بوو. لەو بڕوایەدام، بە زۆریی بڕوای خۆی بێ. لە ساڵەكانی هەشتادا، واتە: لە « 1985 ــ 1987 »، لەو دەوروبەرەدابوو، هێندەی بیرمە، پێی گوتم: دەربارەی « مەلا مستەفا »، پرسیارم لێ ناكەی! وا بزانم، دەیویست، ناكۆكیی نێوانمان لەو ڕووەوە بهەژێنێ، منیش پێم گوت: بەپێچەوانەوە، « مەلا مستەفا » مرۆڤێكی نیشتمانپەروەربوو، سەركردایەتی شۆڕشێكی كرد و ڕۆڵێكی مێژوویی دیاریكراوی خۆی هەیە.
ـ باشە، « برایم ئەحمەد » و « جەلال تاڵەبانیی »، لەو ماوەیەی نێوان ساڵەكانی « 1966 ـ 1970 » پەشیمان نین؟ باسی ئەو شتانەتان نەكردووە؟
بە خوا نازانم، پەشیمان بن یا نا، باس نەكراوە.
ـ « عومەر مستەفا ـ عومەر دەبابە »
« عومەر »، مرۆڤێكی باشبوو. زیرەكییەكەی، لە زیرەكیی مرۆڤێكی ئاسایی تێپەڕی نەدەكرد. توانایەكی گەورەی نەبوو. بەڵام، بێ گومان مرۆڤێكی خۆش و تێكۆشەربوو. كاتێ لە ساڵی « 1960 » دا، لەگەڵ « تەحسین »ی میری « یەزیدیی »یەكاندا گیرا، وا پێویستبوو، من بچم و لە گرتووخانەی فلان، چاوم پێی بكەوێ. چووم بۆ ئەوێ و بینیم. داوای لێ كردم، ئۆتۆمۆبیلەكەی بەرم و لە ماڵی « مەلا مستەفا » داینێم. تا ئێستەش لە یادمە، ئۆتۆمۆبیلێكی فۆلكسواگۆن بوو. من و « جەلال » پێكەوە ڕۆیشتین، تا ئەو كارە جێبەجێ كەین. « جەلال » نەیدەزانی، ئۆتۆمۆبیل لێخوڕێ، من لێمخوڕی. بەڵام نەمدەزانی، چۆن بۆ دواوە بگەڕێمەوە. « جەلال »یش پێم پێدەكەنی. پاشان، هەر چی چۆنێ بوو، ئۆتۆمۆبیلەكەمان گەیاند. كاتێ ساڵی « 1968 »یش، لە گرتووخانە ڕزگارمبوو، « عومەر » هات بۆ لام و سەریدام. مرۆڤێكی بە ئەمەكبوو. تەنانەت، دەمانچەیەكی لە ماڵەوە بۆ بەجێهێشتم، گوتی: دەترسم، یەكێ بێتە سەرت.

پ19 : کەی پێوەندی،ی لە نێوان « ئێران » و شۆڕشی کوردستاندا دروسبوو؟
و19 : ئەوە، لە پەرتووکی « ئەلحەرب ئەلکوردیە و ئینشقاق 1964 »دا هەیە و بە درێژیی باسکراوە. تکایە لەوێ بیخوێنەرەوە.

ـ لە نێوان شۆڕش و دەوڵەتی « تورکیا »دا؟

پێوەندیی نەبوو. بەڵام، لێکتێگەیشتن و بێدەنگیی هەبوو. بێ گومان، هێزەکانی پێشمەرگە، بە سەرکردایەتی « مەلا مستەفا »، دەسیان بە سەر هەموو ناوچەکانی سنووردا گرتبوو. بە درێژایی « 450 » کیلۆمەتر، ئەو سنوورانە، لە ژێر کۆنترۆڵی پێشمەرگەدا بوو. هەر لە سەرەتای شۆڕشەوە، هەموو دەزگە پۆلیسییەکانی دەوڵەتی « عێراق » پاککرابوونەوە. بەڵام، وەک دەڵێن: پێوەندییەکی سەرزارەکیی هەبوو. وا دەردەکەوێ، نێردراوێ چووبوو، یا هاتبوو، چاوی بە « مەلا مستەفا » کەوتبوو. « مەلا مستەفا »ش بە تەواویی، دڵنیایکردبوون، هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ کوردەکانی « تورکیا »دا نییە و لەو ڕووەوە، تێمان گەیاندبوون، کە سنوورمان داخستووە. لەو کاتەشدا، شتێکی گران نەبوو، ئەو بڕیارە جێبەجێکەین، چونکە، بزووتنەوەی کوردایەتی، لە نێو « تورکیا »دا، زۆر لاوازبوو. لەبەرئەوە، لەو بارەیەوە گرفتمان نەبوو.

ـ پێوەندیی شۆڕش لەگەڵ « سووریا »دا، کەی دسیپێکرد؟

بە بڕوای من، « جەلال » لە ساڵی « 1971 »دا دروسیکرد.

پ20 : کێ لە پێشدا، پێوەندیی لەگەڵ « ئێران »دا دامەزراند، « بارزانیی » یا کۆمەڵەکەی « برایم ئەحمەد » ؟
و20 : بە خوا، وەڵامی ئەو پرسیارە، لە پەرتووکی « ئەلحەرب ئەلکوردیە »دا هەیە و بە درێژیی نووسراوە.

ـ سروشتی پێوەندییەکەی نێوان « ئێران » و سەرکردایەتی شۆڕش، چۆن بوو؟

پێوەندییەکە گۆڕا و پێشکەوت. لە سەرەتادا، کاتێ پێوەندیی دروسبوو، تەنیا خۆی، لە هێندێ شتی دیاریکراودا دەبینی، وەک ئەوەی، بریندارەکانیان بۆ تیماردەکردین، نەخۆشەکانیان بۆ چارەسەردەکردین، ئاڵوگۆڕی بازرگانییمان لە نێواندا هەبوو، هێندێ یارمەتیی پزیشکییشمان پێ دەگەیشت. بەڵام، یارمەتیی سەربازییان نەدەداین. پاشان، پێوەندییەکە پێشکەوت، پارەمان لەوێوە بۆ دەهات. بە سەدان هەزار، بە ملیۆن تومەنمان پێ دەگەیشت،

تەنانـەت، لە کـوردسـتـاندا تومـەنـی « ئێـرانیـی »مـان، لە کـاروبـاری کـڕین و فرۆشتندا بەکاردێنا. چونکە لە یادمە، ئەو دە هەزار دینارەی « مەلا مستەفا » لە سـاڵی « 1969 »دا دایمێ، بۆ ئـــــــەوەی چاپخانەی پێ بکڕم، بە پارەی « ئێـرانیـی » بوو. ئەو پێـوەندییـیـە بە ڕادەیە گـەیشت، تا لە دواڕۆژەکـانی شـۆڕشـدا و پێش ڕێککەوتنەکەی « جەزایر »، پێشـمەرگە شـەڕیان نەدەکرد، ورەیان ڕوخـابوو، بارودۆخـەکـە زۆر ئـاڵۆزبووبوو، بـە تایبـەتیی، لە « زۆزک و هەندرێن »، کارمان خراپبوو. من ئاگادارم، بە شەو لۆریی و تۆپە قورسەکانی سوپای « ئێرانیی » دەهاتن و سوپای « عێراق »یان بەر تۆپ دەدا. تەنانەت، ئەفسـەرە « ئێرانیی »یەکان، جلی کوردییان لەبەردەکرد و نەشـیان دەزانی، چۆن ڕانکوچۆغەکەیان لەبـەرکەن و پشتێنەکەیان ببەستن. جارێ، سەرهەنگێ بۆ ئەو مەبەسە هات بۆ لای من.

– ئایا پێوەندییەکە لەگەڵ « ئێران »دا، وەک پێوەندیی کۆیلە و خاوەن کۆیلە وابوو؟

نەخێر. هەرگیز پێوەندیی لەو بابەتانە، لە نێوان « ئێران » و شۆڕشدا نەبووە. بەڵگەشم بۆ ئەوە، هەر دوو ڕێککەوتننامەکـەی « 29/یون » و « 11/مـارس »ە، هەر دووکیان، دژی ویست و ئارەزووی « شا » بوون.

– ئـەدی دوای ئـەوەی، لـە « 11/مـــارسی/1974 »دا، جـەنـگ لـە کـوردسـتـاندا دەسپێکردەوە، پێوەندییەکە چۆن بوو؟

کاتـێ جەنگ دەسـپێکردەوە، لە سـەرەتادا، وەک هـەمـان پێوەندیی کۆن وابوو. وا دەردەکەوت، دسـەڵاتدارانی دەوڵەتی « ئێران »، لەو باوەڕەدابـوون، گوایە: « مەلا مـستەفا »، تەمێخواردووبووە و دوو جـار پەندی لە گفتوگۆ وەرگرتووە، جـارێ لە گفـتـوگۆکـەی « یون » و جارەکـەی دیکەش، لەوەی « مـارس ». لەبەر ئەوە، پێوەندییەکە لەوە پێش چۆن بوو، وەک خۆی لێهاتەوە.

« ئێرانیی »یەکان، جگە لە شۆڕشی کورد، هیچ ڕێیەکی دیکەیان لە بەردەمدا نەبوو. چۆنکە، لە بەرژەوەندیی ڕامیـاریی « ئێران » و ناوچەی « خـۆرهەڵاتی نێوەند »دا بوو، « عێراق »، هەروا بە سـەرقاڵیی بمێنێتـەوە. ئەو دەوڵەتانەش، داواکاریی خۆیان هەبوو، ئەو داواکارییانەش، بە ڕێککەوتننامەی « جەزایر » کۆتاییهات.

– ئایا، « شـا »ی « ئێران »، بە ڕێککەوتنـامەی « جـەزایر » ویستـی، تۆڵە لە « بارزانیی » بکاتەوە؟

نەخێر، نەخێر. تۆ هەر بە شێوەیەکی ساکار، بیر لەو باسە بکەرەوە. من پارەم هەیە و کاری پارەگۆڕینەوە دەکەم. تۆش پیاوێکی کاردەکەی. من سەرمایەت دەدەمێ، تا کاری پێوە بکەی. بەرژەوەندیی هەر دوو لاشمان ئەوەیە، من قازانجبکەم و تۆش قازانجبکەی. جاری یەکەم، پارەمان دایتێ، بەڵام، تۆ زیانت لێکرد. جاری دووەمیش، پارەمان دایتێ، بەڵام، هەمدیسان تووشی زیان بوویتەوە. جارێکی دیکەش، یارمەتیماندای، بەو هیوایەی، بەڵکوو ئەم جارە، بێیتەوە مایە و پارەکەمان بۆ بگێڕیتەوە. دوایی بینیمان، هیچ کەڵکی نییە، گوتمان: کاکە! ئیدی لەم بارەیەوە، هیچ توانامان نەما و با هەر کەس، بەڕێی خۆیەوە بڕوا و خەریکی کاری خۆی بێ.

ـ واتە: پێوەندییەکە، وەک پێوەندیی دان و ستاندن وابووە؟

بەڵێ. بە تەواویی وا بووە. هەر لە بنەڕەتدا، شۆڕشی کوردستان، بە لای « ئێران »وە، وەک مقاشێ وابووە، پشکۆی گەرمی ئاگری پێ گرتووە، وەک هۆیە بەکاریهێناوە و گوشاری بۆ سەر « عێراق » پێ بردووە، تا، ناکۆکییەکانی نێوانیان یەکلاییکەنەوە و سنووری نێوان « عێراق و ئێران »، بە لایەکدا بخەن و کێشەی شەتاوی « عەرەبیی » پێ چارەسەرکەن.

ـ بەپێی ئەو پڕوپاگەندانەی هەن، گوایە: پێوەندیی نێوان « بارزانیی » و دەزگەی « C.I.A. ـ ئەمێریکا » ، لە دوای ساڵی « 1972 »وە دەسپێکردووە، « ئەمێریکایی »یەکان، زۆریان لە « ئێران » دەکرد، تا یارمەتیی شۆڕش بدەن، ئایا، ئەوە تا چەد ڕاستە؟

بەپێچەوانەوە. « ئێران » زۆری لە « C.I.A. ـ ئەمێریکایی » دەکرد.

ـ واتە: ئەو پێوەندییەی، لە نێوانیاندا دروسبوو، لە ڕێی « ئێران »وە بوو؟

« ئێران »، ڕۆڵێکی گەورەی، لەو بوارەدا وازیکرد. لەبەرئەوەی، ئەو کاتە، دوای ئەوەی « کەمیل شەمعون »، لە « لوبنان » تێداچوو، کە لای « وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا » جێی بڕوابوو، ئیدی لەبری ئەو، « شا » ئەو ڕۆڵەی بینی و بوو بە جێی بڕوایان، تا بە تەواویی، لەو ئابڵوقەدانە دەرچوون.

**پ21** : چۆن ڕێککەوتننامەی « 11/مارس » هەڵدەسەنگێنن؟

**و21** : ئۆف، ئۆف. ڕێککەوتننامەی «11/مارس » !!

دوای ئەوەی « بەعسیی »یەکان، نکوولییان لە مافە نەتەوەییەکانی کورد دەکرد، دوای ئەوەی، دانیان بە « ئۆتۆنۆمیی »دا نەدەنا، وەرچەرخانێکی

کتوپڕیی، له بەرنامەی « بەعس »دا ڕوویدا، به گۆشەیەکی «360 » پلەیی، له بڕیارەکانی پێشووی خۆیان پەشیمانبوونەوە. ئەو کەسانەی « بەعس »یان دەناسی، له مانۆڕەکانی « بەعس » شارەزابوون و دەیانزانی، « بەعس » له « سووریا » چی کردووە، زوو هەستیان بەوە دەکرد، ئەمە تەنیا کات کڕینە، بۆ ئەوەی، خۆیان به هێزکەن. چونکە، هەڵوێستیان زۆر لاوازبوو. ئەگینا، هەرگیز باوەڕیان بەوە نەبوو، دان به مافه نەتەوەییەکانی گەلی کورددا بنێن و ئەو « ئۆتۆنۆمیی »یەی ئێمه دەمانویست، بیدەن.
ـ ئایا، « بارزانیی » گومانی لەوە هەبوو؟
بەڵێ. بەلام « مەلا مستەفا »، له کاتی ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکەدا، گومانی نەبوو. بەڵکوو گومانەکەی، دوای چەن مانگێکی کەم دەسیپێکرد. من خۆم، له « مەلا مستەفا »م بیستووە، نازانم، ئەوە چۆن بوو؟ نازانم، چۆن ئەوەی ڕوون کردەوە؟ کاتێ « سەددام »هات، من لەوێ بووم و لەگەڵی دانیشتم. « سەددام» پێی گوت: ئەو نوێنەرانەی هاتبوون،* گرنگ نین، تۆ چیت دەوێ، بینووسە، من ئیمزایدەکەم. کاتێ ئەو قسەیەیکرد، یەکسەر زانیم، نایانەوێ، هیچ بکەن. بەلام، ئێمە پێویستبوو، کێشەکه به کوڵودڵەوە وەرگرین، بۆ ئەوەی، دەکومێنتێکی مێژوویمان، له دەوڵەتی « عێراق »ەوە چنگکەوێ. بەلام، له شێوەی داڕشتنی ڕێککەوتننامەکەدا، هەڵەمانکرد. به شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا، خاڵەکانیمان دانەڕشت. پاشان، هەلەکەشمان له دەسچوو. من خۆم دەزانم و کەسانی دیکەش دەزانن، له ڕێککەوتننامەی «11/مارس»دا، ئێمه به تەواویی، خاڵمان له سەر پیتەکان دانەنا. خاڵێکی زۆر گرنگی دیکەش هەیە، ئەویش ئەوەیە: هەڵەیەکی زۆر گەورەی لۆجیکییمان کرد، له ڕێککەوتننامەکەدا، داوای جیابوونەوەمان نەکردبوو، دەربارەی « عێراق »ێکی یەکگرتوو قسەماندەکرد. ئێمه خۆمان، به دیمۆکراسیی دادەنێین، « پارتێکی دیمۆکراسیی کوردستانی عێراقیی »ن، کەچیی، کاتێ لەگەڵ نوێنەرەکانی « بەعس »دا، بۆ گفتوگۆکردن دانیشتین، بیرمان لەوە نەکردەوە، گفتوگۆکه دەبێ، له سەر ئاستی هەموو « عێراق »بێ. واته: له سەر بنچینەی یاسابێ. گوێم له « سامیی » بوو، دەیگوت: ئێمه، بۆچی وا بکەین؟ پێوەندییمان به « عەرەب »ەوە چییە؟ ئێمه، تەنیا مافی خۆمان وەردەگرین. ئاخر، کاکه! کام

* « سەددام »، مەبەسی له نوێنەرەکانی خۆیان بووە، که « بارزانیی » دەریکردبوون.

ماف؟! ئێمە، مادام داوای جیابوونەوە ناکەین، بە « عەرەب »ەوە گرێدراوین. گەر مافەکانی « عەرەب » مسۆگەربێ، مافەکانی ئێمەش مسۆگەردەبێ.
ـ باشە، گەر « سامیی »، پێوەندیی بە « عەرەب »ەوە نەبووە و نییە، بۆچی لە ڕێکخراوێکدا کاردەکا، داوای دیمۆکراسیی بۆ « عێراق » دەکا؟!!
ئاخر، ئەوە ئەو خاڵەیە، کە من باسمکردووە. ئەوە باسێکی دووروودرێژە. ڕیکۆردەرەکە بکوژێنەرەوە، تا بۆت باسکەم.
ـ بۆ بیکوژێنمەوە؟ پێویستە، وەڵامی پرسیارەکەم بدەیتەوە، مەبەسم ئەوەیە: « پارتیی »، دیمۆکراسییان بە داواکارییەکانی کوردەوە بەستۆتەوە.
کاتێ نوێنەرەکان هاتن، چەن کەسێکی وەک « حەماد شەهاب و عەبدوڵڵا سەلوم سامەڕایی »یان لەگەڵدا بوو. سەرۆکی کۆمیتەکە، « حەردان عەبدولغەفار تکریتی » بوو. ڕاوێژاکارێکی یاساییان، لەگەڵ خۆیان هێنابوو، ناوی « عەبدولفەتاح ئەلزلم » بوو. « مەسعوود »یش، دەسی بۆ من ڕاکێشا و گوتی: ئێمەش پارێزەرمان هەیە. ئیدی، وازمان لەو کێشەیە هێنا و وەک برا، پێکەوە دانیشتین. یەکێ لە ئامـــــــــەدەبووان، نامەوێ، ناویبەرم، تا نەڵێن: « جەرجیس » وا و وا، ڕووی لە « حەردان » کرد و گوتی: ئێمەش لە پرۆگرامی « پارتیی »دا، خاڵێکمان هەیە، دەڵێ: دەبێ، سیستێمێکی دیمۆکراسیی، بۆ « عێراق » دابینکرێ، لەبەرئەوە دەبێ، هەڵبژاردنی گشتیی، لە « عێراق »دا بکرێ. « حەردان » زۆر زیرەکبوو، گوتی: کاکە! تۆ مەبەست، لە هەڵبژاردن و سیستێمی دیمۆکراسیی چییە؟ ئێمە، بە خوێنی خۆمان هاتووین، خوێنی خۆمان، لە سەر بەری دەسمان ڕۆکردبوو. کاتێ کۆدەتامانکرد، ملمان لە چەقۆ دەسوو، تۆ دەتەوێ، ئێمە کۆدەتاکەی خۆمان بفرۆشین و هەڵبژاردنبکەین؟ دەتەوێ، دەرەبەگ و سەرمایەدارەکان بێن، دەنگەکان بە پارەبکڕن و جێگەکانمان بگرن؟ کەس باسی ئەم شتە نەکا. ئەمە قسەی « حەردان » بوو. هێشتا، لەوە زیاترت دەوێ؟
ـ نەخێر. سوپاس. من مەبەسم لە قسەکەی « سامیی » بوو.
بڵێین چی!

پ22 : باری سەرنج و تێبینییەکانتان، سەبارەت بە نووشوستی شۆڕشی کوردستان و دوا ڕۆژەکانی شۆڕش چین؟
و22 : لەو بارەیەوە، هیچ شتێکم نییە. منیش وەک خەڵکی دیکە، گوێم لە

بڵاوکراوەکە بوو. بەڵام، وەک هێندێ لە پیاوەکانی، دەزگەی « پاراستن »ی شۆڕش باسیاندەکرد، بۆ نموونە: « شەکیب » دەیگوت: پێش ئەو ڕێککەوتنە، هاتوچۆ لە نێوانیاندا هەبووە. شۆڕشیش ئاگاداری ئەو جموجۆڵەیان بووە.
ـ لە نێوان کێ و کێدا؟
واتە: پێش دوو سێ مانگ، پێوەندیی لە نێوان+ « بۆمیدیەن، سادات، شا و عێراق »دا هەبووە. بەڵام، وا دەردەکەوێ، ئێمە، وەک لە بەر خۆرەتاوێکی گەرمی بەهاردا نووستبووبین، وابووە، گوێمان نەداوەتێ. ڕاپۆرت بۆ پەلیتبیرۆ دەهات و هیچیشیان نەدەکرد. لەو کاتانەدا، « مەلا مستەفا » بە تەواویی، دوورەپەرێز وەستابوو، هیچ جۆرە ڕۆڵێکی نەبوو.
ـ کێ کاروباری شۆڕشەکەی ڕادەپەڕاند؟
کۆمەڵەکەی « دارا تۆفیق » و « محەمەد مەحموود عەبدولڕەحمان ».
ـ ئەدی دوکتۆر « مەحموو » ؟
ئەویش مابوو، ڕۆڵێکی کەمی هەبوو. بەڵام، تەنیا دەنگێ هەبووبێ، دەنگی « سامیی و دارا » بوو. ئەوان، هەموو کاروباری پەلیتبیرۆ و « پارتیی »یان بەڕێوەدەبرد.
ـ چۆن دواساڵەکانی شۆڕش، لە ڕووەکانی « ڕامیاریی، سەربازیی، ئابووریی و کەلتوریی »یەوە هەڵدەسەنگێنن؟
لە ڕووی کەلتورییەوە، هەر وەک پێم گوتی: پەلیتبیرۆ هەستیپێکردبوو، هیچ جۆرە خۆراکێکی ڕووناکبیریی، لە نێو « پارتیی »دا نەمابوو. « پارتیی »، لە بواری ڕێکخستن و کەلتووریدا هەڵوەشابۆوە. لەبەرئەوە بڕیارێکیاندەرکرد، من لێپرسراوی بەشی ڕاگەیاندن بم و« نووریی شاوەیس »یش، سەرپەرشتیی ڕێکخستن بکا. واتە: خۆشیان دەیانزانی، « پارتیی» بوونی خۆی لە دەسداوە.
ـ لە ڕووی ڕامیارییەوە؟
بەڵام، لە ڕووی ڕامیارییەوە، گەلێ باڵی ڕامیاریی جیاواز هەبوون. دەستەیەک لەگەڵ « دارا» بوون، بڕوایان بە گفتوگۆ هەبوو لەگەڵ « بەعس »دا. دەستەیەکی دیکە لەگەڵ فلان بوون، دەیانویست، لە ڕێی « سووریا »وە کارێ بکەن. دەستەیەکی دیکەش دەیانگوت: ئێمە واین و وا دەکەین، هەر قسەکردن بوو. شۆڕشیش، وەک جاران هەر بەردەوامبوو، وەک ئەوەی، تۆ لە یەکێ لە گۆڕەپانەکاندا، تۆپێ لە بەردەمتدابێ، شەقێ لە تۆپەکە هەڵبدەی و بڕوا، تۆش بە دوایدا ڕاکەی، بێ ئەوەی هیچ گرفتێ هەبێ، زەوییەکی تەخت و کراوەبێ.

– مەبەستان ئەوەیە، گەلەکۆمەکی لە نێو پەلیتبیرۆدا هەبوو؟
نەخێر. بە شێوەی گەلەکۆمەکی لە یەکدیکردن نەبوو، شتی وا نەبوو. بەڵکوو، کۆنترۆڵکردن و دەسبەسەراگرتن هەبوو. کۆنترۆڵێکی ئایدۆلۆژیی هەبوو. زۆربەی زۆری ئەندامانی پەلیتبیرۆ، تووشی شەلەل بووبوون. وەک پێم گوتی: من ئامادەی کۆبوونەوەکان نەدەبووم. من ناوم بۆ کۆمیتەی ناوەندیی دەرچوو بوو، بەڵام، ئەو پیاوانە بۆ کۆبوونەوەکان، منیان بانگ نەدەکرد، منیش بە لایاندا نەدەڕۆیشتم. سوپاسیاندەکەم، چونکە، ئەو ئەرکەیان لە کۆڵ کردبوومەوە!
– ئەدی لە ڕووی سەربازییەوە؟
جگە لە بەرەی « دهۆک »، تا دواڕۆژەکانی شۆڕش، خۆیان ڕاگرت و بەرگریان کرد، هەموو بەرەکانی دیکە شێوابوون، وەک نیوە ڕوخاو وابوون.
– بەڵام لەو سەردەمەدا، خۆم لە هێزی « خەبات » پێشمەرگە بووم و بەتالیۆنەکەمان، لە ناوچەی سەرکردایەتیی بوو. پێشمەرگەکان لە بەرەکانی شەڕی « گۆڕەس، زۆزک، گەرووی بێشێ، سەرتیز، سەری حەسەن بەگ ... تا » زۆر بە چاکیی، داکۆکییان لە خۆیان و لە ناوچە ئازادکراوەکان دەکرد، دژی سوپای « عێراق » دەجەنگان.
بەڵێ. دوای ڕێککەوتنەکە، ئاژاوە پەیدابوو. بەڵام، پێش ڕێککەوتنەکە، مەترسییەکی زۆر هەبوو. چاکم لە بیرە، من و « عەلی عەسکەریی »، لە « قەسرێ »وە دابەزین، « عەلی » هاواریدەکرد و دەیگوت: ئەی هاوار خەڵکینە، ئەم تانکانە، چۆن لە چیاکانی « زۆزک و ڕەواندز »ەوە دێنە خوارێ؟ بە هەر دوو دەس، بە سەری خۆیدا دەکێشا!

پ23 : ئایا، دوای ڕێککەوتنامەی « 6/مارسی/1975 » و لە کاتی کارەساتەکەدا، وەک دۆستێکی نزیک لە « بارزانیی »یەوە چیتان کرد؟
و23 : من لە هیچ شتێکدا، ئامادە نەبووم. « مەلا مستەفا »شم نەبینی. بەڵکوو تەنیا، لە دانشتنێکی پچووکی هیستێریدا بەشداربووم. « مەسعوود » لە داخدا، دەمانچەکەی ڕاکێشا، ویستی خۆی بکوژێ.
– خۆی بکوژێ؟!!
بەڵێ. ئاژاوەیەکی تەواوبوو. « عەلی عەسکەریی »، خۆی هات بۆ لام. دواییش بە شەو، « برایم ئەحمەد » هات. دەیویست، چاوی بە « مەلا مستەفا » بکەوێ.

بیری ئەوە دەکردەوە، لە سەر بەڕەنگاربوونەوە و شەڕکردن بەردەوامبێ.
هەموو بیر و بۆچوونەکانی خۆی، بۆ باسکردم. منیش، باوەڕم بە قسەکانی هەبوو. لە ڕاستییدا، هێندێ ئەفسەری پچووک هەبوون، ئەفسەری پێوەندیی، نێوان شۆڕش و « ئێرانیی »یەکان بوون. دەیانزانی، گەنجینەی چەک و تەقەمەنییەکان لە کوێن. چەکێکێ زۆر هەبوو. یەکێ لەو ئەفسەرانە، کوڕی « جەوهەر دزەیی » بوو. « ئێرانیی »یەکان، دەسیان بە کۆکردنەوەی جبەخانەکانیان کرد. دوو سێ ئەفسەرم، لەوانە دەناسی، هەمیشە، سەریان لێ دەدام. گەنج بوون، لە نزیک منەوە دەژیان. نیوە ڕێککەوتنێ، لە نێوانماندا دروسبوو. لەو کاتانەدا، ڕۆژانە بە شێوەیەکی بەردەوام، « برایم و عەلی عەسکەریی » دەهاتن. « عەلی » سووربوو، لە سەر ئەوەی، چەک دانەنێین. بێ گومان، ئەمانە هەمووی، بیروڕای تایبەتیی و تاکەکەسیی بوون. پەلیتبیرۆ و « پارتیی » دەمێبوو، لێبووبوونەوە. هەر یەکەیان دەیویست، هەرسەکە جێگیر بێ و ڕزگاریانبێ. دەیانویست، خۆیان کۆکەنەوە، ئۆتۆمۆبیلەکانیان پڕکەن لە شت و بۆی دەرچن. ئەو بەشەی، لە نێو خۆیاندا ڕێککەوتبوون، خۆیان بە دەس دوژمنەوە بدەن و بەرەو « بەغدا » ملبنێن، وەک « سالّح یوسفیی » و هێندێ کەسی دیکە.
ـ ئەدی « دارا » ؟
« دارا » نا. « دارا » چوو بۆ « ورمێ »، خۆی و « یاسین و زەکێ »، ئۆتۆمۆبیلەکەیان دانا. تەنانەت، « زەکێی سمایل حەقی »م لە « ورمێ » بینی، لە نێوان مانەوە و گەڕانەوەدا دوودڵبوو.
بە کورتییەکەی: من پێشنیازەکەی « عەلی »م بە دڵبوو. من بەو ئەفسەرە لاوانەم گوت: ئێوە جارێ، چەکەکان بە دەسەوە مەدەن، بەڕێکوپێکی، لە شوێنێکی باشی دیاریکراودا بیشارنەوە. یەکێ لەوانە پێی گوتم: من یەک میلیۆن فیشەکم هەیە. یەکێکی دیکە دەیگوت: منیش هێندە تفەنگم هەیە. هەمووشی هەر قسەبوو. دوایی، یەک کەس نەمایەوە. ئاژاوەیەکی تەواوبوو. هەر کەسەی دەیویست، خۆی ڕزگارکا، لەبەرئەوەی « ئێرانیی »یەکان، ڕێی سوپای « عێراق »یان دا، پێشکەون و بەرەو قولایی کوردستان بێنەپێشەوە. لە خوارووی «کوردستانی عێراق »ەوە هاتن، بەرەو « کانی ماسیی وئامێدیی» سەرکەوتن. بۆ ئەوەی هەر چواردەورمان لێ بگرن. جگە لە ڕێی « شنۆ و حاجی هۆمەران »، هیچ ڕێیەکی دیکە نەمابوو. ئەوەش بەپێی ئەو ڕێککەوتنەی نێوان، « شا و سەددام » بوو، ئەو ڕێیەیان، بە کراوەیی هێشتبۆوە و هێشتا،

هێـزەکـانـی سـوپای « عـێـراق »ی بۆ نەهـاتبـوو، « ئێـرانیی »یەکـانیش هێشتبوویانەوە، تا ڕێ بۆ ئێمە دابینکەن و لە « ئێران » ببین بە پەنابەر. هەر چەندە، ئەو ئەفسـەرانە، چەک و تەقەمەنییەکانیان شاردبۆوە! بەڵام، دوایی نازانم، کـەڵکیـان لێ وەرگـرت، یا هـەر لە بنەڕەتدا، هیـچیـان نەکـردبوو! لەو بارەیەشـەوە، هەواڵێ هەبوو، گـوایە: هەر لە سـەرەتاوە، کـۆمـەڵەکـەی « برایم ئەحمـەد »، بیرێکی وایان هەبوو، دەس بەسەر بزووتنەوەکەدا بگرن، بەڵام، من گومانم لەو کارە هەبوو!
لە وەڵامی ئـەو پرسـیـارەدا، مـن لەوە زیاتر، هیـچ جۆرە زانیـارییـەکـی دیکەم نییـە. چونکە، زانیـاریی تـەواو، تەنیـا لای ئەو کـەسـانـەیە، لەگـەڵ « ئیدرس و مەسعوود »دا کۆدەبوونەوە، پێش ئەوەی، پاشەکشەی لێ بکەن و بڕیاری چەک دانان بدەن. « مـەلا مستـەفـا »، ئەو کاتە لەوێ نەبوو. بەڵکوو، لە « ئێران » بوو. هەوڵیدەدا، « شـا » ڕازیبکـا. پاشان دوا کـەوت. تەنانەت، پڕوپاگـەندەیە هەبوو، دەیانگوت: لەوانەیە « شـا » گـرتبـێـتـی. دوا جـار ڕێککەوتـن و گـەڕایەوە. ئەو وەڵامە باشە؟ بەردەوام بم؟
ـ بەڵێ.
ئەم شـتـانە هەمـووی، لەو کـاتـانەدا ڕوویدا، « مـەلا مـسـتـەفـا » لە کـوردسـتـان نەبوو. « سـاڵح یوسفیی »، زۆر بە شێوەیەکی کتوپڕیی هات بۆ لام، ئێستەش دیمەنەکەیم لە پێش چاوە، ڕووی تاریکبووبوو، گـوتـی: کـاکە! ئێـمـە بڕیارمـان داوە، من و « دارا » بچین بۆ « سووریا » و داوای یارمەتییان لێ بکەین. ئەوە یەکەم بڕیاربوو. ئاگات لەو بڕیارە هەیە؟
ـ نەخێر.
نازانی! گوتی: بڕیـارمـانداوە و هـەمـوو شـتێکمـان جێبەجێکردووە، تەنانەت، پەسـتـریشـمـان ئامـادەکـردووە و بە سـواری دەچین. ئەم قسـانەی، بە شـێـوە ساویلکەیی و ڕاشکاوییـەکەی خۆی دەکـرد. پاشـان دوایی دەبینم، هەمـوو شتەکان هەڵگەڕانەوە. ڕۆژی دووەم، « مـەلا مسـتـەفـا » هاتەوە. گـوتی: ئیدی ناخـۆشـیی و چەرمـەسـەریی بەسـە و با ئەم گـەلە لەوە زیاتر، تووشی دەردی سـەریی نەبێ. ناتوانـین، هیـچ شـتـێ لەم بوارەدا بکـەین. هەمـوو دەوڵـەتـەکـان، لێمـان هەڵگەڕاونـەتەوە و دژمـانن. هیـچ ڕێگەیەکمـان، لە بـەردەمدا نییە، جگە لەوەی بڕۆین و لە سـەر هـیـوای پاشـەڕۆژ بژین. بەڵکوو، هیـوایەک پەیدابێ. پێویستـە، پارێزگـاریی خـۆمـان بکـەین و بگـەڕێینەوە بۆ کـوردسـتـان، کـەڵک بە

کوردستان بگەیەنین. لەبەرئەوە، هەموو ئەو شتانەی بڕیاریاندابوو، هەڵیان وەشاندەوە.
- ئایا، لەو بڕوایەدان، هیچ کەسێ، کۆمەڵێ دەیانتوانی، کاریبکەن، بۆ ئەوەی، شۆڕش لە تێکشکان و هەرەس ڕزگارکەن؟
شتێکی زۆر زۆر گرانە، وەلامی ئەو پرسیارە بدەمەوە. من مێژوونووسم، پتر بایەخ بە ڕابردوو و ئێستە دەدەم. ناتوانم، لەو بارەیەوە قسەبکەم، چونکە، پێشبینیم نییە. ووشەی « ئەگەر » لە مێژوودا کەڵکی نییە.

**پ24** : ڕۆڵی چینی دەرەبەگ و خاوەن زەویی و سەرۆک تیرە و هۆزەکان، لە پرۆسێسی دووبەرەکییەکدا چی بوو؟
**و24** : بە خوا، ئەو پرسیارە، پرسیارێکی دیالێکتیکییە. ناتوانم، لە سەر شێوەی دیالێکتیکیی وەلامیبدەمەوە. بەلام، دەتوانم بڵێم: لەم پەڕی ڕاستەوە بۆ ئەو پەڕی چەپ، لە چوارچێوەی سنووری شۆڕشەکەدا کۆبووبوونەوە. کێشەی چینایەتیی و مینایەتی و شتێ لەو بابەتانە نەبوو. واتە: شۆڕش، شۆڕشی هەموو چینەکانی گەل بوو. لەبەرئەوە، ئەو چینانە ڕۆڵیان نەبوو. ئەو شتەی من دەیزانم، ئەو کەسانەی بە دەرەبەگ نێوزەددەکرێن، بڕوایان بە سەرکردایەتی « مەلا مستەفا » هەبوو. هیچ کەسێ نەیدەتوانی، سەرپێچی لە فرمانەکانی شۆڕش بکا.

**پ25** : ئایا ئاستی « ڕامیاریی، ڕووناکبیریی و زانستانە »ی، نێوان « بارزانیی » و ئەندامانی پەلیتبیرۆی کۆن، ڕۆڵێکی سەرەکیی، لە دووبەرەکییەکەی ساڵی « 1964 »دا بینیوە؟
**و25** : نەخێر. لە بنەڕەتدا کێشەیەکی تایبەتیی بوو.

**پ26** : ئایا ئەو پێکهاتن و یەککگرتنەوەیەی، لە نێوان هەر دوو ڕێکخستنەکەی « پارتیی » بە سەرکردایەتی « بارزانیی » و باڵەکەی پەلیتبیرۆ « پارتی شۆڕشگێڕانی کوردستان »، لە ساڵی « 1970 »دا ڕوویدا، پرۆسێسێ بوو، لە لایەن هەر دوو لایانەوە، لە بڕوا و ویژدان و لە قوڵایی پێویستییەکانی کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە هەڵقوڵابوو، یا تەنیا، تاکتیکێکی ڕامیاریی بوو؟ ئێوە لەو بارەیەوە چی دەفەرموون؟

و26 : نەخێر. وانەبوو. بەڵکوو، سەپێندرا و یەکێ لە مەرجەکانی « مەلا مستەفا » بوو.
ـ چۆن؟
« مەلا مستەفا »، داوای لێ کردن، بچن بۆ لای خۆی و دانیشن. ئەوانیش، ناوی هەموو ئەندامان و کادێرەکانیان نووسی و دایاننێ.
ـ ئایا لەو بڕوایەدان، ئەوە تەنیا تاکتیکێکی ڕامیاریی بووبێ، « بارزانیی »، بۆ لەنێوبردنی « پارتی شۆڕشگێڕی کوردستان » پیادەیکردبێ؟
نەخێر. « مەلا مستەفا »، بەو شێوەیە بیری نەدەکردەوە. هەرگیز، بیری وای نەبوو.

پ27 : بیروڕاتان بەرانبەر ئەو جەنگە نێوخۆییە « کوردیی ـ کوردیی »یەی، لە «1994/5/1»ەوە، لە نێوان « پارتیی و یەکێتیی »دا هەڵگیرساوە، چییە؟
و27 : تکات لێ دەکەم، بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە، تەماشای پەرتووکی « ئاراء مەحزوورە » بکە. لەوێدا، بە تەواویی ڕوونمکردۆتەوە.
ـ ئایا دەتوانین، بڵێین: ئەم جەنگە هەر بەردەوامیی، ئەو جەنگەی نێوان « بارزانیی » و پەلیتبیرۆی ساڵی « 1964 »ە؟
نەخێر. چونکە، بارودۆخەکەی ئێستە، لەگەڵ ئەو سەردەمەدا جیاوازە و بە شێوەیەکی زۆر گۆڕاوە. هەموو گریمانەکان و بارودۆخە ناوچەییەکانی ئێستەش، لەگەڵ ئەو سەردەمانەی پێشوودا جیاوازە، بەڵام ئاسەوارێکی هەر هەیە.

پ28 : پاشەڕۆژی بزووتنەی کورد چۆن دەبینن؟
و28 : من، بۆ هەمان شت دەگەڕێمەوە، کە لە سیمینارەکەدا باسمکرد. دەڵێم: ئەو هێزە شەڕکەرانەی، ئێستە لە کوردستاندا هەن، ئەوەیان سەلماند، نە لە بەشی خوارووی کوردستان و نە لە پارچەکانی دیکەی کوردستانیشدا ناتوانن، گرفتەکانی کورد چارەسەرکەن. لەبەرئەوەی، سەرکردەکانیان نموونەی خراپەن.
لەبەرئەوە، من گوتوومە و هەمیشەش پێشنیاز دەکەم: دەبێ، هێزی سێیەم دروسبێ، ئەو هێزەش، لەو هێزانە بێ، کە هەموو بڕوایەکی خۆی، لە سەر بیروباوەڕ هەڵچنێ. وەک لە ساڵی « 1908 »دا ڕوویدا، کاتێ جوڵانەوەی کورد،

له « نورڈیا » سەریەهەلدا و ڕووناکبیران، له « ئەستانە »وه دەسیانپێکرد. بزووتنەوەی کوردایەتیی ڕەسەن، له « شار »ەوه چـــوزەرەی دەرکردووه، له « قوستەنتێنییه »وه پەیدابووه، له نێو کەسانێکی ڕووناکبیردا، نەشونمای کردووه. هێندێ لەوانه، خاوەنی بڕوانامەی بەرزبوون، هێندێکی دیکەشیان، له پیاوه دەرەبەگه نیشتمانپەروەرەکان بوون. هەروەها، چەندین ئەفسەری سوپاشیان، تێدا هەلکەوتووه. بزووتنەوەی کوردایەتیی، له « هەکاریی »یەوه دروس نەبووه، بەلگەشم بۆ ئەوه، هەموو ئەو ڕاپەڕین و شۆڕشانەی، دوای ئەوه بەرپابوون، هەر له ساڵی « 1920 ـ 1925 »ەوه، تا ساڵی « 1936 »ی « دەرسیم »، هەموویان له ماوەی، چەد ڕۆژێکدا هەرەسیاندێنا.

پ29 : ئەدی، دەربارەی خەسلەتەکانی نەتەوەی کورد چی دەلێن؟
و29 : نەتەوەی کورد، نەتەوەیەکه، هەموو مەرجەکانی خۆی تێدایه. له ڕۆژی دروسبوونییەوه، له سەر خاکی خۆی دەژی. بەلام، چانسی ڕەشی کورد خۆی لەوەدا دەبینێ، خاوەنی قەوارەیەکی ڕامیاریی خۆی نییه و لەو ڕووەوه دواکەوتووه. لەبەرئەوەی کورد، له نێوان چەن ئیمپراتۆریایەکدا دابەش کرابوو، ئەو ئیمپراتۆریایانەش، بە سەر چەن دەولەتێکدا دابەشبوون، هەر یەکەیان، سنوورێکی دیاریکراوی خۆیان هەیه، هەر یەکەشیان، بە تەنگ سنوورەکەی خۆیانەوه دێن و پارێزگاریی لێ دەکەن. واته: بارودۆخی نەتەوەی کورد، لەگەل بارودۆخی وولاتەکانی « ئەفریقا »دا جیاوازه. هەموو وولاتەکانی « ئەفریقا »، له لایەن چەن دەولەتێکی جیاوازەوه داگیرکرابوون، پاشان. سەربەخۆییان دانێ و جیابوونەوه. ئەوان، چەن نەتەوەیەکی لەتوپەتکراو نەبوون، له نێوان چەن دەولەتێکدا دابەشکرابن. بەلکوو، هەر یەکێکیان، له سەدان ساڵ پتره، سنووری تایبەتیی خۆیان هەبووه و هەیه و بوون به دەولەت. ئەو خاڵه، گەورەترین گرفتی نەتەوەی کورد پێکدێنێ.

پ30 : بەپێی دید و بۆچوونی بەڕێزتان، مافی چارەنووس چی دەگەیەنێ؟
و30 : من لێرەدا، ناتوانم، هیچ شتێ بۆ مافی چارەنووس زیادکەم. لەبەر ئەوەی، پێناسەکان له پەرتووکەکاندا هەن. بەلام، مافی چارەنووس ئەوەیه: نەتەوەکان له دەس چەوساندنەوه ڕزگاریانبێ و سەربەخۆیی ڕامیاریی و ئابووریی خۆیان بەدەسبێنن.

ـ ئايا بڕواتان، بە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد هەیە؟
بێ گومان.

پ31 : بە ڕای بەڕێزتان، ئایا گرفتی « نەتەوەیی، ڕامیاریی و کەلتووریی »، لە نێوان کورد و « ئاسووریی »یەکاندا هەیە؟
و31 : من لەو بڕوایەدام، هەموو ئەو گرفتانە دروسکراون. بە هیچ شێوەیە، شتی وا نییە.

پ32 : چۆن لە پاشەڕۆژی گەلانی ناوچەی « خۆرهەلاتی نێوەند » دەڕوانن؟
و32 : پێم گوتی: من نووسەر و مێژوونووسم. ئیشەکانم لە ڕابوردوو و ئێستە دایە. بۆ پاشەڕۆژ دەبێ، پێشبینییبکەم، بۆیە دەبێ، پەیامبەربم، تا، شتێ لەو بارەیەوە بزانم. من لە وەڵامدانەوەی ئەوە پرسیارە، داوای لێبووردندەکەم.

پ33 : دەربارەی تاقیکردنەوەکانی خۆتان، لە شۆڕشی کوردستاندا، چی دەڵێن؟ یا، با بڵێین: لە بەر تیشکی ئەزموونە تایبەتییەکانی خۆتاندا، چ جۆرە ئامۆژگارییەک، پێشکەش بە کادێرە تازە پێگەیشتووەکانی بزووتنەوەی کورد دەکەن؟
و33 : دوای ئەوەی، کارەساتی هەرەس ڕوویدا و هەموو شتێ، کۆتاییپێهات، هەر لە سەرەتاوە گوتوومە و هەمیشەش دەڵێم: ئێمە پیربووین و ڕۆڵمان تەواو بوو. پێویستە، دەستەی ڕووناکبیر و هوشیاری کورد، دەس بە سەر بزووتنەوەکەدا بگرن. هەمیشە، داوای ئەم شتەم کردووە. بەڵام، ئەوەی بۆم دەرکەوتووە، لە بەر گەلێ هۆ، دەستەی ڕووناکبیر، چ لە دەرەوەی کوردستان و چ لە نێوەوەی کوردستان، تا ئێستە بە دڵیان نەبووە و نییە، ڕۆڵێکی چالاکانەیان، لە بزووتنەوەکەدا هەبێ. هەمیشە، دوای سەرۆکە کلاسیکییەکان دەکەون، ئەوەش هەڵەیەکی گەورەیە.

پ34 : ئایا پێوەندییتان، لەگەڵ ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان هەیە، بە تایبەتیی « پارتیی » و بنەماڵەی « بارزانیی »؟
و34 : من ئێستە، هیچ جۆرە پێوەندییەکم، لەگەڵ هیچ جۆرە ڕێکخراوێکدا نییە. گەر سۆزێکی دیاریکراوم هەبێ، ئەوا بەپێی ئەو پێوەندییە کۆنانەی،

لەگەڵ هەر دوو لادا هەمبوون، ئەو سۆزە، بە سەر هەر دوو لاکەدا دابەش کراوە. لە لایەکەوە، پێوەندییم لەگەڵ « جەلال » و لە لایەکی دیکەشەوە، پێوەندییم لەگەڵ « مەسعوود »دا هەیە. بەڵام دەتوانم، بڵێم: پێوەندییم لەگەڵ بنەماڵەی « بارزانیی »دا بەهێزترە. ئەویش، لە بەر ئەو پێوەندییە توندوتۆڵەی لە ڕابوردوودا، لەگەڵیاندا هەمبووە و هەمە. هەر چەندە، تووشی گرفت بووبم و ناخۆشییم چێشتبێ. چونکە، من لەو جۆرە کەسانەم، چاکە و باشیی کەسم لە بیر ناچێتەوە. بە بڕوای خۆم، ئەو کارانەی لە شۆڕشدا بەئەنجامم گەیاندوون، کەس ناتوانێ، نکوولییان لێ بکا. بەڵگەشم بۆ ئەوە، ئەو نامەیەیە کە « مەسعوود » بۆی ناردووم. بەڵام، بێ گومان دەبێ، لە سەر ئاستی ڕووداوەکان بڕیاربدەم، نامەوێ، هەست و سۆزم، بە سەر پێوەندیی و باری سەرنجە گشتییەکانمدا زاڵبێ. لەبەرئەوە دەبینی، ئەو نامەیەی، لەو بارەیەوە بۆ « مەسعوود »م نووسیوە، نامەیەکی زۆر ڕەق و ڕوونە. لە سەر ئەو هەڵانەی ڕوویانداوە، من گللەیی لە هەر دوو لایان دەکەم. ناتوانم، لایەکیان بە باش و لاکەی دیکەیان، بە خراپ دانێم. چونکە، هەڵەکان هەر لە سەرەتاوە، دەسی پێکردووە.

ـ ئەدی ئەو گوتارەی، لە سەر بەڕێزتان نووسیویانە، چییە؟

ئەو شتەی، من سەرم لێی دەرناچێ، ئەوەیە: دوای ئەوەی « مەسعوود »، ئەو نامەیەی بۆ ناردم، تا سەردانی کوردستان بکەم، لەو کاتەوە، سێ تا چوار جار، لێپرسراوانی « پارتیی » سەردانیانکردووم. « جەوهەر نامیق »، بە تایبەتیی، لەگەڵ ئەندامانی « پارتیی »دا هاتن بۆ لام و بانگهێشتنەکەی « مەسعوود »ی بە فەرمیی دووبارەکردەوە. هەروەها، پارێزگاری « دهۆک »، « عەبدولعەزیز تەیب »، سەری لێ دام و جارێکی دیکەش، لە « مەسعوود » و کوڕەکەی « ئیدریس »یشەوە، بانگهێشتنی پێ گەیاندم. بەنگهێشتنەکان دووبارەدەبنەوە، بەڵام، من ڕەتیاندەکەمەوە. چونکە، لەو ئاژاوەیەی لەوێ دروسبووە، لەو دەسدرێژییەی لەوێ، بۆ سەر سەربەستییە دیمۆکراسییەکان و ئازادیی گەل دەکرێ، جێی منی تێدا نابێتەوە. بەڵام، وا بزانم، « یەکێتی نیشتمانیی »، جارێکیان لێپرسراوەکانیان، سەردانێکیان کردم، ئیدی دووبارەیان نەکردەوە. ئێستەش، هیچ جۆرە پێوەندییەکم لەگەڵیاندا نییە. ئەوەی لێرەدا سەیربێ، وا دەردەکەوێ، تا ئێستەش، ئاژاوە لە نێو « پارتیی »دا هەر بەردەوامە. لە لایەکەوە دەبینم، « مەسعوود » لە

نامەکەی خۆیدا، باسی ڕۆڵی مێژوویی من لە بزووتنەوەی کوردایەتییدا دەکا.
لە لایەکی دیکەشەوە، ئۆرگانی ناوەندیی « پارتیی »، پتر لە نەوەد دێڕ، لە ڕۆژنامەی « خەبات » تەرخاندەکەن، بۆ ئەوەی، درۆ بڵاوکەنەوە، جنێوم پێ بدەن و سوکایەتییم پێ بکەن، لەبەرئەوەی، توێژینەوەیەکی درێژم، لە سەر شێوازی داواکردنی « فیدراڵیزم » نووسیبوو، سەردەم و کاتی داواکردنەکەیم دیارییکردبوو، لە باری سەرنجی یاساییەوە ڕوونمکردبۆوە و لە ڕۆژنامەی « مەجلس ئەلعێراق ئەلحور »یشدا بڵاوکرایەوە. لەوە دەچێ، لەو کاتەدا ئەوان، دروشمی « فیدراڵیی »یان، تەنیا وەک پڕۆپاگەندەیەکی ڕامیاریی ڕاگەیاندبێ. لەوانەیە، کاتێ من ئەو گوتارەم بڵاوکردبێتەوە، مەبەسەکانیانم ڕیسواکردبێ. لەبەرئەوە، لەو گوتارەدا جنێوبارانیانکردووم. ئەمەش، شتێکی زۆر سەیرە، چونکە، ڕۆژنامەی « پارتیی »، نزیکەی یەک لە سەر سێی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکەیان، بۆ من تەرخانکردووە، نەوەد دێڕ وەک خۆیان دەڵێن: لە سەر کەسێکی هیچوپوچی وەک من بنووسن، ئەم کارە، هەروا بە ڕێکوپێکی بەڕێوە ناڕوا. گەر من کەسێبم بەو هەموو سوکوسەلیمییەوە، بۆچی ئەو کاتە، بە نرخەی خۆیان بە فیڕۆدەدەن؟ باشتر نەبوو، لەبری ئەوەی، جنێو بە من بدەن، هێندێ شتی پەروەردەیی، یا ڕووناکبیریی، یا هەر بابەتێکی دیکە بێ، بنووسن؟! وا دەردەکەوێ، قسەکانم لەو ڕووەوە، بایەخێکی زۆری هەبێ!
– ئایا وەڵامی نامەکەی « مەسعوود بارزانیی »تان داوەتەوە؟
لەو بارەیەوە، نامەیەکم بۆ نووسی، بەڵام، تا ئێستە، وەڵامی نەداومەتەوە. ئەمەشم ناکۆکییەکی دیکەیە. لەوە دەچێ، شەرمەزاربووبێ، لەبەرئەوەی، ئەو گوتارەی لە سەر من نووسیویانە، بێ ئاگاداریی ئەو بووە. ئەوەش، نیشانەی ئەوەیە، هاوئاهەنگیی و دیسپلین، لە نێو « پارتیی »دا نییە.
– ئایا دەتوانم، چاوم بە ناوەڕۆکی هەر دوو نامەکە بکەوێ؟
من سەرو کۆپیت دەدەمێ. تازە، ئەوانە موڵکی من نین، لەبەرئەوەی، کێشەیەکی گشتییە. کۆپییەک لە ڕۆژنامەکەشت دەدەمێ.

پ35 : ئایا، نیازتان هەیە، بیرەوەرییە تایبەتییەکانی ژیانی خۆتان، تۆمارکەن؟
و35 : بە خوا، من زۆر سەرم قاڵە و پەرتووکێکی زۆرم بە دەستەوەیە. هەمیشەش، داوام لێ دەکەن، هانمدەدەن و زاریشم شیریندەکەن. بەڵام، من

وای لێکدەدەمەوە، ژیانی من، ژیانی پیاوێکی پچکۆلەی نادیار و نەناسراوە، واتە: کەس بایەخی پێ نادا، منیش، هەمیشە لام باشترە، دەربارەی ئەو شتانە بنووسم، کە خەڵکی خۆیانیان پێوە خەریککردووە و بایەخیپێدەدەن. بەڵام، گەر کاتم هەبوو، دەسپێدەکەم و بڵاویدەکەمەوە.

**پ36** : لە کاتی پرسیار و وەڵامەکاندا، چەن جارێ باسی مامۆستا «مەسعوود محەمەد »تان کرد، ئایا لە نزیکەوە یەکدی دەناسن؟

**و36** : بەڵێ. کاتێ سەرنووسەری ڕۆژنامەی « تەئەخی » بووم، پێوەندییەکی پچکۆلە و یەکێکی دیکەی گەورەشم لەگەڵیدا هەبوو، کە خۆی نایزانێ. پێوەندییە پچکۆلەکە ئەوەبوو، ڕۆژێکیان « عەلی عەبدوڵڵا »، گوتارێکی بۆ هێنام، بە دەسوخەتێکی ورد و جوان نووسرابوو. گوتی: ئەم گوتارە بخوێنەرەوە و پێم بڵێ؛ بیروڕات دەربارەی چۆنە؟ منیش گوتارەکەم خوێندەوە، بە زمانێکی « عەرەبیی » باش نووسرابوو، هێندێ هەڵەی پچووکیشی تێدابوو، هەر چەندە، هەموو نووسەرێ ئەو هەڵانە دەکا، بەڵام، شتێکی زۆر جوانبوو. پێم گوت: ئەمە لە ڕژنامەکەماندا بڵاودەکەینەوە. ئەم گوتارە هی کێیە؟ « عەلی » پێی خۆشبوو، شاگەشگەبوو! دوای دوو ڕۆژی دیکە، بە هەمان شێوە، گوتارێکی دیکەی بۆ هێنام. دیسانەوە، لە ڕۆژنامەکەماندا بڵاومانکردەوە. دوایی گوتم: « عەلی !» خاوەنی ئەم گوتارانە کێیە؟ گوتی: بە خوا، ئەوە « مەسعوود محەمەد »ە و دەیەوێ، چاوی پێت بکەوێ. سواری ئۆتۆمۆبیلەکەم بووین و یەکسەر چووین بۆ لای. پێکەوە دانیشتین و شتەکان کۆتاییپێهات. بەڵام، پێکدادانی ڕاستیی لە ساڵی « 1960 »دا بوو. لەو سەردەمانەدا، « مەسعوود » وا بیریدەکردەوە، « مەلا مستەفا » کۆمۆنیستبێ.

– سەیرە!

تۆ گوێبگرە، من ئەم چیرۆکەشت بۆ دەگێڕمەوە. پێی وابوو، « مەلا مستەفا » کۆمۆنیستە. « عەبدولڕەزاق محێدین »، مامۆستای زمانی « عەرەبیی » بوو.

– کاتی خۆی، وەزیری « وەحدە » بوو.

پێش ئەوەی وەزیربێ. هەر ئەویش بوو، لە ساڵی « 1970 »دا، پێشنیازیکرد، من لە « کۆڕی زانیاریی عێراق »دا، وەک ئەندام وەرگیرێم. بەڵام، من ڕەتم کردەوە. مامۆستای زمانی « عەرەبیی » بوو، نەتەوەییش بوو. لە ڕۆژنامەی

« ئەلجمهوریە »دا، لە نێوان ئەو و « مەسعوود محەمەد »دا، دەمەتەقێیەک دامەزرا. باسی « مەلا مستەفا »شیان دەکرد. دەیان گوت: ئەو« مەلا سوور »ە شتی لەو بابەتانە و نازانم چی، بە باشی لە یادم نەماوە.
« برایم ئەحمەد » بەو نووسینانە پەستبوو. بێ گومان، ئاگای لە دەمەتەقێکان بوو. گوتی: ئەو دەمەتەقێیانەی ڕۆژنامەی « الجمهوریە »ت خوێندۆتەوە؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: ئەوانە هی « عەبدولڕەزاق محێدین » و « مەسعوود محەمەد »ن، وەڵامیان نادەیتەوە؟ گوتم: « برایم »، با پێت بڵێم: من وەڵامیاندەدەمەوە، بەڵام بە شێوازی تایبەتیی خۆم، وەڵامیاندەدەمەوە، گوتی: تۆ هەرچیت دەوێ، بینووسە. گوتم: بە مەرجێ دەنووسم، هەر دووکیان بێ دەنگکەم. ئێمە نامانەوێ، بێ دەنگیانکەین؟ گوتی: باشە. هەرچی فەرهەنگی زمانی عەرەبیی هەبوو، هەمووییم لە بەردەمی خۆمدا ڕیزکرد. لەبەرئەوەی، « عەبدولڕەزاق محێدین »، مامۆستای زمانی « عەرەبی » بوو، نووسەریش بوو، هێندێ شت هەبوو، نەدەبووایە، هەڵەی تێدا بکا. لە پێشدا، گوتارەکەی ئەوم هێنا. بەم شێوەیە دەسمپێکرد، تا ئێستەش، « برایم » لە بیریماوە و باسیدەکا. گوتم: ئێستە ئێمە، دەربارەی هێندێ کێشەی ڕامیاریی ڕووت، دەمەتەقێیەک، لە نێوان مامۆستا فلان و مامۆستا فلاندا، لە ڕۆژنامەی « ئەلجمهوریە»دا دەخوێنینەوە. لە سەر دید و بۆچوونە ڕامیارییەکان ناتوانین، لە مامۆستا « عەبدولڕەزاق محێدین » بپرسینەوە، لەبەرئەوەی ڕامیار نییە. دەتوانین لە سەر نووسینەکەی و توانای لە زمانی « عەرەبیی »دا، لێپرسینەوەی لەگەڵدا سازکەین، بەو پێیەی، مامۆستای زمانی « عەرەبیی » و مامۆستای مامۆستاکانی پاشەڕۆژە. بە کورتیی: هەموو زمانە « عەرەبیی »یەکەیم، لە سەرەوە تا خوارەوە هێنا و هەر بە گروون، گرووم. دوازدە تا سیازدە، هەڵەم لێ دۆزییەوە، بۆم ڕیزکرد و یەکسەر، لە ڕۆژنامەی « خەبات »دا بڵاومان کردەوە. لە کۆتایی گوتارەکەشدا، هەر بەم شێوەیە نووسیبووم: بەڵام، بۆ نووسەری دووەم، کاک « مەسعوود محەمەد »، قسە و باسێکی دیکەمان لەگەڵیدا هەیە. یەکسەر « برایم » گوتی: ئەم گوتارە دەبێ، بڵاوکرێتەوە. ئای « برایم !» چەن ورد و هەست ناسکە، لە ڕووی « عەرەبیی »یەوە، زمانەکەی زۆر باشە. بڕوابکە، ئەو ژمارەیەمان، دوو جار چاپکردەوە. دەمزانی، ئەو ژمارەیە، دەس خوێندکارەکانی « خانەی مامۆستایانی باڵا » کەوتبوو. هەر خوێندکارێ، دانەیەکی کڕیبوو، کاتێ لە پۆلدا لەگەڵ « عەبدولڕەزاق م. »دا

پێکگەیشتبوون، لەو بارانەوە، پرسیاریان لێ کردبوو، نەیتوانیبوو، وەڵامیان بداتەوە.
ـ تەنیا هەڵەی زمانەوانیی بوو؟
بەڵێ. دوای ئەوە، ئیدی هەر دووکیان بێ دەنگبوون. « مەسعوود محەمەد »، تا ئێستەش نازانێ، کێ ئەو گوتارەی نووسیوە. ئەوە یەکەم جارە، بۆ تۆی باس دەکەم.

پ**37** : وەک لە ساڵی « 1991 »دا، ئەم پرسیارەم ئاراستەکردن، ئەورۆش، چاوپێکەوتنەکەمان، بە هەمان پرسیار کۆتاییپێدێنین. ئایا « بارزانیی » هەڵەی هەبوو؟
و**37** : « بارزانیی »، مرۆڤبوو. مرۆڤیش، هەڵەدەکا. تەنانەت، پێغەمبەرانیش هەڵەدەکەن. لەبەرمبەیانی مێژووەوە تا ئەورۆ، هیچ سەرکردەیە، لە سەرکردەکانی جیهان نابینین، چاکە و خراپەکانیان، بۆ ڕیز نەکردبن و بۆیان نەبژاردبن. ئەویش هەرگیز، لەو یاسایە بەدەر نەبووە و نییە. لە کاتی وتووێژەکانماندا، هێندێ لە هەڵەکانیم، بۆ پەنجەژمێرکردی. یەکێ لە هەرە هەڵە گەورەکانی ئەوەبوو، بڕوای بە هێندێ خەڵک دەکرد، نرخی نینۆکێکیشیان نەبوو.
ـ گەر هەر شتێکی دیکەتان هەبێ و بتانەوێ، باسیکەن، فەرموون.
نەخێر. هیچی دیکەم نییە. تەنیا داواکارییم ئەوەیە، ئێوەی ڕووناکبیری کورد، بە شێوەیەکی ڕاست و ڕێکوپێک، ئەرکی نیشتمانیی سەرشانی خۆتان بەجێ بگەیەنن. بەوە دڵم دەحەوێتەوە و سەرم بەرزدەبێتەوە. چونکە، بۆم دەسەلمێ، هەر چی ماندوویی‌مان هەیە و هەر چی هەوڵێکماندا‌وە، بە خۆڕایی نەڕۆیشتووە.
ـ مامۆستای هێژا، گەلێ سوپاستدەکەم، کاتێکی زۆرم لێ گرتی، داوای لێبوردنت لێ دەکەم، ماندوومکردی.
کاکە! تۆ ماندووتکردم. بەڵام، هەر چی چۆنێ بێ، ئێستە دەبێ، ئەم شتانەت بۆ کۆبیکەم، تا بڵاویانکەیتەوە.

* * *

الاستاذ العزيز جرجيس فتح الله المحترم

تحيه طيبه.

اكتب لك هذه الرساله لاوكد مدى تقديرى و احترامى لك. و لا يمكن ان ننسى دورك و علاقتك التاريخيه معنا. و يسعدنى جدا ان تتفضل بزيارتنا فى اقرب وقت مناسب و سوف نقوم بكل ما يلزم اذا قررتم السفر.

بامل اللقاء مع فائق التقدير

المخلص

مسعود البارزانى

١٩٩٥/١٢/١١

جرجيس فتح الله المحامى السويد ـ كاترينهولم فى ٢٠من كانون الثانى

١٩٩٦

المحترم السيد مسعود البارزانى
رئيس الحزب الديمقراطى الكردستانى

سلام عليك و بعد
لقد تسلمت بسرور رسالتك الرقيقه المورخه فى ١١ من كانون الاول الماضى. و لم يكن مصدر عجب لى احاسيسك النبيله و مشاعر المحبه التى تكنها لى. فانا ما شككت مطلقا فى صدقك و فى كل عباره طيبه كتبتها عني. و لا سيما دعوتى لزياره كردستان. الا ان مصدر عجبى هو ورود الرساله و الدعوه فى زمن متاخر جدا. لان رايك الذى ابديته عنى و اقرارك الصريح بدورى و العلاقه التاريخيه التى تربطنا، لا تشارككك فيه او ترضاه لك قياده حزبك. فقد سجلت نقيضا لرايكم هذا عنى بمقال طويل ليس فيه غير شتائم و اكاذيب رخيصه و عبارات قذف و قدح نشرته فى العدد ( ٦٨٠) من خهبات جريده الحزب الرسميه. انى ابعث لك بنسخه منه و انا واثق بانه كتب من وراء ظهرك و من دون علمك، و هو واحد من البراهين على ان كثيرا من التصرفات الشاذه اللااخلاقيه التى تعزى الى قياده الحزب تتم من دون علم منك.
فهذه هى اذن مكافاتى عن دورى التاريخي. و هى واحده و ليست الاخيره من مكافات مماثله تلقيتها طوال اكثر من ربع قرن و انت اعرف بها من غيرك. ان مصدر عجب العارفين بها غيرك هو انى بقيت اصمد لها و حافظت على اخلاصى و كلمه الشرف التى قطعتها للوالد قبل رحيله. و خلافا لما ورد فى رساله مسوولكم الحزبى هنا. فانا ازداد فهما للحياه. و اتمتع بنشاط عقلى رغم تقدمى فى السن و حين يصاب الاخرون بخرف الشيخوخه و التفسخ الذهنى و الخلقى. و الفضل فى ذلك لتربيه سليمه تلقيتها من ابوين صالحين و ليس فى الشوارع و الازقه. و قد حافظت على هذاالمستوى دائما. و انا ارى مردوده كل يوم و كل ساعه فى الاحترام

و مـحبه اللتين يخصني بهما الاف من قراء ما اكتبه و هم يولفون حولي حصنا منيعا لا تقوى ايه قذيفه توجهها قياده حزبكم مع احداث خدش في جداره. اطمئن مني. فلن ادخر وسعا و لن اترک مناسبه الا انتزعها للدفاع عن شخصک و سمعتک بالحق و ابحث عن الانتهازيين و الوصوليين و النفعيين و الخبثاء و العملاء بين من يحيط بک و اعمل على التخلص منهم قبل فوات الاوان. و كل ما اتمناه لک و لابناء البارزاني و احفاده ان يخرجكم الله من هذه المحنه سليمي السمعه و الصحه. فبوجود عدد من هولاء الذين وصفهم حولک - لا اراني اجد لي مكانا.

المخلص - توقيع

من جرجيس فتح الله:

# ـ ايضاح و تنبيه ـ

## حول ما يحصل فى " المنطقه الامنه "

## بمناسبه مقابله اجراها د. حسين محمد عزيز مع الكاتب

طرح الدكتور عزيز فى العام الماضى جمله من الاسئله تتعلق بماضى القضيه الكرديه وحاضرها ومستقبلها وكذلك بتجاربى الخاصه فيها. ثم نشرها بكتاب عنوانه " خولانەوه له بازنەيەكى بۆشدا " اى نحن ندور فى حلقه مفرغه. وقد تم تسجيل هذه المقابله خلال عده جلسات وباللغه العربيه. دفعنى الى الاسراع بتلبيه طلبه تاكيده لى مرارا بانه شخص محايد لا يدين بولاء لاى من الجهات المتصارعه فى كردستان (ظهر فيما بعد انه عضو فى مجموعه سياسيه اطلقت على نفسها اسم المؤتمر القومى الكردستانى ) وهى مجموعه تشن حملاتها عن طريق تلفزيون كردستان ضد الحزبين المتصارعين وتخص باشد حملاتها الحزب الديمقراطى الكردستانى.
ذكرته فى ختام المقابله بالواجب المفروض على امثاله، وهو ان يبعث لى بالنص العربى بعد كتابته لاعاده النظر فيه وتنقيحه وتهذيبه ووضعه فى صيغته النهائيه ولتذيليه بتوقيعى والا ذن بنشره. فوعد بذلك لكنه لم يفعل رغم اتصالى به مرارا وطلبى البر بما قطعه على نفسه وكنت اخشى ان يحشر فيه ما يجرى من احاديث خاصه خارج نطاق الرد على الاسئله حيث اعتدت تنبيهه الى ذلك مسبقا.

نشرت ترجمه المقابله دون اطلاعي على النص كما قلت. وقد ذكر لي من اثق بقوله ان بعض ما جاء في المقابله قد يختلف اختلافا بينا عن الاراء و المعتقدات التي جاهرت بها قولا وكتابه في مولفاتي ومقابلاتي واحاديثي الصحفيه ومحاضراتي وكلها تقريبا كانت باللغه العربيه وقليل جدا منها بالانكليزيه والفرنسيه. و قد اعتاد كل من اخذ عن لساني بمقابله ان يعرض على ما قلته او ما دونه قبل نشره ولا ادري ما الذي حمل صاحب المقابله على ان ينحو هذا المنحى؟

ومهما يكن من امر فالاصل عندي هو سلامه النيه وسمو القصد وهو ما كنت اتوقعه واطلبه من كل انسان ينقل عني ويتحدث الي.

سابقي والحاله هذه المسؤول عن كل راي او افكار اكتبها وانشرها ولا جناح على فيما يدون عني وينقل عن لساني او يترجم عني من دون موافقتي المسبقه ومن غير اطلاعي عليه. وقد عرفني قرائي باني لا اهتم قط بالحساسيات والمشاعر التي اخلفها اسلبيه كانت تلك المشاعر ام ايجابيه. لا سيما في مسيره الظروف الدقيقه والماساه الكبرى التي يعاني منها العراق و تحديدا شماله. وهي ماساه مضاعفه فكريه واجتماعيه.

والتزامي بقول ما اراه حقا واجبا، انما يفسره موقفي من الحزبين المصطرعين فوق ارض الوطن. ولي في كليهما رفاق نضال ذي تاريخ بعيد لا يتذكره من هم اليوم على حافه مرحله الكهوله.

وبودي الان عرض مثل واقعي: بالنسبه الى حزب الاتحاد الوطني الكردستاني، لم يصدر ولم اسمع بمدى علمي كلمه سوء او نقد وجه ضدي و ضد كتاباتي حول ما يجترحه هذا الحزب من اعمال لا قانونيه وتصرفات شاذه واعتدائات على المبادىء الديمقراطيه وحقوق الانسان، وخصوصا ضد اساليبه الدمويه في محاوله القضاء على خصمه سياسيا وعسكريا وما جره هذا من نوائب ونكبات على سائر الاهالي وما تخلله من وقائع وضحايا ومع موقف هذا الحزب مني، فان ذلك لم يحل قط بيني وبين فضح اساليبه دون التخفيف من وقعها او محاوله تلمس بعض العذر له عنها.

وبالمقابل فقد هوجمت وطعن في سيرتي وشوه ماضي واتهمت في خلقي و شتمت بما لم يشتم به احد من قبل، بمقال تهكمي كبير الحجم في الجريده الرسميه للحزب الديمقراطي الكردستاني. فلم يفقدني هذا اتزاني، ولم يدفعني الى التهويل والغلو في فضح وتعريه ما يجرى من اعتداءات على

الديمقراطيه والحريات الفرديه والتسيب القانوني. وايه ذلك بقاء علاقه الموده والاحترام المتبادل بيني وبين رئيس ذلك الحزب وهي علاقه شخصيه لا تنال منها ارائي السياسيه نائلا ولا اتوقع ان تزيل اى قدر من المشاعر وتلك الموده التي ساستنجد بها واضعها على المحك بعد قليل. لهذا السبب ولاني كنت اريد أن يبدو موقفي منه واضحا للجميع. اذنت لصاحب المقابله نشر نص جوابي على الدعوه التي وجهها الى لزياره كردستان.
فالى اولئك الذين يضعون ما جاء في المقابله تحت المجهر اقول: اما كان الاحرى بهم تركيز كل الجهود وادخارها من اجل وضع حد للنزف الدموى القائم على قدم وساق في ارض الوطن؟ اليس هو احفظ للسمعه واحفى بالمنتقدين؟

**تێبینیی :**
بێ گومان، ئەمە تەنیا ئەو بەشەی گوتارەکەیە، کە پێوەندیی بە چاوپێکەوتنەکە و منەوە هەیە. ئەگینا، گوتارەکە گەلێ لەوە درێژترە و ئەوانی دیکەی، هیچ جۆرە پێوەندییەکی بە منەوە نییە. بۆیە، بە پێویستم نەزانی، هەمووی بنووسم. هەر کەسێکیش دەیەوێ، هەموو گوتارەکە بخوێنێتەوە، ئەوا ناو و ژمارەی گۆڤارەکە، لە وەڵامەکەی خۆمدا بڵاوکراوەتەوە.

# بەری خۆری ڕاستیی، بە بێژنگ ناگیرێ!

لە گۆڤاری « حویودو »ی مانگی « فێبروەری/1998»، ژمارە «6747 »دا، مامۆستای هێژا « جەرجیس فەتحوڵڵا »، لە بەر ڕۆشنایی یاسای « نە شیش بسووتێ و نە کەباب »، بە ئارەزووی دڵی خۆی، گوتارێکی چوار ستوونیی ڕازاندۆتەوە. هەر چەندە، گوتارەکە بە ناو، دەربارەی « ڕووداوەکانی ناوچەی ئارام » نووسراوە، بەڵام دیارە، مامۆستا بە هەلیزانیووە، بۆیە ستوون و نیوێکی نووسینەکەی، بۆ من تەرخانکردووە! هەرچی چۆنێ بێ، دەمەوێ، پێش ئەوەی، وەڵامی مامۆستا بدەمەوە، چەن ڕاستییەک، بۆ هاوزمانەکانم ڕوونکەمەوە:

وەک چەن جارێکی دیکە باسمکردووە، هەموو ئەو ڕاستییانەی، لە دووتوێی بەرهەمەکانمدا بڵاویاندەکەمەوە، بۆ لایەنێکی دیاریکراوی تۆمار ناکەم. بەڵکوو، تەنیا بۆ « جەماوەر، نەوەکانی دوارۆژ و مێژووی پڕ لە تەمومژاویی نەتەوە »کەمی دەنووسم. جا، ئیدی کێ و کام ڕێکخراوی ڕامیاریی، قازانجی لێ دەکا، کام لایەن زیانی لێ دەبینێ، ئەوەیان پێوەندیی بە منەوە نییە و ئەز هیچ باکێکم پێی نییە. چونکە، بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەکەم، لە سەرو هەموو شتێک و هەموو لایەنەکانەوە داناوە، ڕاستیی و هەقیش، لای کێ بێ، نووسینەکانی منیش، تەنیا، میوانێکی ئێسکسووکی ئەو لایەنە دەبێ. بە پێچەوانەشەوە، هەر لایەنێ، لە ئاستی ڕاستیی و هەقدا، سەر ڕووت و پێخاوس بێ، مەگەر تەنیا، مێش میوانی بێ!

بەرهەمەکە، چ لە هەندەران و چ لە کوردستان، سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەس هێنا و بە تەواویی دەنگیدایەوە. لە کوردستان ڕۆژنامەی « کوردستانی نوێ » سێ ڕۆژ لە سەر یەک، لە سەر ئەو چاوپێکەوتنەی نووسیوە. جەماوەری تینووی ڕاستیی و هەقیش، بێ ئەوەی پرس بە خۆم بکەن، بە سەدان دانەیان

لێ کۆیکردووه و بڵاویانکردۆتەوە. ئەو سەرکەوتنە مەزنە، لە لایەکەوە، کوێرایی بە چاوی، دوژمنانی ئازادیی بیروڕادەربڕین و دێمۆکراسییدا هێنا، لە لایەکی دیکەشەوە، چ لە کوردستان و چ لە هەندەرانەوە، بە دەیان نامە و چەپکەگوڵی دەسخۆشانەم، لە دۆستان و خوێنەرانەوە پێگەیشت.
دوای ئەوەی، گوتارەکەی مامۆستام خوێندەوە، یەکسەر بە تێلیفۆن، پێوەندییم پێوە کرد و هێندێ پرسیارم ئاراستەکرد، ئەویش زۆر بە ڕێزەوە، هەموو شتێکی بۆ ڕوونکردمەوە و داوای لێ کردم، بێ دەنگبم و وەڵام نەدەمەوە. منیش داواکارییەکەیم پەسەندکرد. بە داخەوە، پلەی ڕێزم بۆ مامۆستا و ڕەوشتم، ڕێی ئەوەم نادا، لێرەدا قسەکانی مامۆستا بگێڕمەوە.
بەڵام، دوای ئەوەی، هێندێ پڕوپاگەندەی بێ سەروبەرم بیستەوە، چەن کەسێکی بێ ویژدان و مشەخۆر دەیانەوێ، نان و پیازی پێوە بخۆن و بەری تیشکی خۆری ڕاستیی، بە بێژنگی کونکونکراوی درۆودەلەسە و ناپاکییەکانیان بگرن، بڕیارمدا، هێندەی نووسینەکەی مامۆستا، پێوەندیی بە منەوە هەبێ، ئەم ڕوونکردنەوەیە بڵاوکەمەوە. ئێستەش، کاتی ئەوە هاتووە، ئاوڕێ لە نووسینەکەی مامۆستا بدەینەوە و چەن تێبینییەکی کورت، بۆ مێژوو تۆمار کەین.
1. چاوپێکەوتنەکە، ڕۆژی « 1997/4/18 » سازکراوە و لە ناوەڕاستی مانگی « سێپتێمبەر »دا بڵاوکراوەتەوە. مامۆستا، لەو ماوە دووروردرێژەدا، بێ دەنگ بوو، نازانم، بۆچی ئێستە بیریکەوتۆتەوە، وا کای کۆن بەبادەکا؟! دیارە، « ئەم ماستە، موویەکی تێدایە! ».
2. مامۆستا، هەرچییەکی گوتووە، لە سەر چوار کاسێتی نەوەد خولکەیی، بە زمانی « عەرەبیی » تۆمارکراوە. پاشان، منیش دەقەکەیم بە « کوردیی »، کتومت وەک خۆی بڵاوکردۆتەوە. هەر چەندە مامۆستا، جارێکی دیکە، بۆی دووپاتکردمەوە، بە هیچ جۆرێ، گومانی لە دەسپاکیی من نییە، بەڵام، کەسێ گومانی لە هەر شتێ هەبێ، ئەوا بۆ مێژوو بەڵگەکانمان لا چنگدەکەوێ!
3. تا ئێستە، چەندین کەسی نەناسیاو و ناسیاوی دڵسۆزی خۆم، بە تێلیفون و بە نامە، پێیان ڕاگەیاندووم، گوایە: هێندێ لەو زانیارییانەی، لە چاوپێکەوتنەکەدا هاتووە، فرێ بە سەر ڕاستییەوە نییە. جگە لەوەی، ئەو هەواڵانە، هیچ پێوەندییەکی بە سەر منەوە نییە، تەنیا مامۆستا، لە ڕاستیی و ناڕاستیی وەڵامەکانی خۆی بەرپرسیارە، من هەر هێندەم لە سەرە، بە

دەسپاکیی، وەڵامەکانی مامۆستا بڵاوکەمەوە، ئەگینا، لە ڕووی دید و بۆچوونەکانییەوە، وەک لە پێشەکییەکەشدا گوتوومە: (هەرچی لە دووتوێی ئەم پەرتووکە دایە، بیروڕای تایبەتیی مامۆستا خۆیەتی، مەرج نییە، من لەگەڵ هەموو بیروڕاکانیدا یەکبگرمەوە.)« ل ـ 16 » لەگەڵ ئەوەشدا، بۆ ئەوەی کەشێکی دیمۆکراسیی دروسبێ، دیالۆگێکی ئازاد و سەربەخۆ، دەربارەی مێژووی هاوچەرخی کورد و نهێنییەکانی شۆڕشی چەکداریی «11/ سێپتێمبەر » بخوڵقێ، داوام لە هەموو برایەکی ئازیز کردووە، وەڵامیبدەنەوە و ڕاستیی بۆ جەماوەر یەکلاییکەنەوە. چونکە، مەبەسی سەرەکیی من لەو چاوپێکەوتنانە، تەنیا ڕوونکردنەوەی ڕاستییە.
4. مامۆستا، بۆ خۆی ئازادبوو، کەس ناچاری نەکردبوو، ئەو زانیارییانە بدرکێنێ. بەڵکوو، زۆر بە ئازادیی و بە ئارەزووی تەواوی دڵی خۆی، بیروڕاکانی دەربڕیوە، بە هەموو کوڵودڵ و لە کانگای بڕواوە قسەیکردووە. بە تایبەتیی، تەنیا مەرجی ئەو ئەوەبوو، پێش چاوپێکەوتنەکە، پرسیارەکانی بۆ بنێرم، منیش بۆم نارد. جا گەر ئەوڕۆ، لە بەر هەر هۆیە بێ، لە هێندێ دید و بۆچوونی خۆی، پەشیمانبووبێتەوە، لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمدا، ئەوەیان هیچ پێوەندییەکی، بە منەوە نییە و تەنیا بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.
5. لەگەڵ ئەوەشدا، کە مامۆستا، پایەیەکی ئەکادێمیی دیاریکراو و ڕێزێکی تایبەتیی، لای من هەیە، نەدەبووایە، ئەو باسەی، لەگەڵ گیروگرفتی « ئاشووریی »یەکاندا تێهەڵکێشکردایە، گلەوگازندەی هێندێ کەس و لایەن، کاری تێبکردایە و ئەو وەڵامەی بنووسیایە!
6. ئەوەی دڵخۆشکەرە، مامۆستا، هیچ ڕەخنەیەکی، لە سەر ناوەڕۆکی بابەتی چاوپێکەوتنەکە نییە، وەک هێندێ گێرەشێوین دەهۆڵی بۆ دەکوتن. بەڵکوو، هەموو گلەییەکانی، لە خانەی ڕەخنەی تەکنیکیی و شێوەی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکەدا جێیاندەبێتەوە.
7. ناوی بەرهەمەکە بە « عەرەبیی »، « الدوران فی حلقه مفرغه »یە، نەک وەک مامۆستا نووسیویەتی: « نحن ندور فی حلقه مفرغه ».
8. تا ئێستە چەن جارێ، دەربارەی بێ لایەنیی، هێندێ شتم ڕوونکردۆتەوە. وا جارێکی دیکەش لێرەدا، هەڵوێستی خۆم دووبارە دەردەبڕمەوە. ئەز، هەر هێندە بێ لایەنم، تا ئەوڕۆ ئەندامی هیچ ڕێکخراوێکی ڕامیاریی کوردیی و کوردستانیی نیم. هەر کاتێکیش، بەو باوەڕە گەیشتم، دەبێ، لە ڕێکخراوێکی

...ی کوردستانییدا، کاربکەم و جێی خۆم بکرم، ئیدی خۆی لە حورتە و سرتە و بۆڵەی، هیچ کەس و هیچ لایەنێکی دیکە ناگرم، چەن گەورە بێ. بەڵام بێ لایەنییم، ئەوە ناگەیەنێ، لە ئاستی ئەو کارەساتانەی بە سەر نەتەوەکەمدا دێ، بەرانبەر ئەو ڕووداوانەی، لە کوردستان ڕوودەدەن، وەک کورد و وەک نووسەر، بێ لایەنبم. نەخێر، هەرگیز بێ لایەن نەبووم و هەرگیزاوهەرگیزیش بێ لایەن نیم و ناشبم. چونکە، هەموو ئەو هەڵە و تاوان و ناپاکییانەی، لە لایەن پارتە کوردستانییەکانەوە، بەرانبەر بە نەتەوەکەم دەکرێ، بمەوێ و نەمەوێ، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، کارمتێدەکەن. هەروەها، من کەسێکی بیانی نیم، تا لە دوورەوە، تەماشای کارەسات و ڕووداوەکان بکەم، بەڵکوو، بە شانازییەوە دەڵێم: کوردم و خۆم بە ڕۆڵەیەکی ئەو نەتەوە هەژارە چەوساوەیە دادەنێم. لەبەرئەوە، لەو ڕۆژەوە دەنووسم، کەم ڕووداو و کارەساتی نەتەوەیی هەیە، لە بەرهەمەکانمدا، بە ئاشکرا، هەڵوێستی نەتەوەیی و نیشتمانیی خۆمم، بەرانبەریان دەرنەبڕیبێ، نووسیەنەکانیشم، گەواهیی ئەوەم بۆ دەدەن!

9. تەنیا یەک جار، مامۆستا، دەربارەی بێ لایەنییم لێی پرسیم و منیش، لەو ڕووەوە دڵنیامکرد. بەڵام، مامۆستا لە نووسینەکەیدا دەفەرموێ: « دوایی دەرکەوت، لە کۆمەڵێکی ڕامیارییدا ئەندامە و ناوی خۆیان ناوە « کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان ». ئەمانەش کۆمەڵێکن، لە ڕێی تێلیڤیزیۆنی کوردستانەوە، دژی دوو پارتە شەڕکەرەکە، شاڵاوی هێرشکردن دەبەن، توندترین شاڵاویش، بۆ سەر پارتی دێموکراتی کوردستان تەرخانکراوە).

کاتێ، لە « 1997/8/18 »دا، بەشدارییم لە کۆبوونەوەکانی، « کۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان » لە « برۆکسل » کرد، پێش ئەوەی بڕۆم، بە تێلێفۆن مامۆستام ئاگادارکرد. دوای ئەوەی گەڕاشمەوە، بە درێژیی، باسی کۆبوونەوەکانی کۆنگرەم بۆ کرد. بەڵام، ئەو هیچ تێبینییەکی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا چاوپێکەوتنەکەش بڵاو نەبووبۆوە!

لێرەدا دەمەوێ، ئەوە بڵێم: بە داخەوە، مامۆستا هێندێ زانیاریی، لە چەن کەسێکی سەرلێشێواوە وەرگرتووە. زانیارییەکانیش وەنەبێ، تەواوین، بەڵکوو، زۆربەیان هەڵەن. چونکە، کۆنگرەی نەتەوەیی، جگە لەوەی، ڕێکخراوێکی ڕامیاریی نییە، هێشتا دروسیش نەبووە! تا ئێستەش، چەندین ڕێکخراوی کۆنگرەی نەتەوەیی، لە هەندەران هەن، بەڵام، هیچیان نەیانتوانیوە، بە تەواویی، کوردە پەنابەرەکان و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی

کوردستان، له دەوری خۆیان کۆکەنەوە و لۆبییەکی کوردیی و کوردستانیی پێکبێنن، سەرکەوتن بەدیبێنن و بە شێوەیەکی فەرمیی و باوەڕپێکراو، ڕێبەرایەتی کوردەکانی هەندەران بکەن. هەر چەندە، ئەوانەی لە کۆبوونەوەکانی « بروکسل » و کۆڕەکانی « ستۆکهۆلم »دا بەشداربوون، باوەڕی من، بەرانبەر کۆنگرەی نەتەوەیی باش دەزانن! لەگەڵ ئەوەشدا، کۆنگرەی نەتەوەیی، گەر بە شێوەیەکی ڕێکوپێک بکرێ و بە تەواویی، سەر بگرێ، ئاواتی هەموو کوردێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەر و ڕووناکبیرە، بە تایبەتیی، بۆ نەتەوەیەکی لەتوپەتکراوی بندەسی وەک کورد، گەلێ پێویستە. بۆیە دەبێ، جگە لە تاکەتاکەی خەڵکی کورد، هەموو ڕێکخراوە « پیشەیی، دیمۆکراسیی، ڕامیاریی »یەکانی کورد و کوردستانیش، چ لە دەرەوە و چ لە ناوەوەی وولات، لە هەر شوێنێ بن، بەشداریی تێدا بکەن.

10. لە ڕاستییدا، کەسێ گوێ لە تێلێڤیزیۆنی « Med » ڕاگرێ، ئەو تاوانبارکردنە ڕاست نییە. چونکە، جگە لەوەی مامۆستا، کوردیی باش نازانێ، کەناڵی «Med TV »شی نییە، تا بزانێ، شاڵاوی هێرش، بۆ سەر ئەو دوو لایەنە دەبا یا نا، بەڵکوو، ئەم هەواڵەی لە نەیارێکی ئەو دەزگە کوردییەوە وەرگرتووە! دەتوانم بڵێم: «Med TV »، نەک هەر هێرشی ناڕەوا، بۆ سەر هیچ لایەنێ ناکا، بە ڵکوو تا بڵێی، تێلێڤیزیۆنێکی زمان پاکە، وەک هەموو تێلێڤیزیۆنەکانی دیکەی ئەم جیهانەش، تەنیا دەنگوباسەکان بڵاودەکاتەوە. هەروەها، کۆنگرەی نەتەوەییش، تا ئێستە، ئەو تێلێڤیزیۆنەی، بۆ هێرشکردنە سەر هیچ لایەنێکی کوردیی و کوردستانیی بەکار نەهێناوە، بەڵکوو، چەن جارێ، بانگهێشتنی تایبەتیی، لە هەر دوو پارتە شەڕەکەرەکەش کردووە، ئەو جەنگە چەپەڵە ڕاگرن و بەشداریی، لە کۆنگرەی نەتەوەییدا بکەن.

11. بە شێوەیەکی گشتیی، لە چاوپێکەوتندا، دوو ڕێبازی جیاواز پێڕەو دەکرێ. یەکەمیان ئەوەیە: هەر دوولا پێشەکیی، لە سەر شێوازی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکە ڕێکدەکەون. دوای ئەوەی، چاوپێکەوتنەکە تەواو دەبێ، چاپدەکرێ، بۆ لایەنی دووەم دەنێررێتەوە، تا چاوێ، بە بیروڕاکانی خۆیدا بخشێنێتەوە. بەڵام، جگە لەوەی، ئێمە لەو بارەیەوە باسی هیچمان نەکردبوو، بە هیچ شێوەیەکیش، باوەڕم بەو جۆرە چاوپێکەوتنانە نەبووە و نییە. تەنانەت، لە ساڵی « 1995 »دا، لەگەڵ مامۆستا « برایم ئەحمەد »یشدا، چاوپێکەوتنێکم سازکرد، تا بڵاوم نەکردەوە، پیشانم نەدا.

جۆری دووەمیشیان ئەوەیە: هەر کە چاوپێکەوتنەکە تەواوبوو، ئیدی، کۆتایی پێ دێ و لایەنی یەکەم، ماوە بە لایەنی دووەم نادا، بە بیروڕاکانی خۆیدا بچێتەوە. من ئەم ڕێبازەیان پێڕەودەکەم. چونکە، بە باوەڕی من، ژۆرنالیستی سەرکەوتوو ئەو کەسانەن، وەک چۆن هەڵۆیەکی برسیی، پاروو لە دەم باڵندەیەکی دیکە دەفڕێنێ، دەبێ، ئەویش بەو شێوەیە هەوڵبدا، ووشەی سەر زاری بەرانبەرەکەی خۆی بقۆزێتەوە و یەکبەیەک تۆماریانکا. بە هیچ شێوەیە نابێ، دوای ئەوەی چاوپێکەوتنەکە تەواودەبێ، دەقەکەیان بداتەوە، تا بە کاوەخۆ دانیشن و قسەکانیان گوڵبژێرکەن. چونکە، لە کاری چاوپێکەوتندا، گرنگ ئەوەیە، ئەو کاتە، ئەو کەسە، چی دەڵێ؟ تا چەن، ئاگای لە خۆیەتی و هەڵە ناکا؟ ژۆرنالیستەکە، چۆنی دەجوڵێنێ؟ چ جۆرە پرسیارێکی لێ دەکا؟ جا، گەر وا نەبێ، ئەو کەسە خۆی دەتوانێ، لە ماڵەوە دانیشێ، بە ئارەزووی دڵی خۆی، چی بوێ، بینووسێ، پاشان، لە شێوەی نامیلکەیەکدا، یا پەرتووکێکدا بڵاویکاتەوە!

بۆیە، دوای ئەوەی چاوپێکەوتنەکە تەواوبوو، مامۆستا، داوای لێ کردم، پێش ئەوەی بڵاویکەمەوە، بۆی بنێرمەوە و پیشانیبدەم، تا بزانێ چی گوتووە. بەڵام، من هەر ئەو کاتە، بە ئاگاداریی هاوڕێم « نەبیلی نووریی مەتیی »، یەکسەر داواکارییەکەیم ڕەتکردەوە و پێم گوت: « ئەز، ئەو ڕێبازە لە چاوپێکەوتندا ڕەچاو ناکەم، بڕوات هەبێ، چیت گوتووە، هەر ئەوە بڵاودەکەمەوە، بێ ئەوەی، هیچ جۆرە شتێ کارمتێبکا. جگە لەوەی بەڕێزتان، لەو کوردییەی من تێ ناگەن، چونکە، من بە عەرەبیی بڵاوی ناکەمەوە ». پاشان، مامۆستا گوتی: « من باوەڕت پێ دەکەم و هیچی دیکەی نەگوت ». ئەوە تەنیا، هەر ئەو جارە بوو، نەک وەک مامۆستا دەڵێ: « چەن جارێکی پێ گوتبم و بەڵێنم دابێتێ! » دیارە، مامۆستا زووزوو، شتی بیردەچێتەوە!

12. هێندێ لەو شتانەی، لە چاوپێکەوتنەکەدا درکاندوونی، لە کۆڕەکەی ڕۆژی « 1997/4/6 ـ کۆمەڵەی کوردستان ئاوارە »دا، لە بەر چاوی جەماوەرێکی زۆر، لە کوردە پەنابەرەکانی شاری « ستۆکهۆڵم »، بە ڕاشکاویی باسی کردوون. کەچیی ئێستە، بە نهێنیی و شتی تایبەتیی، نێوان خۆمانی دادەنێ! بەڵێ، هەر وەک لە پێشەکییەکەشدا نووسیومە، هێندێ جار دەیگوت: ڕیکۆردەرەکە بکوژێنەرەوە، تا شتێکی تایبەتییت بۆ باسکەم، بەڵام، من نەمدەکوژاندەوە، چونکە، هەموو چاوپێکەوتنەکەم، بە شتێکی دانسقە و

تایبەتیی دەزانی. جگە لەوەی، دوای چاوپێکەوتنەکەش، چ بە تێلێفۆن و چ بە نامە، هێندێ پرسیاری دیکەم ئاراستەکردووە، بە سنگێکی فراوانەوە، وەڵامی داومەتەوە، منیش، وەڵامەکانم لەبەرەوە تۆمارکردووە.
لە کۆتاییدا دەڵێم: مامۆستاله چاوپێکەوتنەکەدا، هەرچی ویست، بێ دڵەڕاوکە درکاندی، بە تەواویی، دەردی دڵی خۆی دەربڕی. دواتریش، لای هێندێ دۆستی ئازیزی هەر دوولامان، گوتبووی: ووشەکان لە ناخی دڵمەوە دەرچوون و لێیان پەشیمان نیم. بەڵام، کاتێ چەن کەسێ، یا ڕێکخراوێکی دیاریکراو، بە قسەکانی مامۆستا نیگەراندەبن، هەراسانیدەکەن یا ڕەخنەی لێ دەگرن، دەیەوێ، « کاسەکە تەنیا، لە سەری مندا بشکێنێ! »، هەموو هەڵەکان، لە ملی منەوە بئاڵێنێ، خۆشی « وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچێ! »، جگە لەوەی، هێندێ کەس دەیانەوێ، کەڵک لەو قسانەی مامۆستا وەرگرن، لای خوێنەری کورد، لە بایەخ و ڕاسگۆیی نووسینەکانم کەمکەنەوە. بۆیە منیش، بە هیچ شێوەیە، لە هیچ کەس و لە هیچ لایەنێکی ڕامیاریی، ئەوە قەبووڵ ناکەم، هەرگیز بێ دەنگ نابم و داکۆکیی لە خۆم و نووسینەکانم دەکەم. چونکە، تەنیا سەرمایە و دیاری دەسم، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم، بەرهەمەکانمە، نامەوێ، ئەوانیش، وەک هێندێ شتی دیکەیان لێ بەسەربێ، « جامیش دەڵێ: بشکێم و نەزرینگێمەوە! » وا بزانم، ڕوونکردنەوەی ڕاستییش، کارێکی گەلێ باش و مافێکی ڕەوای دێمۆکراسیی هەموو مرۆڤێکە، بە تایبەتیی، ئێمە لە کۆمەڵگەیەکی ئازاد و دێمۆکراسیی وەک « سوید »دا دەژین!
وێڕای ئەوەی، ڕێزێکی بێ ئەندازە، پێشکەش بە مامۆستا « جەرجیس فەتحوڵلا » دەکەم، جارێکی دیکەش، داوای لەشساغیی و تەمەندرێژیی، لە یەزدانی مەزن بۆ دەخوازم. هیوام ئەوەیە، هەمیشە سەرکەوتووبێ، بە بەرهەمە پڕ بایەخ و بەپێزەکانی، چاو و دڵ و مێشکمان ڕۆشنکاتەوە. لە هەمان کاتیشدا، هیوادارم توانیبێتم، وەڵامێکی پڕ بە پێستی، بیروڕاکانیم دابێتەوە. ئەوانەی دەشیانەوێ، « لە ئاوی لێڵدا، ڕاوە ڕاستیی بکەن »، بە تەواویی، دەمکوتم کردبن.

دوکتۆر حوسێن محەمەد عەزیز
1/مای/1998
ستۆکهۆڵم

# لە بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

**گوتـــار :**

1. بەرەو ئازادیی، گ. ڕابوون، ژ. 2، سوید، 1991،
2. لە پێناوی ڕاستیدا، بەربانگ، ژ.87، ساڵی12، سوید ـ1993،
3. یەکێتی سۆڤێتی هەڵوەشاوە لە ڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کوردەوە، گ. ڕابوون، ژ.7 ـ 8، سوید، 1993.
4. دەربارەی کەسایەتیی کورد، گ. ڕابوون، ژ. 10 ـ11، سوید، 1994.
5. بەرەو ستراتیژێکی یەکگرتووی نەتەوەیی، هەنگاو، ژ.13، لەندەن،1995
6 سایکۆلۆژییەتی مرۆڤی ئاوارەی کورد و بازاڕی چاپەمەنی کوردیی، گ. گزینگ، ژ.8، سوید، 1995.
7. لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی کۆمەڵگەی کوردەواریی، گ. گزینگ، ژ.9، 1995
8. کۆرپە تاقانە ساواکەی دەنگ و ڕەنگی نەتەوەکەم(MedTV)، گ. گزینگ، ژ.13، سوید، 1996.
9. هەنگاوی یەکەم و سەرەتای کارێکی مەزن، گ. بەربانگ، ژ.102، ساڵی14، سوید، 1996
10. چەند سەرنجێ دەربارەی سەرەخۆشیی و پرسەدانان، گ. بەربانگ، ژ. 104، سوید 1997
11. دیکتاتۆرەکان لە بەر یەک ئاوێنە قژی نەخشە و پلانەکانیان دادەهێنن، گ. بەربانگ، ژ. 105، سوید، 1997. گ. دیمۆکراسی، ژ.30، سلێمانی، 1997.
12. کەی هۆشێ بە بەر خۆماندا دەهێنینەوە؟ گ. بەربانگ، ژ. 106-107، سوید، 1998. گ. دیمۆکراسی، ژ.31، سلێمانی،1998.
13. با خۆمان چاک بناسین، گ. بەربانگ، ژ.108، سوید، 1998.
14. سێ سەرنجی زمانەوایی، مانگنامەی پەیام، ژ. 8، 1998.
15. مافی دیاریکردنی چارەنووس، گ. ئاڵا، ژ.30، 1998.
16. بۆرە نەبێ، بازەبێ، کلکی بە ئەندازەبێ، گ. بەربانگ، ژ. 109، 1998.
17. ئاشتیی بە دەنگ نییە، بە ڕەنگە، کوردستان، ژ.7، بەرلین،1998.
18 چەند سەرنجێ دەربارەی ناسنامەی ئایینیی و نەتەوەیی خەلیل منەوەر، گ. ئێستا، ژ.20، سولەیمانیی، 1999.
19. زێوەر لە نێوان کوردایەتیی و عێراقچێتیدا، گ. ئاینده، ژ.1، سولەیمانیی، 1999.
20. داری بەزەیی خوا، ڕ. کوردستانی نوێ، بەشی یەکەم، ژ.1902، 1999/7/13. بەشی دووەم، ژ.1903، 1999/7/14، سولەیمانیی.

21. دەربارەی مەلەفی کەرکووک، ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 1921، 999/8/11 سولەیمانی. مانگنامەی کوردستانی نوێ لە دەروەی وولات، ژ.67، 1999/8/25 .
22. شێوازی خەبات و مافی چارەنووسی نەتەوەکان، ڕ. کوردستانی نوێ، ژ. 1928، 1999/8/18، سولەیمانیی.
23. دەربارەی فریزیۆلۆژی کوردیی، ڕ. ئالای ئازادی، ژ. 220، 1999/7/12، سولەیمانیی.
24. خڕنووکیش لە بیاباندا درەختە، گ. گزینگ، ژ.28، سوید2000. ڕ. ئالای ئازادی، ژ. 378 ، 2000/08/20، سولەیمانیی.
25. ژن لە ئاوێنەی تەڵخی هێندێ هۆنراوەی کوردییدا، گ. گزینگ، ژ.29، 2000. ڕ. کوردستانی نوێ، 2312، 2000/11/25، سولەیمانیی.
26. هێزی یەکێتیی لە سایەی دیمۆکراسییدا، کوردستانی نوێ، ژ. 2314،2000/11/27، سولەیمانیی.
27. ڕۆژمێری ڕووداوقەکانی مانگی نۆڤەمبەر لە مێژووی کورددا، کوردستانی نوێ، 2317، 2000/11/30. سولەیمانیی.
28. نەورۆزی کورد، گ. گزینگ، ژ.31، 2001.
29. شەکرە شارەکەم سولەیمانیی، گ. گزینگ، ژ. 32، 2001. گ. گەلاوێژی نوێ، ژ. 26، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2001.
30. ئابووریی هاوبەش لە نێوان مارکسیزم و ناسیۆنالیزم هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستا، گ. مەدەنیەت، ژ. 11، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2001.

**نامیلکە و پەرتووک :**

1. دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چ.1، سوید، 1994،
2. دوا پرۆژە، چ.1، سوید، 1994،
3. پێنج ووتاری غەمگین، چ1، سوید، 1994،
4. دیموکراسی، ئایدۆلۆژی و جەنگی نێوخۆ، چ1، سوید، 1994،
5. ململانێی ئایدۆلۆژی لە کوردستاندا، چ.1، سولەیمانی 1993. چ.2 ، سوید، 1995.
6. پێنج کاتژمێر لەگەڵ برایم ئەحمەددا، چ.1، سوید،1995. چ.2، سولەیمانیی 1996.
7. نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، سوید، 1995.
8. کورد و شۆڕش و هەڵی مێژوویی، چ.1، سوید 1996. چ. 2، کوردستان، 2000.
9. فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چ.1، سوید، 1996. چ.2، سولەیمانی، 1996.
10. بەڵێ لێکۆڵینەوە و ڕەخنە نەک شێواندنی ڕاستیی، چ.1، سوید، 1996.
11. خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، چ1، سوید، 1997. چ. 2، سولەیمانی، 1997.
12. ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چ.1، سوید، 1997. چ. 2، سولەیمانیی، 2001.

13. کیروگرفتە سەرەکییەکانی کورد، چ. 1، سوید، 1998. چ. 2، سولەیمانیی، 2000.
14. تۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندی مێژوویی، چ.1، سوید، 1999. چ.2، سولەیمانیی، 1999.
15. سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چ1، سولەیمانیی، 1999.
16. خلتەی بیرێکی ژاراویی، چ1، چاپخانەی هەمیشە، سلەیمانیی، 2000.
17. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی یەکەم، چ. یەکەم، کوردستان ـ سولەیمانیی، 2002.

## بەرهەمی داهاتووی نووسەر
## « ناکۆکیی و ناپاکیی لە مێژووی کورددا »

لە سەر ناپاکیی نەتەوەیی لە کوردستاندا، هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە تا ئەورۆ، لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییمان ئامادەکردووە. لێکۆڵینەوەکە، پتر باسی هەموو ئەو ناپاکییانە دەکا، کە لە سەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا، لە جووڵانەوەی ئازادیخوازانەی کوردستاندا ڕوویانداوە. بە شێوەیەکی تایبەتییش، بایەخمان بە « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی »ی‌ەکانی، هەر دوو شۆڕشی «11/سێپتێمبەری/1961 و 1976 » داوە. بۆ ئەم مەبەستە، گەلێ سەرچاوەی گرنگی مێژووییمان بەکارهێناوە و پەنامان بۆ بەر گەلێ ڕووناکبیر و کەسایەتیی کورد بردووە. بەڵام، بۆ ئەوەی، لێکۆڵینەوەکە، شێوازێکی ئەکادیمییانە و بێلایەنانە وەرگرێ، پێویستمان بە دەکۆمێنت و سەرچاوەی پتر هەیە. بۆیە، تکا لە هەموو خوێنەواران و ڕووناکبیرانی هێژای گەلەکەم و ڕێکخراوە ڕامیارییەکانی کوردستان دەکەم، گەر، هەر دەکومێنتێکیان، دەربارەی « ناکۆکیی، دووبەرەکیی و ناپاکیی » لە سەر شۆڕشەکانی کورد لا چنگدەکەوێ، بەم ئەدرێسەی لای خوارەوە، بۆمان ڕەوانەکەن. پێشەکیی، زۆر سوپاسیاندەکەم و مەبەستەکەشمان، تەنیا ڕاژەکردنی مێژووی کورد و ڕوونکردنەوەی ڕاستییەکانە.

AZIZ
SVEABORGSGATAN 13, 2TR.
164 72 KISTA
SWEEDEN
TEL. 08 - 752 75 74